پرۆفیسۆر مستەفا زەلمی

# هاوسەرگیری و تەڵاق

## لەفیقهی بەراوردکاری ئیسلامیدا

( توێژینەوەیەکی بەراورد کراوە بە یاسا )



وەرگێڕانی: ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# هاوسەرگیری و تەڵاق

## لەفیقهی بەراوردکاری ئیسلامیدا

### (توێژینەوەیەکی بەراورد کراوە بەیاسا)

ئەم دانراوە گرنگترین ئەو گۆڕانکاری و هەموارکردنانە لەخۆدەگرێت کە لەهەرێمی کوردستانی عێراق

بەیاسای ژمارە (١٥)ی ساڵی ٢٠٠٨

لەیاسای باری کەسی ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩دا ئەنجامدراوە


نووسینی

**دکتۆر مصطفی زەڵمی**

وەرگێڕانی

ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار رەئوف ئەحمەد

الزواج والطلاق في الفقه الإسلامي المقارن

هاوسەرگیری و تەڵاق لە فیقهی

بەراوردکاری ئیسلامیدا


نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێرانی : ڕێدار رەئوف ئەحمەد
پێداچوونەوەی : توفیق کەریم
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠,٠٠٠ دینار





لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٤) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟
إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ
يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾

سورة الروم/٢١

﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ۖ فَإِمْسَاكٌۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَٰنٍ ۗ وَلَا
يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا
يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا
فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ
فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾

سورة الحجر/٩

## (تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ)

رواه البخاري/٤٧٠٠

# ناوەرۆك

# پێشەکی

قورئان دەستورێکی خودایيە کەتەنها بنەما بنەڕەتیو رێسا گشتيەکانی لەخۆ گرتووەو، چوارچێوەيەکی رەوشتی بەدی هێناوە، درێژەو حوکمە وردەکان بۆ عەقڵی مرۆڤ لێگەڕاوە، تا لەو چوارچێوەيەدا بخرێتە گەڕ.

جياواز لەمە بابەتی حوکمەکانی خێزانی مرۆڤايەتی، هاوسەرگيریو تەڵاق، شيرپێدان، دايەنی، بەخێوکردن، بژێوی، راسپاردن، ميراتی، ميراتگرێتی بەجۆرێك لە درێژی باسکردووە، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار:

يەکەميان: گرنگیو مەترسی خێزانو کاريگەری راستەوخۆی لەسەر ئايندەی چاکبوونو خراپبوونی کۆمەڵگا.

دووەميان: هەر کەمو کورتييەك لە حوکمەکانی خێزاندا بێتە دی لەبنەڕەتدا تووشی کەرامەتی مرۆڤ دەبێت، لەبەر ئەوە پێويستی دەکرد بازنەی ئيجتيهادکردن تێيدا تەسك بکاتەوەو، جوڵانەوەی عەقڵ لەبابەتەکانی باری کەسيدا بێت.

خوای گەورە پەيوەندی هاوسەرێتی کردۆتە بناغەی دڵئارامیو ئاسوودەيیو سۆزو خۆشەويستی، هەروەك دەفەرمووێت: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ).[1]

---

[1] سورة الروم/٢١ .

خوای گەورە هاوسەرگیریتی ژنو پیاوی لەسەر سێ بناغە دامەزراندووە:

یەکەم: ئاوێتە بوون -تفاعل- مەبەستی سەرەکی لێی خستنەوەی وەچەی چاکەکارە کەببێتە میراتگری زەوی، ئەمەش بەشێکە لەئاوێتەبوونی گەردوونی سروشتی، لەبەر ئەوە پێویستە سەقامگیریو بەردەوامی بەجۆرێك لەخۆ بگرێت کەئەگەری هەڵوەشاندنەوەی نەبێت، وەك ئەو ئاوێتە بوونانەی دیکە کەلەنێوان بەشەکانی دیکەی بوونەوەردا هەیەو دیاردەی هەڵوەشاندنەوە نایانگرێتەوە.

دووەم: هاوسەرگیریتی نێوان ژنو پیاو دوو خەسڵەتی هەیە، خەسڵەتی کرداری کەپیاو دەگرێتەوە، خەسڵەتی هەڵچوون (انفعالی) کە ژن دەگرێتەوە، وەك هەموو دوانەکانی نێوان بەشەکانی دیکەی گەردوون، هیچ کام لەژنو مێرد چاکتر یان جیاوازتر لەویان نیە کە شتێکی تێدا بێت بەشداربێت لەپێکهێنانی ئەو ئامانجەی ژیانی هاوسەرێتی مەبەستیەتی بیهێنێتەدیو لەبەرانبەرەکەیدا نەبێت، ئەم بە کردارەکانیو ئەویش بەهەڵچوونەکانی بەشدار دەبێت بەبێ هیچ لێك جیابیەك.

سێیەم: سروشتی کارکردن وادەخوازێت خەسڵەتی زبریو توانای بەرەنگاریو کاریگەربوونی تێدا ببێت، هەروەك چۆن خەسڵەتی هەڵچوون نەرمو نیانیو سۆزوبەزەییو کەوتنە ژێر کاریگەری تێدا ببێت، لەبەر ئەو واقیعە فیسیۆلۆجیە ئەگەر داوا لەلایەکیان بکەین کاری لایەکی دیکە ئەنجام بدات ئەوا ئەنجامەکانی ئاوێتەبوونی هاوسەرێتی پێچەوانە دەبێتەوەو کاریگەری خراپ لەسەر تاكو کۆمەڵگا بەجێ دەهێڵێت، پێوستیەکانی ژیان وای خواستووە پیاو لەسەر ئەرکی خۆی بمێنێتەوەو بەرپرسیارێتی دابینکردنی بنەما ماددیەکانی خێزانی لەئەستۆدا بێت[1]، هەتا ژن کاتی هەبێت بۆ ئەنجامدانی رۆڵی هەڵچونیەتیو دابینکردنی بنەما مەعنەویەکان لەکاتی ئەنجامدانی پەیامەکەیدا (پەیامی دایکایەتی)و پەروەردەی تەندروست لەپێناو

---

[1] ئەم واتایەش مەبەستە لەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ). النساء/ ٣٤.

پێکهێنانی نەوەیەکی چاکەکار کەببێتە میراتگری زەوی، لەڕووانگەی ئەم بەڵێنەی خوای گەورەوە:

(وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ).[1]

## ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی لەدادگا و یاسای خێزان:

لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە شەریعەتی ئیسلامی تاکە یاسای پەیڕەوکراو بوو کەهەموو پەیوەندیو پەیوەستیەکانی خەڵك لەجیهانی ئیسلامیدا ملکەچی بوون، نەك تەنها لەباری کەسیدا بەڵکو بەهەمان شێوە لەهەموو بابەتە مەدەنیو تاوانکارییەکانیشدا پەیڕەویان دەکرد.

دادوەرەکانیش ئەم شەریعەتەیان بۆ جێبەجێکردن کە لەچوارچێوەی شەریعەتدا لەو موجتەهیدانەوە وەردەگرت بەشوێن دادپەروەریدا دەگەڕان بەبێ خۆبەستەوە بەچەند دەقێکی دیاریکراو یان بەجێبەجێکرانی تەواو پەیوەست بوو بەدەقەوە وەك ئەوەی ئێستا لەژێر سایەی یاسا دەستکردەکاندا لەدادگای نوێدا پەیڕەو دەکرێت، دادگا لەسەر ئەم شێوازە نەمایەوە، بەڵکو لەکشانەوە بۆ پاشدا گەشەی کرد، بەمشێوەیە:

### أ- سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ):

پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم دادوەر بووە لەئیسلامدا، پێشینە دادوەرییەکانی ئەو بوو بە یاسا بۆ ئومەتەکەی، موجتەهیدو دادوەرو موفتی بەو پێیەی ئەو پێشینە دادوەریانە لەسوننەتەکانی ئەوەنو پاش قورئانی پیرۆز سەرچاوەی ژمارە دوون لەسەرچاوەکانی حوکمە شەریعیەکان پێوەی پابەند دەبن.

---

[1] سورة الانبياء/١٠٥

لەچەندین ئایەتدا داوای لێکراوە کاری دادوەری ئەنجام بدات، لەوانە، خوای گەورە دەفەرمووێت: (فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلا تَتَّبِعِ الْهَوَى)[1]، (إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ ).[2]

پێغەمبەر (ﷺ) دەستەلاتی دادوەری تەنها لەخۆیدا کورت نەکردبووەوە، بەڵکو ئەم ئەرکە گرنگە مەترسیدارەی بەهاوەڵەکانیشی سپاردووە، وەك مەعازی کوڕی جەبەل کە کردیە والیو دادوەری یەمەنو پێی فەرموو: (كَيْفَ تَقْضِي إِذَا عَرَضَ لَكَ قَضَاءٌ؟ قَالَ: أَقْضِي بِكِتَابِ اللَّه، قَالَ: فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي كِتَابِ اللَّه؟ قَالَ: فَبِسُنَّةِ رَسُولِ اللَّه ﷺ، قَالَ: فَإِنْ لَمْ تَجِدْ فِي سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهﷺ وَلا فِي كِتَابِ اللَّه؟ قَالَ: أَجْتَهِدُ رَأْيِي وَلا آلُو.[3] فَضَرَبَ رَسُولُ اللَّه ﷺ صَدْرَهُ وَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّه الَّذِي وَفَّقَ رَسُولَ رَسُولِ اللَّه لِمَا يُرْضِي رَسُولَ اللَّه)[4]، واتە: ئەگەر کێشەیەك هاتە بەردەمت چۆن دادوەری تێدا دەکەیت؟ وتی: بەکتێبەکەی خوای گەورە دادوەری دەکەم، فەرمووی: ئەگەر لەقورئاندا حوکمەکەت نەدۆزیەوە. وتی: بەسوننەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمووی: ئەگەر لەسوننەتی پێغەمبەری خودا و قورئاندا حوکمەکەت نەدۆزیەوە. وتی: ئیجتیهاد دەکەمو داناميێنم.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەستی خستە سەر سنگیو فەرمووی: سوپاس بۆ خوا کە نوێنەری نوێنەرەکەی خوای سەرکەوتوو کردووە بۆ ئەو کارەی پێغەمبەری خوا رازی دەکات.

پێغەمبەر دڵخۆش بوو بەم عەقڵە فیقهیە پێگەیشتووەو، ئەو ریزبەندییەی بۆ سەرچاوەکانی دادوەری کەئەم هاوەڵە پایە بەرزە پەی پێ بردووە، بەمجۆرە

---

[1] سورة ص /٢٦.
[2] سورة النساء /١٠٥.
[3] واتە کەمتەرخەمی ناکەم.
[4] ابو داود: ٣١١٩.

هـاوەڵانی لەسـەر بـەكارهێنانی عـەقڵی سـاغ لەبـەر ڕۆشـنایی شـەریعەتی ئیسـلامدا هاندەدا.

ب- سەردەمی جێنشینە ڕاشیدینەكان:

جێنشینە ڕاشیدینەكانو هاوەڵانی دیكـەش هـەمان ڕێگـەی پێغەمبـەریان پـەیڕەو كرد لەدادوەریو ڕاسپاردنی كەسانی دیكەدا پێی، هەمان ڕێبازی ئەویان پـەیڕەو كـرد لە تێگەیشتنی حوكمەكانو خستنە ڕووی هۆكارەكانی، جارێـك حوكمەكـەیان بـەپێی ئـەو دەقــەی لـەقورئانی پــیرۆز یـاخود فـەرموودەی پێغەمبــەر (ﷺ) هــاتووە لێـك دەدایــەوە، جــاری واش هــەبوو بازنــەی حوكمەكــەیان لەڕێگــەی بەســتنەوەی بەهۆكارەكەیەوە فراوانتر دەكرد، هەربۆیە بەهەمان حوكم لەهەموو بوارێكدا فەرمانیان دەدا كەئـەو پاسـاوە(علە)ی تێـدا بێتــە دی، حـوكمكردنیش بـەئیجتیهاد لەپێشـدا بەراوێژكردن بەكەسانی دیكە لەشارەزایانی ئیجتیهاد دەستی پێدەكرد.

ج- لەسەردەمی ئەمەویدا:

لــەو سەردەمەشــدا دادوەرە موجتەهیــدەكان بەهــەمان شـێوە لەسـنوورێكی دیاریكراودا كۆت نەكرابوون، بـەڵكو حـوكمی هـەموو ئاریشـەكانیان لـەقورئانی پـیرۆز وەردەگرت، پاشان لەسوننەتی پێغەمبەر، پاشان ئیجتیهاد بەبۆچونێك كەبەڵگەیـەكی دانپیانراوی شەرع پشتراستی بكاتەوە وەك پێوان (قیاس)و، بەرژەوەندی (مصلحە)و نەریت (عـورف)و ئـەو بەڵگانـەی دیكـە كـەدواتر نـاوی سەرچـاوە شـوێنكەوتەییەكان (المصادر التبعیە)ی لێنرا.

د- لەسەردەمی عەباسیدا:

دادوری گەشەی كرد، بەجۆرێك ئـەو مەرجـە نـەما كـە دادوەر دەبێـت موجتەهیـد بێـت، بـەڵكو لـەم سـەردەمەدا كەسـانێك كـاری دادوەریـان كـرد كەلەنێویانـدا هـەبوو موجتەهیـد بێـت، لەنێویشـیاندا هـەبوو لاسـاییكەرەوەی مەزهـەبێكی دیـاریكراو بـوو

کەحوکمەکانی لەو مەزهەبەوە دەردەهێنا، ئەمەش بووە هۆی جیاوازی حوکمەکان بەهۆی جیاوازی بۆچوونی ئەو مەزهەبانەی دادوەرە لاساییکەرەوەکان حوکمەکانیان لیّ وەردەگرت، وایکرد حوکمەکانی دادگا لەئاریشەی وەك یەکدا یەك نەبێت، بۆ چارەسەرکردنی ئەم دیاردەیە لەسەردەمی هاروونە رەشیددا ئەبو یوسف[1] پایەی گەورەی دادوەران (قاضي القضاة)[2] وەرگرت، بۆچارەسەری کێشەکە هەوڵیدا دادوەران کەسانێك بن کەگرنگی زیاتر بەمەزهەبی ئەبو حەنیفە دەدەن، بەمەبەستی دەربازبوون لەدژیەکیو یەکنەگرتنەوەی فەرمانەکانی دادگا پابەندی کردن کەبەپێی ئەو مەزهەبە دادوەری بکەن.

سەرەڕای نووسینەوەی پێویستیەکانی دانیشتنەکانی دادگاو تۆمارەکانو گوتەی دوو لا ناکۆکەکەو دەرچوونی حوکمەکان لەساڵی ١٢٠ی کۆچیەوە بەهۆی ئیبن شبرمەی دادوەری کوفەو ئەو دادوەرانەی پاش ئەو هاتنو لەسەر هەمان رەوتی ئەو بوون، بەڵام ئەو پێشینە دادوەریانە لەئەنجامی ئەو مەینەتیو نسکۆیانەی بەهۆی هێرشو پەلاماری داگیرکەرانەوە روویدا تیاچوونو جیهانی ئیسلامیان لیّ بێبەش بوو[3].

## هـ- لەسەردەمی عوسمانیدا:

پاش ئەوەی لەسەرەتاکانی سەدەی شازدەهەم (١٥٣٢ز) عێراق بوو بەبەشێك لەدەوڵەتی عوسمانیو بۆ ماوەی چوار سەدە لەژێر حوکمڕانیدا بوو، یاسای خێزان (قانون العائلە) پەیڕەو دەکرا، دوای ئەوەی سوڵتان عەبدولحەمید ئەوەی ناونرا (چاکسازیو رێکخستنی رۆژئاوایی– الاصلاح والانظمة الغربية)ی راگەیاند ئەم یاسایە گەشەی کردو تا سەردەمی داگیرکردن بەردەوام بوو.

---

(1) ئەویش یەعقوب کوڕی ئیبراهیم کوڕی ئەبی لەیلای ئەنصاری ئەژادو لەکوفە ژیاوە (١١٣ ـ ١٨٣هـ).

(2) هاوشێوەی وەزیری دادی ئەم سەردەمە بوو، لەسەردەمی عوسمانیشدا بە شێخولئیسلام ناسرابوو.

(3) الاستاذ محمد شفيق العاني، احكام الاحوال الشخصية في العراق ط١٩٧٠، بغداد ص٢.

پاش داگیرکرانی عێراق لەساڵی(١٩١٧ن) لەلایەن بەریتانیاوە، لەساڵی(١٩٢٣ن)دا یاسای دادگا شەرعیەکان (قانون المحاکم الشرعیة) دەرچوو، بەپێی ئەم یاسایە دادگا شەرعیە سوننیەکان کەلەژێر دەستەڵاتی ئەنجومەنی پێداچونەوەی سوننی شەرعیدا بوون نوێکاری تێدا کراو، فیقهی سوننی (بەتایبەت فیقهی ئەبو حەنیفە) وەك یاسای خێزان پەیڕەو کرا، دادگا شەرعیە تایبەتەکانی جەعفەریش کەلەژێر دەستەڵاتی ئەنجومەنی پێداچوونەوەی شەرعی جەعفەریدا بوون فیقهی جەعفەری جێبەجێ دەکرا.

و- لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی نیشتیمانیدا:

پاش دەرچوونی یاسای بنەڕەتی (القانون الاساس) (دەستور) لەساڵی (١٩٢٥ن) تێیدا بڕیاری ئەو جیاکاریە مەزهەبیە درا کەلەبڕگەی پێشتردا هاتبوو، لەدەقی هەردوو مادەی (٧٦،٧٧)ی هاتووە کە دادوەریی لەدادگا شەرعیەکاندا بەپێی حوکمی شەرعی تایبەت بەهەر مەزهەبێك دەبێت و دادوەریش لەو مەزهەبە دەبێت کەدانیشتوانی ئەو شوێنە زۆرینە بن تێیدا، لەگەڵ هێشتنەوەی هەردوو دادوەری سوننی و جەعفەری لەشاری بەغداو بەسرە.

لەساڵی(١٩٣٢ن) هەوڵدرا یاسای باری کەسی دەربچێت بەجۆرێك بەبێ پابەند بوون بەمەزهەبێکی دیاریکراوەوە لەفیقهی ئیسلامی وەربگیرێت، دیوانی تۆماریی یاسایی (دیوان التدوین القانونی) پێی هەستاو لائیحەیەکی بۆ ئەم پرۆژەیە دانا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو.

لە ١٩٤٥/١/٢٩ز وەزارەتی داد فەرمانیدا بەپێکهێنانی لیژنەیەك بۆ دانانی یاسای باری کەسیی و لیژنەکە لەسەر بنەمای هەردوو مەزهەبی سوننی و جەعفەری پرۆژەکەی نووسی، بەڵام ئەم پرۆژەیەش سەرکەوتوو نەبوو نەیتوانی ببێتە یاسا.

لە ١٩٥٩/٢/٧ز دا وەزارەتی داد لیژنەیەکی پێکهێنا بەمەبەستی دانانی پرۆژە یاسایەك کەلەفیقهی ئیسلامی وەرگیرابێت ئەوەی کۆدەنگی لەسەرە (متفق علیه)،

یـان رای پەسـەندە لەحوکمـە شـەرعیەکاندا، ئـەم پرۆژەیـە بـەبێ پابەنـد بـوون بەمەزهەبێکی دیاریکراوەوە دارێژراو سەرکەوتوو بوو توانرا ببێتە یاسای باری کەسیی ژمـارە (١٨٨) لـە ١٩٥٩/١٢/٢٩ز دا، چـەندین هەموارکردنـەوەی تێـدا ئەنجامـدراوە کەیەکەمیان بەپێی یاسای ژمارە (١١)ی ساڵی ١٩٦٣ز بوو.

هەروەها یاسای دەسـتەڵاتی دادوەری (قـانون السـلطة القضـائية)ی ژمـارە (٢٦)ی ساڵی (١٩٦٣ن) دەرچـوو، بـەپێی ئـەم یاسـایە هـەردوو ئەنجومـەنی پێداچـوونەوەی شـەرعی سـوننیو جەعفـەری هەڵوەشـێنرانەوەو لـەبری ئـەوان دەسـتەی بابەتـە کەسیەکان (هيئة المواد الشخصية) لەدادگای پێداچوونەوە دامەزرێنرا، شـایانی باسـە داستەواژەی یاسای باری کەسیی (قانون الأحوال الشخصية) کەناوی دیکەشـی هەیـە وەك یاسای خێزانو یاسای مافەکانی خێزانو یاسای خانەوادە لەدەسـتەواژە فیقهیـە ئیسـلامیەکان نیـە، بـەڵکو سەرچـاوە مێژووییەکـەی بریتـی یـە لـەفیقهی ئیتـاڵی کەلەباکووری ئەو وڵاتە ویلایەتو شاری سەربەخۆ هـەبوون یاسـای تایبـەت بـەخۆیان تێدا جێبەجێ دەکرا بەناوی بار(الاحوال) لەپاڵ یاسای رۆمانیدا کەوەك یاسای گشـتی هەموو ویلایەتەکان وابوو، پاشان ئەم دەستەواژەیە بـۆ فەرەنسـا گوێزرایـەوە کـە بـۆ چەند کانتۆنێکی چینایەتی دابەشکرابوو، پاش یەکخستنی کانتۆنەکان ساڵی (١٨٠٤ن) یاسـای مـەدەنی فەرەنسـی لـەخۆی گـرت، پاشـان لەیاسـا ئەورووپیەکانـدا هـات، لەعێراقیش لەماددە (١١)ی بەیانی دادگاکان کەلە (١٩١٧/١١/٢٨ن) دەرچووە زاراوەی بابەتە کەسیەکان (المواد الشخصية) هات، بۆیەکەمینجاریش دەربڕینی باری کەسـیی (الأحوال الشخصية) لەیاسای دادگا شەرعیەکانی دەرچوو لە (١٩٢٣/٦/٣٠ن)و پاشان لەیاسای بنـەڕەتی (دەسـتور) لـە (١٩٢٥ن) بـەکارهێنرا، پـاش ئـەوە لەیاسـای بـاری کەسیی بۆ بیانیەکان ژمـارە (٧٨)ی سـاڵێ (١٩٣١ن) چەسـپا، لەکۆتاییشـدا لەیاسـی باری کەسیی بەرکاردا چەسپا.

پلانی لێکۆڵینەوەکە:

لێکۆڵینەوەی بابەتەکە بۆ دوو بەش دابەش دەکەین: یەکەمیان تایبەت دەکەین بەحوکمەکانی هاوسەرگیری‌و دووەمیشیان بۆ حوکمەکانی تەڵاق.

بەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەکەش بۆ شەش بەند دابەش دەکەین، دووەمیش بۆ چوار بەند:

بەشی یەکەم: حوکمەکانی هاوسەرگیری لەئیسلامیدا

بەندی یەکەم: پێناسەی هاوسەرگیری

بەندی دووەم: پێشەکیەکانی هاوسەرگیری

بەندی سێیەم: قەدەغەکراوەکان (محرمات)ی هاوسەرگیری

بەندی چوارەم: پێکهێنەر (پایەو مەرجەکان)ی هاوسەرگیری

بەندی پێنجەم: مافەکانی هاوسەریتی

بەندی شەشەم: بژێوی رەچەڵەك (النفقة النسبية)

بەشی دووەم: حوکمەکانی تەڵاق لەئیسلامدا

بەندی یەکەم: پێناسەی تەڵاق

بەندی دووەم: پێکهێنەرەکانی تەڵاق

بەندی سێیەم: رادەی دەسەڵاتی ویست لە جیاکردنەوەی دادگا (التفريق القضائي)دا

بەندی چوارەم: شوێنەواری جیابوونەوەی هاوسەران (آثار فِرق الزواج)

# بەندی یەکەم

# پێناسەی هاوسەرگیری

پێناسەی هاوسەرگیری بریتیە لەناساندنی حەقیقەت و فەلسەفە و حوکمە شەرعیەکەی، بۆیە لێکۆڵینەوە لەم خاڵانە بەسەر سێ دەروازەدا دابەش دەکەین:

# دەروازەی یەکەم:
# پێناسەی هاوسەرگیری

هاوسەرگیری لەزاراوەناسی شەرعیدا بریتی یە لەبەڵێننامە (میثاق) پەیوەستبوونی شەرعی بەشێوەیەکی بەردەوام لەنێوان پیاوو ئافرەتدا کەبەپێی ئەم بەڵێننامەیە لەرووی شەرعیەوە حەڵاڵ دەبێت بۆیو مەبەست لێی پاکێتیو وەچە خستنەوەو پێکهێنانی خێزانە لەسەر ئەو بنەمایانەی ئارامیو سۆزو ئەوین بێنێتە ئارا.

هاوسەرگیری گرێبەست نیە کەئافرەتەکە بابەتی گرێبەستەکە بێت، چونکە ئافرەت کاڵا نیە کڕینو فرۆشتنی پێ بکرێتو نرخەکەشی مارەییەکەی بێت تا بکرێتە بابەتی گرێبەست لەسەرکراو، چونکە ئەو کاتە دەبێتە لایەنێکی گرێبەستەکەو لەهەمان کاتدا گرێبەست لەسەر کراویش دەبێت لەیەك گرێبەستدا ئەمەش نەشەرعو نە لۆژیکی دروست پێی رازی نین.

ئەمە لەلای عەقڵیەوە، بەڵام لەلای نەقڵەوە ئەوا قورئانی پیرۆز جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە هاوسەرگیری بەڵێننامەیە، بەڵکو پەیمانێکی پتەوو بەهێز (میثاق غلیظ) لەم ئایەتەدا ناوی بردووە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً[1] فَلا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً[2] وَإِثْماً مُبِيناً،

---

[1] سامانێکی زۆر.

[2] بەستەم.

وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى[1] بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقاً غَلِيظاً )[2] واتـه پەیمانێکی توند.

پوختەی قسە ئەوەیە هاوسەرگیری هاوبەشێتیەکی رۆحیـە لـەنێوان ژنو مێـرددا، سەرمایەکەی خۆشەویسـتیو رێزیانـە بەرانبـەر یـەكو قازانجەکەشـی ئـارامیو سـۆزو بەزەییو خستنەوەی نەوەیەکی نوێی چاکەکارە.

---

[1] گەیشتن (وصل).

[2] سورة النساء/٢٠، ٢١.

# دەروازەی دووەم:
# فەلسەفەی هاوسەرگیری[1]

لەو پێناسەیەی کەخستمانە روو لەواقیعی ژیانیشەوە ئەوە دەخوێندرێتەوە کەمەبەستی سەرەکی هاوسەرگیری بریتی یە لەپاکێتیو وەچە خستنەوەو مانەوەی نەوەی مرۆڤایەتی، بەشێوازێك کەجیاوازە لەچۆنیەتی مانەوەی گیانلەبەرانو شیاوە لەگەڵ ئەو پێگەیەی کەلەنێو بوونەوەرە زیندووەکاندا هەیەتیو جیای دەکاتەوە لێیان بەرێزلێنانی[2] و بەخشینی فەڕ[3] و دروستکردنی بەجوانترین شێوە[4]، لەروانگەی ئەم مەبەستە سەرەکیەی هاوسەرگیریەوە لەسەر مرۆڤ پێویستە کەبزانێت ویستی سێکسی (الغريزة الجنسية) بۆ ئەوە دروست نەبووە کەخودی خۆی ببێتە مەبەست بەڵکو لەراستیدا بۆ سێ غەریزەی لاوەکی دابەش بووە:

یەکەمیان: غەریزە شەهوەتیە ئاژەڵیە مادیەکەی نێوان ژنو مێردە، ئەو ئارەزوەی کەمەیلی یەکێکیان بەلای ئەوی دیکەیاندا رادەکێشێت.

دووەمیان: غەریزەی سۆزداری رۆحی پاکخوو (یاخود خۆشەویستی مەعنەوی) لەنێوان هەردوو پۆلەکەدا[5] کەلە پەیوەندی هاوسەرێتیەوە سەرچاوەی گرتووە.

---

[1] حیکەمەت لەرووە فەلسەفیەکەیەوە بریتی یە لەخودی مەبەستەکە (العلة الغائية) کارێکی ئارەزومەندانەیە کەمرۆڤ پێی هەڵدەستێت.

[2] خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ) الإسراء : ٧٠.

[3] خوای گەورە دەفەرموێت: (فَأَمَّا الْإِنسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ) الفجر:١٥.

[4] خوای گەورە دەفەرموێت: (لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ)التين : ٤.

[5] دابەشکردنی هەردوو رەگەزەکە بەسەریدا هەڵەیەکی باوە.

سێیەمیان: غەریزەی خۆشەویستی خێزانی کە لەلایەکەوە ژنو مێرد بەیەکەوە دەبەستێتەوە، لەولاشەوە ژنو مێردو مناڵەکانیان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئەمەی دواییان بناغەی پەیوەندی کۆمەڵایەتیو خێزانیەو پیرۆزترینی غەریزەکانە، چونکە ئەو خێزانەی لەپەیوەندییەکی هاوسەرگیرییەوە سەرچاوە دەگرێت دەبێتە پێکهێنەرێکی کۆمەڵگا، لەو پێکهێنەرە خێزانیانەش پێکهاتەی کۆمەڵگاکان دروست دەبێتو لەچاکسازیو خراپەکاریدا شوێنی دەکەون، ئەگەر خێزان چاکەویست بوو ئەوا کۆمەڵگاش چاکەویست دەبێتو خێرو کردەوەی جوان هەموو لایەك دەگرێتەوە، ئەگەر خراپیش بوو ئەوا کۆمەڵگاش خراپ دەبێتو خراپەکاری هەموو لایەك دەگرێتەوە.

بۆیە ملکەچبوون بۆ یەکێك لەو سێ غەریزەیە بەبێ ئەوانی دیکە دەرچوونە لەسونەتی ژیان، هەروەها بەکارهێنانی غەریزەی سێکسی بەدەر لەو مەبەستە سروشتیەی بۆی دروستکراوە پێکدادانە لەگەڵ سروشتی مرۆییو دەرچوونە بەرەو ژیانی ئاژەڵی.

# دەروازەی سێیەم:
# گونجاندنی هاوسەرگیری (حوکمە تەکلیفیەکەی)

حوکمی هاوسەرگیری تەکلیفی (الزواج التكليفي)[1] بەپێی ئەو رەوشەی هەردوو هاوسەرەکەی تێدایە جیاوازە، بەتایبەت مێرد، لەبەر رۆشنایی ئەو رەوشانەدا ئەم پێنج حوکمە تەکلیفیە بەمشێوەیە دەیگرێتەوە:

١. هاوسەرگیری لەبنەڕەتدا بەدەر لەهەر رەوشێك بریتیە لەرێگەپێدان(اباح)ە، واتە سەرپشکە لەئەنجامدانی یان نەکردنی بەبێ ئەوەی هیچ بەرپرسیارێتیەك لەسەر ئەنجامدان یان نەدانی بێتە ئاراوە.

٢. هاوسەرگیری لەکاتی هەبوونی توانای ماڵیو جەستەیی پیاودا پێوست (واجب)ە، ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو بکەوێتە تاوانی هەڵەکردنەوە لەگەڵ دڵنیابوون لەوەی کە لەئەنجامدانی کارو پابەندییەکانی هاوسەرێتیدا ستەم لەژنەکەی نەکات.

٣.هاوسەرگیری پەسەند (مندوب)ە لەکاتی هەبوونی هەردوو پێویستیەکە (ماڵیو جەستەیی)دا لەگەڵ نەبوونی ترس لەوەی بکەوێتە کاری هەڵە یاخود ستەم

---

[1] بریتیە لە پەیامی خودای گەورەی پەیوەست بە رەفتاری راسپێردراوان بە شێوەی پێویستکردن یان سەرپشکردن.

پێویستبوون بریتیە لە داواکردنی کردەوەیەك یان وازهێنان لێی، داوای ئەنجامدانی کارێك بەشێوەی پێویستکردن وپابەندبوون پێویست (ایجاب)و شوێنەوارەکەشی پێویستکرانە (الوجوب)و کاری داواکراویش لەسەر شێوەی لەپێشدانان (اولویە)و بەباشزانی (الافضلية) بەچاکزانراوە(استحباب)ەو شوێنەوارەکەشی (ندب)ەو کارە داواکراوەکەش (مندوب)ەو داوای وازلێهێنانیشی لەسەر شێوەی (حتم)و پابەندبوون حەرام بوونەو شوێنەوارەکەشی حەرامێتیەو کارە داواکراوەکەش وازلێهێنانی حەرامەو لەسەر شێوە (اولوية)و (الافضلية) (استكراهە)و شوێنەوارەکەشی (مکروە) سەرپشکێتیش بریتیە لەپێدانی سەربەستی بەمرۆڤ بۆ هەڵبژاردنی کارێك یان وازلێهێنانی.

لەژنەکەی وەك حاڵەتی سەرقاڵبوونی مێردەکە بەخوێندنو تەرخانکردنی هەموو ویستی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە زانستیەکانی.

٤. هاوسەرگیری حەرامە، بەتایبەت فرەژنی ئەگەر ئەو کەسەی دەیەوێت ئەنجامی بدات بزانێت کە ستەم لە هاوسەرە نوێیەکەی یان هاوسەری پێشتری دەکات، چونکە خوای گەورە رێگەدان بەچەند ژنی پەیوەستکردووە بەبەدیهاتنی دادپەروەرییەوە لەگەڵ هەریەکەیاندا، وانەبێت حەرام دەبێت بۆی بەڵکو پوچەڵ دەکرێتەوە بەهۆی سەرپێچی فەرمانی خوای گەورەوە، چونکە خوای گەورە فەرمانی کردووە یەك هاوسەر بخوازێت لەکاتی ترسانی لەوەی دادپەروەر نەبێتو هەموو فەرمانێکیش بۆ پێویستبوونە ئەگەر نیشانە(قرینە)یەك نەبوو پێچەوانەی ئەوە بگەیەنێتو وازهێنان لە پێویست (واجب) سەرپێچیەو هەموو سەرپێچیەکیش بەتاڵە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: (فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً )[1] واتە تەنها یەك ژن بهێنن، راڤەی ئەم فەرمانەش بەوەی کەبۆ (ندب)ە یاخود رێنماییە ئەوە هەڵەیەو لێخۆشبوونی بۆ نیە، یەکێك لەرێسا ئوصولیەکان ئەوەیە هەموو حوکمێك ئەگەر بەسترابوو بەمەرجێکەوە ئەوا بۆ هەڵاوێرد(استثناء)ە هەروەك لەو ئایەتەدا هاتووە، بەپشتبەستن بەو بنەمایە لەهاوسەرگیریدا بریتیە لە هێنانی تەنها یەك ژنو، چەند ژنیش تەنها هەڵاوێرد(استثناء)ە لەبەر چەند پاساوێك کەدواتر لەشوێنی خۆیدا دەیخەینە روو.

٥. هاوسەرگیری ناپەسەند(مکروه) ئەگەر زیاتر گومانی ئەوە دەبرا کەنەتوانێت پەیوەستیەکانی هاوسەرێتی بێنێتە جێ بەهۆی نەبوونی توانای ماڵی یاخود جەستەیی یاخود لەبەر ئەوەی کەناتوانێت ویستی بەوجۆرە رێکبخات کە دستدرێژی نەکاتە سەر مافەکانی ژنەکەی.

---

[1] سورة النساء /٣.

# بەندی دووەم

## پێشەکیەکانی هاوسەرگیری

هاوسەرگیری بەهۆی گرنگی و مەترسیەوە لەسەر ژیانی کۆمەڵگا و لەبەر بەردەوامبوونی و ئەمەکداریتی بۆ مەبەستەکەی ئەوە دەخوازێت کە سێ پێشەکی هەبێت: یەکەم- هەڵبژاردنی دروست، دووەم- یەکترناسین، سێیەم- خوازبێنی، بۆ هەریەك لەم پێشەکیانە دەروازەیەکی سەربەخۆ تەرخان دەکەین.

## دەروازەی یەکەم:
## هەڵبژاردنی دروستی هاوبەشی ژیان

هاوسەرگیری کێڵگەی تاقیکردنەوە نیە تاوەکو ئەگەر بەخت یاوەر نەبوو لەیەکێکیاندا یەکێکی دیکە تاقی بکاتەوە، بازرگانیش نیە ئەگەر زەرەری کرد لەشمەکێکدا بیگۆڕێت بەیەکێکی دیکەی قازانج هێنەر، بەڵکو پەیمانو بەڵێنو پەیوەستکاری نێوان نێرو مێیی نەوەی مرۆڤە، کەلەهەموو پەیوەستبوونو پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا لەبوارەکانی دیکەدا باڵاترە، بەڵکو رادەی بەختەوەریو نارەحەتی هەر تاکێك لەتاکەکانی خێزان بەرادەی بەهێزیو لاوازی ئەم پەیوەندییە مەعنەوییەی نێوان ژنو مێرد دەپێورێت، لەبەر ئەوە بەڵکو لەبەر زیاتر لەوەش لەسەر هەریەك لەوانەی دەیانەوێت ببنە هاوسەری کەسی دیکە بەمەبەستی پێکهێنانی کیانێکی هاوبەش پێویستە سەرەتا بەبناغە پتەوو پێکهێنەرە بەهێزەکانی دەست پێبکات تا بونیاتنانەکەی تووشی درزو دارمان نەبێت، چونکە ئەگەر دارما کاریگەرییە خراپو نالەبارەکانی تەنها کار ناکاتە سەر ئەوانەی کەلەژێر چەترەکەیدا بوون کەئەوانیش ژنو مێردەکەو منداڵەکانیان بوون، بەڵکو کاریگەری لەسەر کۆمەڵگاش جێدەهێڵێتو بەرەو پەرت بوونو لاڕێبوونی دەبات، بەمەش دیاردەی تاوانکاری تەشەنە دەکات.

## پێوەرەکانی هەڵبژاردنی شیاو:

هەر مرۆڤێك ویستی کەسێك وەك هاوبەشی هەمیشەیی ژیانی هەڵبژێرێت کەهاوبەشێتیەکی رۆحیەو سەرمایەکەی هاریکاریو پێکەوە گونجانە لەخۆشیو ناخۆشیدا، لەسەری پێویستە رەچاوی ئەم پێوەرانە بکات:

یەکەم: ئەو کەسەی دیاری دەکات چاك‌وئاینپەروەر بێت: ئاکارە پەسەندو جوانەکانو دوورکەوتنەوە لەخراپەو کاری ناشیرین بۆ هەر تاکێك نێر بێت یان مێ لەپێشەوەی هەموو پێکهێنەرەکانی کەسایەتیەوەیەو، گوزارشت لەو راستیە دەکات کەخوای گەورە ستایشی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پێ کردووە کە دەفەرمووێ: (إِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ).[1]

بەهەڵەدا چووە ئەو کەسەی پێی وابووە کە رەوشت رێژەییە لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکەو لەسەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر جیاوازی هەیە، ئەمە قسەیەکی بێ بنەمایەو رەوشتی لەگەڵ دابو نەریتدا لێ تێکەڵ بووە، چونکە رەوشت خەسڵەتێکی جێگیرەو شارستانیەتی مرۆڤایەتی هەرچەند گەشە بکات ئەو گۆڕانی بەسەردا نایەت، رۆژێك نایەت عەقڵی هۆشمەند خەسڵەتی درۆو ناپاکیو بەدرەوشتیو هاوشێوەکانی پەسەند بکات، یاخود بڕیار بدات رەوشتە جوانەکانی وەك راستگۆییو سپاردەپارێزیو پاکێتیو هاوشێوەکانیان کاری نابەجێو ناپەسەندن، تا ئەو کاتەی مرۆڤ دەستبەرداری خەسڵەتی مرۆیی بوونی خۆی نەبووبێتو بۆ ئاستی هەمەجیەتو رەوشتی گیانلەبەری دانەبەزیبێت.

پێغەمبەری مەزنمان (ﷺ) لەچەندین فەرموودەدا لەبارەی هاوسەرگیریەوە داوای لەبەرچاوگرتنی خەسڵەتی ئاینداریو رەوشتی کردووە، یەکێك لەناسراوترین فەرموودەیان: ﴿ تنكح المرأة لأربع، لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينها، فاظفر بذات

---

[1] سورة القلم: ٤.

الدين تربت يداك﴾[١]، واتە: ئـەو هۆكارانـەی پـاڵ بەمرۆڤـەوە دەنێـت بـۆ دیـاریکردنی ئافرەتێـك تـا ببێتـە هاوسـەری لەئاینـدەدا بەگشـتی بریتیـە لـەم چـوار خەسـڵەتە، سـامانەکەی، چـونکە مـاڵو سـامان پشـتی پێدەسـترێت بـۆ هێنانـەدی ئاواتـەکان، رەچەڵەکیش چونکە جێگـەی شـانازی پـێ کـردنو ئـەژماری شـوێنەواری بنەماڵەیـە، جوانیەکەشی لەبەر ئەوەی دەروون ئارەزوومەنـدی جوانیـەو، ئاینداریيەکـەی چـونکە بنەمای ئاکارو سەرچاوەی رەوشتە، پێغەمبەر (ﷺ) هانمان دەدات ئـەوەی کۆتاییـان هەڵبژێرینو دەفەرموێت: (فأظفر بذات الدين تربت يداك)، واتە: با پاڵنەرەکە هۆکاری کۆتاییـان بێـت، چـونکە لـەکاتی یەکنەگرتنـەوەو هەڵبژاردنـدا پێشخسـتنی هـەر خەسڵەتێك بەسەر ئاینداریو رەوشتی جواندا سەردەکێشێت بۆ ئەو سەرشۆڕییەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەرێی دەربڕینی (تربت يداك)ەوە گوزارشتی لێکردووە واتـە دەسـتت دەبەسترێتەوە بەخاکەوە، لەفەرموودەی دیکەشدا هاتووە: (تخيروا لنُطفكم فإن العرق نزاع﴾[٢]، واتە: خەسڵەتە بۆماوەییەکان دەگوێزرێنـەوە، ئەگـەر چـاك بـوو ئـەوا چـاك دەبێـت خـۆ ئەگـەر خـراپیش بـوو ئـەوا خراپـە دەهێنێـت، هـەروەها پێغەمبـەر (ﷺ) دەفەرموێت: ﴿تزوجوا من حُجر صالح فإن العرق دساس﴾.[٣]

واتە: لەماڵی چاك هاوسـەرگیری بکـەن، چـونکە دەمـار دزە دەکـات، واتـە: منـاڵ دەچێتەوە سەرباوانی.

ئەم فەرموودانە با لەرواڵەتدا وا دەربکەوێت کە روو لەپیاوانـە بـەڵام لـەڕووی واتـاو مەبەستەوە ئاراستەی هەردوولا (نێرومـێ) کـراوە، لەسـەر ئـافرەتیش پێویسـتە ئـەو کاتەی هاوبەشی ژیانی هەڵدەبژێرێت ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردووە رەچاو بکاتو ئاینداریو رەوشتی جوان لەو کەسەدا کەدەیکاتە هاوبەشی ژیانی بخاتە پێش

---

[١] نيل الاوطار ٦/١١٩،سنن أبي داود مع حاشية عون المعبود ٢/١٢٤.

[٢] الحديث عند ابن ماجه وقد انفرد به عن اصحاب الكتب التسعة.

[٣] طبقات الشافعية الكبرى ٦/٣١٠.

خەسڵەتەکانی دیکەوە، باشترینی هاوسەرگیریش ئەو هاوسەرگیرییەیە کەئەو چوار خەسڵەتەی لەفەرموودەکەی یەکەمدا سەبارەت بەژن‌و مێردەکە باسکرا تێدا بێتە دی.

پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرموودەیەکی دیکەدا پاش ئەوەی بەباشترین گەنجینە کەمرۆڤ لەژیانیدا پاشەکەوتی بکات باسی کردووە هەندێك لەجیاکەرەوەکانی ئافرەتی چاکەکاری دیاری کردووەو، دەفەرمووێت: (الا أخبركم بخير ما يكنز المرء؟[1] المرأة الصالحة: اذا نظر اليها سرّته، واذا غاب عنها حفظته، واذا أمرها اطاعته).[2]

واتە: ئایا پێتان رابگەیەنم بەچاکترین شتێك کەمرۆڤ گەنجینەی بکات؟ ئافرەتی چاکە: کاتێ سەیری دەکات دڵشادی دەکات، کە لێی دوور بکەوێتەوە نامووسی دەپارێزێت، کەفەرمانیشی پێ دەکات گوێڕایەڵیەتی.

دووەم: کچ بێت: وا بەباش‌و چاك زانراوە کەپیاو کچ هەڵبژێرێت، ئافرەتیش کوڕ هەڵبژێرێت کە پێشتر ژنی[3] نەهێناوە، ئەمە ئەگەر رەوشێکی تایبەت نەبوو کەپێچەوانەی ئەوە بخوازێت، بنچینەی ئەم وەصفەش فەرموودەکانی پێغەمبەرە(ﷺ)، لەوانە ئەو فەرموودەیەی لەجابری کوڕی عەبدوڵاوە دەگێڕنەوە کەگێڕاویەتیەوە:(قال رسول اللهﷺ: أتزوجتَ؟ قلت: نعم. قال: بكراً أم ثيّباً؟ فقلت: ثيّباً، قال: هلاّ بكراً[4] تُلاعبها وتُلاعبك؟ قلت: ان ابي قُتل يوم أُحُد وترك تسع بنات،

---

[1] واتە ئەوەی مرۆڤ گەنجینەی دەکات.

[2] نيل الاوطار ٦/١١٤.

[3] دەربڕینی (الباكر) بەزۆری بۆ مێینە بەکار دەهێنرێت، بەرانبەرکەشی( الثيب)ە، دەکرێت بۆ ئەو پیاوانەش بەکاربهێنرێت کەپێشتر هاوسەرگیریان نەکردووە.

[4] (مفعول)ە بۆ (فعل محذوف)، تەقدیرەکەی (هلا تزوجت بكراً)، گێڕانەوەیەکی تریش هەیە (افلا بكراً). (هلا) ئامرازی سەرکۆنەیە، ئەگەر بچێتە سەر کاری رابوردوو، ئامرازی هۆشداری (تحضيض)ە ئەگەر بچێتە سەر داهاتوو.

فكرِهت ان أجمع اليهنّ جارية خرقـاء[1] مثلـهن، ولكـن إمـرأة تُمشّـطُهنّ وتقـوم علـيهن. فقال: بارك الله لك).[2]

واته: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: هاوسەرگیریت کرد؟ وتم: بـەڵێ، فـەرمووی: کچە یان بێوەژن؟ وتم: بێوەژن، فەرمووی: بـۆ کچـت نـەهێنا یـاری لەگەڵـدا بکـەیتو یاریت لەگەڵدا بکـات؟ وتم: بـاوکم لـەرۆژی ئوحـوددا کـوژراو نـۆ کچـی لێ بـەجێماوە، پێمخۆش نەبوو کچۆڵەیەکی بێ ئاوەزای وەك خۆیان بهێنم بۆ لایان، بـەڵکو ئافرەتێـك بێت رێکیان بخاتو چاودێریان بکات، فەرمووی: خوا پڕ فەڕی بکات بۆت.

لەفەرموودەیەکی دیکەشدا هـاتووە: (علـیکم بالابکـار فـإنهنَّ أعـذب افواهـا وأنقـی ارحاما[3] وارضی بالیسیر).

واتە: کچ بهێنن چونکە زاریان سازگارترەو رەحمیان پاکژترەو رازیترن بەکەم.

پێغەمبـەری (ﷺ) لـەو دوو فەرموودەیـەدا بەڵگـەی باشـێتی هێنـانی کچـی بـەوە کردووە کەتـەواو پەیوەسـتە پێـوەی، بـەڵام بێـوەژن لەوانەیـە دڵـی پەیوەسـت بێـت بەمێردی یەکەمیەوە، بۆیە خۆشەویسـتیەکەی بەتـەواوی نیـە بەپێچـەوانەی کچـەوە، هەروەها کچەکە زیاتر رازیە بەرەوشە مادیەکەی مێردەکەی.

وتراوە هێنانی کچ سێ سوودی هەیە:

یەکەمیان: کچ مێردی یەکەمی خۆش دەوێتو هۆگری دەبێتو سروشتی مرۆڤیش وایـە هـۆگری یەکـەم هۆگربـوو ببێـت، بـەڵام ئـەو ئافرەتـەی لەگـەڵ پیـاوی دیکـە نووستووە، لەوانەیە بەهەنـدێ خەسـڵەت رازی نـەبێت کەپێچـەوانەی ئەوەیـە پێشـتر هۆگری بووەو بەو هۆیەوە رقی لەمێردی دووەمی بێت.

دووەم: ئەوە تەواوترە لەهاوسۆزیدا بۆی.

---

[1] ئەو ئافرەتەیە نەزانێت باش کاربکات.

[2] نیل الاوطار ١١٩/٦. سنن أبي داود ١٢٥/٢.

[3] واتە منداڵی زۆر بێت، بەو ئافرەتە دەوترێت کەمنداڵی زۆری هەیە.

سێیەم: سۆزی بۆ مێردی یەکەمیەتی، لەوبارەیەوە پێشتر واتراوە:

نقل فؤادك حيث شئت من الهوىما الحب الا للحبيب الاول

كم منزل في الارض يألفه الفتى وحنينه ابــدا لأول منزل

واته:

بۆ کوێ ئارەزووت بوو دڵ بگوێزەرەوە... خۆشەویستی تەنها بۆ ئەویندارى یەکەمە

چەند ماڵ مرۆڤ بگرێتە خۆیەوە... سۆزی ئەو هەردەم بۆلای ماڵی یەکەمە

لەبارەی هاوسەرگیریەوە راوێژ بەکەسێك کرا، وتی: ئافرەت سێ جۆرن، یەکێکیان بۆ تۆیە، یەکێکیان لەسەر تۆیە، یەکێکیشیان نەبۆ تۆیە نەلەسەر تۆیە.

کچ بۆ تۆیەو ئەو ئافرەتەی منالی لەکەسی تر هەیە لەسەر تۆیەو، بێوەژنیش نە بۆتۆیەو نەلەسەر تۆیە.

غەزالی (رەحمەتی خوای لێبێت) وتوویەتی: هەروەك چۆن واباشە کچ بهێنرێت سونەتیشە کەسەرپەرشتکار کچەکەی بە کوڕ بدات کەپێشتر ژنی نەهێناوە، چونکە دەروونەکان بەوجۆرەیە کەلەگەڵ یەکەم هۆگریوودا رادێن[1]، ئەمە ئەگەر پیاوەکە رەوشێکی تایبەتی نەبوو کە لەگەڵ هێنانی بێوەژندا بگونجێت نەك کچ، ئەگەر شتێ هەبوو کەنەدەگونجا کچ بێنێت، وەك زۆری تەمەنی پیاوەکە یاخود هەبوونی منال لەژنی پێشووی، کەپێویستیان بەپەروەردەکردنە[2] یان شتێکی هاوشێوەی ئەوە، لەم رەوشەدا لەبارتر ئەوەیە بێوەژن بێنێت، وەك ئەوەی جابری کوڕی عەبدوڵا ئەنجامی دابوو پێغەمبەریش (ﷺ) پەسەندی کرد.

---

[1] أحياء علوم الدين ٤٢/٢

[2] هەروەك لەفەرموودەکەی جابرو رەوشەکەیدا.

سێیەم: بەسۆزو منداڵخەرەوە بن: پێغەمبەر(ﷺ) لەفەرموودەکانیدا جەختی لەسەر ئەم خەسڵەتەش لەئافرەتدا کردووە، لەوانە: (تَزَوَّجُوا الْوَدُودَ الْوَلُـودَ فَـإِنِّي مُكَـاثِرٌ بِكُـمْ الْأُمَمَ).[1]

واتە: ئافرەتی بەسۆز کە منداڵیان دەبێت بهێنن چونکە من لەرۆژی دواییدا بـەزۆری ئێوەوە لەنێو نەتەوەکاندا شانازی دەکەم.

[1] أبو داود ١٧٥٤، الولود: واتە: منـاڵی زۆر ببێـت (کـثيرة الولـد). والـودود: بەسـۆز بێـت بـەهۆی رەوشـتی جوانیەوە.

# دەروازەی دووەم:
# یەکترناسینی هەردوولا

روانگەی یەکەم بۆ ئەم یەکترناسینە بینین‌و سەیرکردنی یەکترە، لەسنوورێکی دیاریکراودا بێت، کاتەکەشی پێویستە پێش خوازبێنی بێت‌و زیاتر گومانی ئەوە بکرێت کە رەزامەندی دەدرێت، پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی پێشەکیەکانی هاوسەرگیرییەوە کەهەیەو زانایان لە پەڕاوی مارەکردن (کتاب النکاح)دا ئەم فەرموودانەیان هێناوە، لەو فەرموودانە:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (إِذَا أُلْقَى اللَّهُ فِي قَلْبِ امْرِئٍ خِطْبَةَ امْرَأَةٍ فلا بَأْسَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَيْهَا).[1]

واتە: ئەگەر خوای گەورە خوازبێنی ئافرەتێکی خستە دڵی پیاوێکەوە ئاساییە با سەیری بکات.

هەروەها فەرموویەتی: (إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمْ الْمَرْأَةَ[2] فَإِنْ اسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى مَا يَدْعُوهُ[3] فَلْيَفْعَل)[4].

واتە: ئەگەر یەکێك لەئێوە ئافرەتێکی خوازبێنی کرد ئەگەر توانی ببیبنێت با ئەوە بکات.

لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە: (إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمْ الْمَرْأَةَ فَإِنْ اسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى مَا يَدْعُوهُ إِلَى نِكَاحِهَا فَلْيَفْعَلْ).

---

[1] ابن ماجه: ١٨٥٤ السنن الكبرى ٧/٨٥ نيل الاوطار ٦/٩٤.

[2] واتە ویستی دلخوازی بکات یاخود دەیویست بنێرێتە داخوازیی چونکە بینین دەبێت بەر لە داخوازی بێت.

[3] واتە لای گرنگەو ئەوەی دەوێت.

[4] ابو داود: ١٧٨٣ عون المعبود على سنن ابي داود: باب الرجل ينظر الى المرأة.

واتـە: ئەگـەر کەسـێك لـەئێوە خـوازبێنی ئـافرەتێکی کـرد گـەر تـوانی ئـەوەی دەیخوازێت سەیر بکات با بیبینێت.

پێغەمبـەر (ﷺ) لـە فەرموودەکانیـدا مەبەسـتی بینینـی خوازبێنیکراوەکـەی روون کردۆتەوە:

فقد رُوي ان المغيرة بن شعبة خطب امرأة، فقال له النبـي ﷺ: أنظرت إليها؟ فقـال: لا، فقال له الرسول ﷺ: انظر اليها فإنه احرى ان يُؤدم بينكما.[1]

واتە: دەگێڕنەوە موغیرەی کوڕی شعبە خوازبێنی ئافرەتێکی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ئایا سەیرت کرد؟ وتی: نەخێر، پێغەمبـەر (ﷺ) پێـی فـەرموو: سـەیری بکە چونکە ئەو بینینە دەبێتە هۆی گونجانو بەردەوامی خۆشەویستی لەنێوانتاندا.

بەهـەمان شـێوە ئافرەتـە خـوازبێنی کراوەکـەش ئـەو پیـاوە ببینێـت کەهاتۆتـە خـوازبێنی تـا بەویسـتی تـەواوی خـۆی رەزامەنـدی بنوێنێـت لەسـەر خـوازبێنیو هاوسەرگیریەکەی.

فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) کەباسـی ئـەوە ناکـەن ئافرەتـە داخوازیکراوەکـە سەیری پیاوە خوازبێنیکارەکەی بکات ئەو مانایە نادات کەتەنها بۆ پیاو دروست بێت ئافرەت ببینێت، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە بـەزۆری ئـافرەت داپۆشـراوە، بۆیـە دەقەکـە بەراشکاوی لەبارەی بینینیەوە هاتووە، بەڵام پیـاو هـەردەم بینـراوەو دانەپۆشـراوە، ئافرەتە داخوازیکراوەکە دەتوانێت بەبێ هـیچ رێگریـەك بەئاسـانی ببینێـتو چـاکەو خراپەکانی بزانێت، بەپێچـەوانەی بینینـی ئـافرەت لەلایـەن پیـاوەوە، لەبـەر ئەوەیـە فەرموودەکانی پێغەمبەر باسی پیاوی کردووە تا ئەوە بخاتە روو ئافرەت هەرچـەندە داپۆشراوە لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە خوازبێنیکـار بـەر لەداخوازیکردنەکـەی ببینێـت ئەگەر هاتوو سووربوو لەسەر خوازبێنیو هاوسەرگیری لەگەڵیدا.

---

[1] سبل السلام ٣/١١٢ـ ١١٣وفيه: رواه احمد وابو داود ورجاله ثقات.

بەڵام لەماڵ چوونە دەرەوەی کچ بۆ پارکو شوێنە گشتیەکان لەگەڵ ئەو کەسەی دەیەوێت بێتە خوازبێنی یاخود پاش خوازبێنیەکەی بەڵام پێش مارەکردنی بەپاساوی ئاشنابوونی رەفتاری کەسی بەرانبەری، کارێکە شەریعەتی ئیسلام بەتوندی رەتی دەکاتەوەو عەقڵی هۆشمەندیش پێی رازی نیە، چونکە ئەو شێوازە سەرەڕای ئەوەی شەرعی نیە، دەبێتە هۆی لەکەدارکردنی ناوبانگی کچەکەو خێزانەکەی لەکاتێکدا کەئەو هێشتا خوازبێنی نەکراوە یاخود مارە نەبڕاوە، ئیدی هۆی ئەو کارە هەرچی بێت، لەسەر ئەو کەسانە پێویستە کەبەلایانەوە گرنگە رێزو ناوبانگی خۆیان بپارێزن جگە لەناو ماڵ یاخود جێگەیەکی باشو ئامادەبوونی کەسانی مەحرەم لەگەڵیاندا رێگە نەدەن بەتێکەڵبوون.

**پرس و را:**

بەهۆی گەشەکردنی ژیانو گۆڕانی خەڵکو خۆنواندنی هەریەک لەخوازبێنیکارو داخوازیکراو و خۆ دەرخستن بەو ئاکارانەی کەتێیدا نیە بەمەبەستی راکێشانی سەرنجی لایەنی بەرانبەرو زیادکردنی ویستی هاتنەخوازبێنیو هاوسەرگیری کردن لەگەڵیدا، وا پەسەندە کە هەریەک لەخوازبێنیکارو داخوازیکراو پێش خوازبێنیەکە پرسو را بەکەسانی متمانە پێکراوو راستگۆو سپاردە پارێز بکەن، تا بەباشی ئاشنای ئاکاری کەسی بەرانبەرو بنەچەو رەچەڵەکو توانای دارایيو پێگەی کۆمەڵایەتی لەنێو کۆمەڵداو رێزی لەو ناوچەیەی تێیدا نیشتەجێیە ببنو ئەو پرسیارانەی هاوشێوەی ئەمانەیە کەپێویستن بیکەن کەبەهۆیانەوە رووی راستەقینەی هەریەکەیان دەردەکەوێت، چونکە هاوبەشێتی هاوسەرگیری لەسروشتو کرۆکو ئامانجەکانیدا جیاوازە لەهەر هاوبەشێتیەکی دیکەی ژیان.

کشانەوەی هەر یەکێکیان لەخوازبێنیەکەو پاشگەزبوونەوەی لێی پاش ئەوەی چووە پێشەوە لەرووی مادیو مەعنەویەوە ئەنجامو شوێنەواری خراپی دەبێت.

## راستگۆیی پرس و را پێکراو:

هەر کەسێك لەبارەی چاكو خراپی خوازبێنیکار یان داخوازیکراوێك بۆ ژیانی هاوسەریو بونیاتنانی پەیوەندی ژنو مێردایەتیو ژیانی هاوبەشی نهێنیو ئاشکرا پرسو رای پێکرا، لەسەری پێویستە چی راستەو واقیعە ئەوە بڵێت، هەر چاکەو خراپەیەك لەو کەسەدا هەیە بیڵێت، ئەو ناتەواویانەی کەهەیە ئەگەر کاریگەری هەبوو لەسەر ئایندەی ژیانی هاوسەری بیخاتە روو، چونکە پرسو راپێکراو پشتی پێ دەبەسترێتو لێی دڵنیاوجێی متمانەیە لای ئەو کەسەی پرسو رای پێدەکات، هەر ئەویشە لەپێشەوە بڕیار لەسەر ئایندەی ئەو هاوسەرگیرییە دەدات بەخستنە رووی ئەو راستیانەی کەکاریگەریان هەیە لەسەر سەرکەوتن یان شکستی ژیانی هاوسەریان.

باسکردنی کەمو کورتیو خراپە لەشەریعەتی ئیسلامدا قەدەغەکراوە، تەنها لەحاڵەتی پرسو را پێکردندا نەبێت، پێویستە تەنها لەو بابەتانەدا بێت کەپەیوەندداره بەژیانی هاوسەرێتیەوە، ئەم کارەش نابێتە باسکردنی پاشەملە (غەیبەت)، بەڵکو پێشکەشکردنی کۆمەكو هاوکارییە بەو کەسەی پرسو رای پێکردووە، بەڵگەش لەسەر رەوایەتی ئەمە ئەو کاتەی فاتیمەی کچی قەیس پرسو رای کرد بە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ ئەبی جەهم یان معاویە، پێغەمبەر پێی فەرموو:

(أَمَّا أَبُو الْجَهْمِ فَلَا يَضَعُ عَصَاهُ[1] وَأَمَّا مُعَاوِيَةُ فَصُعْلُوكٌ لا مَالَ لَهُ، انْكِحِي أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ).[2]

---

[1] ئەم قسەیە بۆ دەربڕینی زۆر لێدانو ئازاردانی هاوسەرەکەی بەکاردێت، هەندێکیش پێیان وایە بۆ زۆر گەشت کردنی بەکارهاتووە.

[2] مسند الامام احمد: ٢٦٠٦٣. مغني المحتاج للشربيني ١٢٧/٣ اعانة الطالبين للدمياطي ٢٦٢/٢.

واتە: بەڵام ئەبو جەهم ئـەوا گۆچـانەکەی فـڕێ نـادات، معاویـەش ڕەش‌و ڕووتـەو ماڵ‌و سامانی نیە، شوو بە ئوسامەی کوڕی زەید بکە.

بەهەمان شێوە ئەگەر پرسیار لەخودی خوازبێنیکار[1] کرا لەبارەی خۆیەوە ئەگەر هەر ناتەواوی یـاخود کـەم‌و کورتییـەك یـان کـەم توانـایی مـادی یـان جەسـتەیی بـۆ پێکەوەژیانی هاوسەری تێدابوو پێویستە ڕاستیەکەی بڵێت‌و حـاڵی چـۆنە بیخاتـە ڕوو تا لایەنی بەرانبەر فریوو نەدات[2].

پوختەی قسـە ئەوەیـە پێویسـتە خوازبێنیکـار هـەر کـەم‌و کـورتی‌و ناتەواویـەکی جەستەیی‌و مادی‌و کۆمەڵایەتی‌و تەندروستی، یان هەر ناتەوایەکی دیکە ئەگەر هەیبوو بەداخوازیکراوەکەی بڵێت، بەهەمان شێوە لەسەر داخوازیکراویش پێویستە هەر کەم‌و کورتی یان ناتەواوییەکی هەبوو بۆ خوازبێنیکارەکەی باس بکات.

---

[1] مەبەست ئەوەشە کەداخوازیکراوەکەش دەگرێتەوە.

[2] مغني المحتاج للشربيني ١٢٧/٣ اعانة الطالبين للدمياطي ٢٦٢/٢.

# دەروازەی سێیەم:
# خوازبێنی و
# شوێنەوارەکانی پاشگەزبوونەوە لەخوازبێنی

(الخِطبة): ئیدی ژێره (کسر) لەژێر پیتی(خ) بێت یان سەره (فتحة)، واته: دەربڕینی ویستی پیاو بۆ خوازبێنی ئافرەتێکی دیاریکراو کەهیچ ڕێگرییەکی شەرعی لەبەردەمیدا نەبێت و ئافرەتەکەش ڕەزامەند بێت، لێرەدا پیاوەکە خوازبێنیکارە ئافرەتەکەش داخوازیکراوە.

## گونجاندنی خوازبێنی (تکییف الخطبة):

خوازبێنی گرێبەندی هاوسەرگیری نیە، بەڵکو بەڵێندانە بەهاوسەرگیری، لەبەر ئەوە پاشگەزبوونەوە لێی بەرپرسیارێتییە گرێبەندیەکان ناخاتە ئەستۆی، بەڵکو دەبێتە سەرچاوەی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمانە (مصدر المسؤولیة التقصیریة) ئەگەر هاتوو پاساوێکی شەرعی نەبوو بۆ پاشگەزبوونەوەکەی.

## گرنگی خوازبێنی (أهمیة الخطبة):

هاوسەرگیری پەیوەستکارێکی شەرعی مەترسیدارەو پەیمانێکی گرنگە لەنێوان نێرو مێدا پێویستی بە بەرچاوڕوونیو بیرکردنەوەی قوڵو مەنگ هەیەو پێشەکیەکانی هەنگاو بەرێکیو هۆشیارییو وردبینانە ببڕدرێت کەدڵنیا ببنەوە لەرەزامەندی هەردوولاو ڕەزامەندی خێزانەکانیان، چونکە هەر کەموکورتیەك لەو ڕەزامەندیەدا هەبێت بەزۆری دەبێتە هۆی سەرنەکەوتنی ئەو پەیوەندییە.

خوازبێنی قۆنـاغی کۆتاییـە لەقۆناغـەکانو پێشـەکیەکانی هاوسـەرگیریو بـەردی بناغەی بونیاتنـانی بونیـادی خێزانـە، هـەر بۆیـە ئەگـەر بەسـەرکەوتوویی ئەنجامـدرا دەبێتە مسۆگەرکاری سەرکەوتنی ئەو هاوسەرگیرییە لەئایندەدا.

## چوونە خوازبێنی بەسەر خوازبێنی کەسی تردا(الخطبة على خطبة الغير):

پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لەخوازبێنی بەسەر خوازبێنی کەسێکی تردا، مەگـەر خوازبێنیکـاری یەکـەم رێگـەی بـەوە دابێـت، یـان وازی لەخوازبێنیەکـەی هێنابێـت، لەعومەری کوری خەتابەوە (خوا لێی رازی بێت) دەگێرنەوە دەیووت: (نَهَى النَّبيُّ ﷺ أَنْ يَبِيعَ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْـعِ بَعْـضٍ، وأن يَخْطُـبَ الرَّجُـلُ عَلَـى خِطْبَـةِ أَخِيـهِ حَتَّـى يَتْـرُكَ الْخَاطِبُ قَبْلَهُ أَوْ يَأْذَنَ لَهُ الْخَاطِبُ).[1]

واتە: (پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە کەستان فرۆشـتن بەسـەر فرۆشـتنی کەسـی ترتاندا ئەنجام بداتو، پیاو بەسەر خوازبێنی کەسێکی تردا بچێتە خـوازبێنی تـا ئـەو کاتەی خوازبێنیکاری پێش خۆی واز لەخوازبێنیەکەی دێنێت یاخود مۆڵەتی دەدات).

جیاوازی بۆچوون هەیە لەبارەی حوکمی خوازبێنیکاری دووەم بۆ خـوازبێنیکراوی خوازبێنیکاری یەکەم، کۆمەڵی زانایان[2] وتوویانـە: هاوسـەرگیریەکە دروسـتە چـونکە خـوازبێنی گرێبەنـد نیـە، بـەڵام خوازبێنیکـاری دووەم لەبـەردەم خـوادا گوناهبـارەو لەرووی ئاینیەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکرێت نەك لەرووی دادگاییەوە.

نەهی کردن لەفەرموودەکەدا مانای پوچەڵ (فساد)ی نەهی لێکراوەکە ناگەیەنێـت، چونکە نەهیەکە نە لەخودی شتەکەیە نەلەوەصـفە پێویسـتەکەی، بـەڵکو لەوەصـفی ناپێویستە کەئەویش ئازاردانی دڵی خوازبێنیکاری یەکەمە.

---

[1] صحيح البخاري: ٤٧٤٦. حاشية الدسوقي على الشرح الكبير ٢/٢١٧ .

[2] حاشية الدسوقي على الشرح الكبير٢/٢١٧.

زاهریەکان وتوویانە: هاوسەرگیری خوازبێنیکاری دووەم پوچەڵ (فاسد)ە دەبێت بەرەهایی هەڵبوەشێنرێتەوە ئیدی سەرجێی لەگەڵ کردبێت یان نا جیاوازی نیە، چونکە نەهی بەمانای نادروستی نەهی لێکروەکە دێت بەرەهایی، ئیدی نەهیەکە بۆ خودی شتە نەهی لێکراوەکە بێت یاخود بۆ وەصفە پێویستەکەی یان بۆ وەصفە نا پێویستەکەی.

بۆچوونی بەناوبانگ لەمەزهەبی ئیمام مالیکدا ئەمەیە:

لەسەر دادوەر پێویستە پێش سەرجێی کردن ئەگەر پێی زانی بڕیار بدات بەهەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریەکەو جیاکردنەوەی ژن و مێردەکە، بەڵام ئەگەر پاش سەرجێی کردن زانی ئەوا هاوسەرگیریەکە بەردەوام دەبێتو هەڵناوەشێنرێتەوە، چونکە بەسەرجێیکردنەکە تەواو تەئکید بووەو هەڵوەشاندنەوەی زیانی زیاتر لێدەکەوێتەوە لەو زیانەی خوازبێنی کردن بەسەر خوازبێنی یەکەمدا دروستی کردووە[1].

## شوێنەواری پاشگەزبوونەوە لە خوازبێنی (اثر العدول عن الخطبة):

گرنگترین شوێنەوارەکانی پاشگەزبوونەوەی بێ پاساو لەخوازبێنیدا ئەمانەیە:

أ- پاشگەزبوونەوەی بێ پاساو پێچەوانەی ئاکارو رەوشتی پەسەندە، چونکە خوای گەورە فەرمانی کردووە بەئەمەکداری بەرانبەر بەڵێن و دەفەرمووێت: ( وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً )[2]، واتە: ئەمەکداربن بەرانبەر بەڵێنەکانتان چونکە بەڵێندان بەرپرسیارێتی تێدایە.

پێغەمبەریش (ﷺ) لەفەرموودەکانیدا جەختی لەمە کردۆتەوە:

---

[1] الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ١/٣٥١.

[2] سورة الاسراء: ٣٤.

(آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ).[1]

واتە: نیشانەی دوو ڕوو سیانە، کە قسە دەکات درۆ دەکات، کە بەڵێن دەدات نایباتە سەر، کە سپاردەی لا دادەنرێت ناپاکی تیا دەکات.

سەرەڕای ئەمە شەریعەتی ئیسلام لەڕووی دادوەریەوە ئەو دوو دەستگیرانەی ناچار نەکردوە لەسەر تەواوکردنی هاوسەرگیریەکە لەدادگا، بەڵکو پابەندی لەڕووی ئاینیەوەیە، چونکە پێویستکردنی لەدادگا زۆرکردن(اکراه)ە لەسەر هاوسەرگیریو هاوسەرگیریش بەڵێننامەیەکی هەمیشەییە پێویستە دوور بێت لەهەموو ناچارکردنێك.

ب- زانایانی شەریعەتو یاسا هاودەنگن لەسەر ئەوەی هەرشتێك خوازبێنیکار دەیداتە خوازبێنیکراوەکەی لەسەر بنەمای مارەیی یان بەشێك لێی بەرەهایی پێویستە بۆی بگەڕێنرێتەوەو یان لەبری ئەوەی پێ بدرێتەوە ئەگەر هاوسەرگیریەکە ڕووی نەدا ئیدی هۆکارەکە هەرچی بێت، بەویست بێت یان بە ناویست وەك مردن جیاوازی نیە، چونکە مارەیی لەو شتانەیە کەپەیوەستن بەهاوسەرگیریەوەو ئەوەش ڕوونەداوە.

ج- جگە لەمارەیی، ئەگەر مەرجێك لەئارادا بوو یاخود نەریت وابوو کە دیاریەکان دەگەڕێنرێنەوە یان نەریت وەها بوو کەدیاریەکان ناگەڕێنرێنەوە، پێویستە بەپێی ئەو مەرجەی کەهەیە یان ئەو نەریتەی باوە کاربکەن، ئەگەر مەرجو نەریتیش نەبوو، ئەوا گەر پاشگەزبوونەوەکە لەخوازبێنیکارەکەوە بوو ئەوا هیچ لەدیاریەکان ناگەڕێنرێنەوە بۆی، چونکە بەو پاشگەزبوونەوەی لەداخوازیەکەی بۆتە هۆی ئازاردانی داخوازیکراوەکە، مافی ئەوەی نیە ئازاری بدات لەلایەکی دیکەشەوە مافی ئەوەی نیە کەداوای دیاریەکان یان قەرەبووی دیاریەکان بکاتەوە بۆی بگەڕێننەوە.

---

[1] صحیح البخاري: ٣٢.

ئەگەر پاشگەزبوونەوەکە لەخوازبێنی کراوەکەوە بوو ئەوا لەسەری پێویستە ئەوەی پێی دراوە ئەگەر مابوو بیگێڕێتەوە، ئەگەر نەشمابوو لەبری ئەوەی بداتەوە، چونکە بەپاشگەزبوونەوەکەی ئازاری داوە، مافی ئەوەی نیە ئازاریشی بدات بەهێشتنەوەی دیاریەکانو نەدانەوەی بەخوازبێنیکارەکەی، چونکە دیاریەکان بۆ مەبەستێك پێشکەش کرابوون کە پێشکەشکار ئەو مەبەستەی بۆ نەهاتوتە دی بۆیە بۆی هەیە بیانگێڕێتەوە[1].

د- ئەگەر داخوازیکردنەکە پێش هاوسەرگیری بەمردنی یەکێکیان کۆتایی هات، یاخود بەهۆی رێگریەکی دیکەوە کەبەویستی ئەمان نەبوو بووە هۆی ئەنجامنەدانی هاوسەرگیری، ئەوا هیچ شتێك لەدیاریەکان ناگەڕێنرێتەوە بە رێکەوتنی رەزامەندانە نەبێت.

هـ- ئەگەر بەهۆی پاشگەزبوونەوە لەخوازبێنیەکەوە زیانێکی مادی دروست بوو وەك وازهێنان لەفەرمانبەری یاخود رێگری لەخوێندن یاخود پرۆژەیەکی قازانجمەند یان شتێکی هاوشێوەیان، یاخود زیانێکی مەعنەوی لێکەوتەوە وەك ناوزڕاندن (تشهیر) یان لەکەدارکردنی ناموس، ئەوەی کەبۆتە هۆکاری ئەو زیان گەیاندنە بەبەرانبەرکەی لەسەر بنەمای بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی (المسؤولیة التقصیریة) ئەو بەرپرسیارێتیە لەئەستۆ دەگرێت.

---

[1] لە (اعانة الطالبین للدمیاطي ٣/٢٦٧)دا هاتووە: (هەر کەسێك خوازبێنی ئافرەتێکی کردو خەرجی بۆ کرد تا هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتو ئەو هاوسەرگیریە رووینەدا بۆی هەیە ئەوەی خەرجی کردووە بۆی لێی وەرگرێتەوە ئیدی ئەوەی خەرجی کردووە بۆی خواردن بێت یان خواردنەوە یاخود جلوبەرگ یان خشڵ) .

# بەندی سێیەم

## حەرامبووەکان لەهاوسەرگیریدا

ئەو ئافرەتانەی حەرامن لەهاوسەرگیریدا دەکرێنە دووبەش، بەشێکیان حەرامبوونەکە هەمیشەییە و هاوسەرگیری لەگەڵیاندا بەهیچ شێوەیەك دروست نیە، بەشەکەی تریان حەرامبوونی هاوسەرگیری لەگەڵیاندا کاتیە، چونکە حەرامبوونەکە بەهۆی خودی خۆیانەوە نیە، بەڵکو بەهۆی رێگرێکەوەیە، کاتێ رێگرەکە نەما قەدەغەبوونەکەش هەڵدەگیرێت و دروستە هاوسەرگیری لەگەڵیان.

باسکردنی ئەم دووبەشە بۆ دوو دەروازە دابەش دەکەین، پاشان لەدەروازەی سێیەمدا باس لەباساوەکانی چەند ژنێتی (تعدد الزوجات) دەکەین.

# دەروازەی یەکەم:
# ئەو ئافرەتانەی حەرامبوونیان هەمیشەییە

ئەم ئافرەتانە لەرووی هۆکاری حەرامبوونەوە دەبنە سێ جۆر: حەرامبووەکان بەهۆی خزمایەتیەوەو، حەرامبووەکان بەهۆی ژن و ژنخوازییەوە، حەرامبووەکان بەهۆی شیرپێدانەوە.

## جۆری یەکەم - حەرامبووەکان بەهۆی خزمایەتیەوە:

ئەمانەش دەبنە چوار پێڕ:

**پێڕی یەکەم** - ئەو ئافرەتانەیە کەلق و لقی لقەکانو بەرەوخوارتری پیاوەکەن و، بەمەش کچی خۆیو کچی منداڵەکانی (کوڕ یان کچ)و بەرەوخوارتری لێ حەرام دەبێت، هەروەها ئەو کچەشی لێ حەرام دەبێت کەبەهۆی هاوسەرگیرییەکی پوچەڵ (الزواج الفاسد) بووە، چونکە بەهۆی گومانەوە کە ئافرەتەکە رەچەڵەکی لەم پیاوە بێت.

**پێڕی دووەم** - بنەچەی پیاوەکە (اصول الرجل)ئەو ئافرەتانەی لەبنەچەی پیاوەکەو بنەچەی بنەچەکانیی و بەرەوسەرتر لێی حەرام دەبن، بەمەش دایکیو داپیرەی لەسەری باوکو لەسەری دایکەوەو بەرەوسەرتریش لێی حەرام دەبن.

**پێڕی سێیەم** - ئافرەتانی لقەکانی دایکو باوکیو لقی لقەکانیانو بەرەوخوارتر، بەمەش خوشکەکانی (ئیدی خوشکی دایکو باوکی بن یان تەنها لەسەری دایکەوە یاخود لەسەری باوکەوە)و کچەکانیانو بەرەواخوارتر لێی حەرام دەبن، کچی براکانیشی (برای دایکو باوکی یان لەسەری باوکەوە یاخود لەسەری دایکەوە)و بەرەوخوارتر.

**پێڕی چوارەم** ـ لقەکانی باپیرەو داپیرەکانی لەپلەی یەکەمدا، بەمەش پورەکانی (خوشکی باوکی)و پورەکانی (خوشکی دایکی) –بەبێ کچەکانیان–[1] لێی حەرام دەبێت، بەهەمان شێوە پورەکانی باوکو دایکیشی لێی حەرام دەبن.

بەڵگە لەسەر حەرامبوونی ئەو چوار پێڕەی ئافرەتان قورئانی پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموێت: (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ[2] وَبَنَاتُكُمْ[3] وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاتُكُمْ[4] وَبَنَاتُ الأَخِ[5] وَبَنَاتُ الْأُخْتِ[6])[7] کچ لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەوش دەگرێتەوە کەبەرهەمی سەرجێییەکی پەیوەندیدار بەگومانیش دەگرێتەوە، وەك هاوسەرگیری پوچەڵ (الزواج الفاسد).

کەسێك هاوسەرگیری کاتی کرد (وەك هاوسەرگیری موتعە) یاخود هاوسەرگیری بەبێ ئامادەبوونی دوو شایەت، یان جۆرێکی تری هاوسەرگیری کەزانایانی شەریعەت بۆچوونی جیاوازیان هەبوو لەبارەی دروستیەوە، ئەوا سەرجێی لەم جۆرە هاوسەرگیریەدا پەیوەستە بەگومانکردن لەوەی کەحەڵاڵ بێت، بەهۆی بوونی گرێبەند (عقد)ەوە یا بەشێوەیی (صورە) بێتو ئەم شوێنەوارانەی لێدەکەوێتەوە:

١– ئەو منداڵەی بەهۆی ئەم هاوسەرگیریەوە دەبێت بنەچەکەی وەك بنەچەی منداڵی هاوسەرگیری دروست وایە لەرووی مافو پابەندیەکانەوە.

٢–مارەیی هاوشێوە هەیە بۆ ئافرەتە سەرجێی لەگەڵ کراوەکە.

---

[1] دروستە هاوسەرگیری کچی پورو مامو خاڵ.

[2] دایك داپیرەو بەرەوسەرتریش دەگرێتەوە.

[3] کچو کچی کورو کچی کچو بەرەوخوارتر دەگرێتەوە.

[4] پورەکان دەگرێتەوە دایکو باوکی بن یان تەنها لەسەری باوك یان لەسەری دایکەوە بن.

[5] یا بەروخوارتریش بن.

[6] یا بەروخوارتریش بن.

[7] سورة النساء:٢٣.

٣-ئەگەر جیابوونەوە، ئافرەتەکە ماوەی چاوەڕوانی (عدە)ی لەسەرەو پێویستە دادوەر دەستبەجێ فەرمان بەو جیاکردنەوەیە بدات.

٤-سزای تاوانی زینا بەسەر سەرجێیکارو سەرجێی لەگەڵ کراودا جێبەجێ ناکرێت لەبەر بوونی گومان.

٥-ژن‌و ژنخوازی بەم سەرجێی کردنە دەسەلمێت.

## جۆری دووەم: حەرامبووەکان بەهۆی ژنخوازیەوە:

ئەمانەش چوار پێڕن:

**پێڕی یەکەم**- ئەمانەش لقەکانی ژنەکەی دەگرێتەوە کەسەرجێی لەگەڵ کردووە، ئیدی ئەو ئافرەتە بەژنی مابێتەوە یاخود تەڵاقی دابێت یان مردبێت، کچەکانی ئەو ئافرەتەی سەرجێی لەگەڵ کردووە لەپیاوێکی پێشتریشی بۆ ئەم حەرامە، هەروەها کچی کچەکانی‌و کچی کوڕەکانی‌و بەرەوخوارتریش، بەڵام ئەگەر خواستی‌و پێش سەرجێی تەڵاقیدا یان پێش ئەوەی سەرجێی لەگەڵ بکات مرد ئەوا بۆی حەرام نابن، بەپێی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: ( وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ ) ئەم ئایاتە دایکانتان (امهاتکم)دەگرێتەوە، واتە:(حُرمت علیکم ربائبکم اللاتي... الایة)، بەستنەوەی ئایەتەکەش بە(دخلتم بهن) سەرجێیتان لەگەڵ کردبن کارپێکراوە لەحوکمەکەدا، ئەگەر ئەوە هاتەدی ئەوا دەربڕوای دەقەکە(منطوق النص) جێبەجێ دەکرێت کە (التحریم)ە واتە حەرامکردنە، بەڵام ئەگەر ئەوە نەهاتەدی ئەوا مانا پێچەوانەکەی کار پێدەکرێت کە(عدم التحریم) واتە حەرام نەبوونە، کەخوای گەورە بەم فەرمایشتەی جەختی لەسەر کردووە: (فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكُم).

بەڵام کۆتی (فِي حُجُورِكُمْ)لەحوکمەکەدا کارپێکراو نیە، بەڵکو لەسەر بنەمای واقیعی حاڵ لەئایەتەکەدا هاتووە، کەئەویش بریتیە لەوەی کچ لەمێردی پێشتر ئەگەر

شووی نەکردبێت ئەوا بەزۆری لەماڵی هاوسەرە تازەکەدا دەبێت.

**پێڕی دووەم**- بنەچەی ژنەکە ئیدی سەرجێی لەگەڵ کردبێت یان نا، کەسێك ئافرەتێکی هێنا ئەوا بنەچەکانی (دایكو داپیرە لەسەری باوکەوەو لەسەری دایکەوەو بەرەوسەرتر) تەنها بە ئەنجامدانی گرێبەندەکە لێی حەرام دەبێت، ئەگەر پێش سەرجێیکردن تەلاقیدا یان مرد، ئەوا حەرامبوونەکە هەر بەردەوامو هەمیشەیی دەبێت لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وامهات نسائكم) دایکانی ئافرەتەکانتان، چونکە ئایەتەکە دایکان (امهاتكم) دەگرێتەوە، واتە: حەرام کراوە بۆتان دایکانی ئافرەتەکانتان، دەقەکەش بەرەهایی هاتووەو کۆتی سەرجێی کردنی تێدا نەهاتووەو، دەقی رەهاش کار بەرەهاییەکەی دەکرێت ئەگەر هاتوو کۆتکرانی نەسەلمێنرابوو لەمەشدا نەسەلمێنراوە، بۆیە زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی تەنها بەئەنجامدانی گرێبەندی هاوسەرگیری حەرام دەبێت، فەلسەفەی جیاوازیکردن لەنێوان کچی ژنەکە لەمێردی پێشتری کەدەبێت سەرجێی لەگەڵ دایکی کچەکەدا بکات ئەمجا بۆ پیاوەکە حەرام دەبێت لەگەڵ دایکی ژنەکە (یان داپیرەی) کەتەنها بەئەنجامدانی گرێبەند حەرام دەبێت با سەرجێیش رووی نەدابێت، ئەوەیە کەپیاو پێویستی بەهاوکاری دایکی ژنەکەی هەیە لەتەواوکردنی مەراسیمەکانی هاوسەرگیریو پێداویستیەکانیدا، خوای گەورە ویستوویەتی کەتەنها بەئەنجامدانی گرێبەندی کچەکەی وەك دایکی مێردەکەی لێ بێت، بەپێچەوانەی ئەوەی کاتێ ئافرەتێك پاش تەلاقدانی یان پاش مردنی مێردی پێشتری دەخوازرێت پێویستی بەهاریکاری کچەکەی کەلەمێردی پێشوویەتی نیە، چونکە بەئەزموونی ژیانی هاوسەریدا رۆشتووەو لەهەموو ئەو شتانەی پەیوەندداره بەپێداویستیەکانی هاوسەرگیری نوێیەوە شارەزایە.

**پێڕی سێیەم**- ژنی بنەچەکانی (زوجات الاصول)، بۆ پیاو حەرام دەبێت گرێبەندی هاوسەرگیری لەگەڵ ژنی باوکیدا باسەرجێیشی لەگەڵ نەکردبێتو تەنها گرێبەندی

هاوسەرگیریان هەبوبێت، بەهەمان شێوە ژنی باپیرەی لەسەری باوا. یاخود لەسەری دایکەوەو بەرەوسەرتر ئیدی سەرجێیی کرابێت یان نا جیاوازی نیە، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وَلا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُمْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً[1] وَمَقْتاً[2] وَسَاءَ[3] سَبِيلاً )[4]

مەبەست لەمارەکردن لەو فەرمایشتەدا (ولا تنكحوا)گرێبەندی هاوسەرگیرییە (بە مانا شەرعیەکەی) سەجێیکردن (الوطء) واتا زمانەوانیەکەی (معناه اللغوي)یەتی لەلای ئەوانەی سەلماندنی ژنخوازیەکە لەلایان بەزینا دادەنرێت[5].

مەبەستیش لە (ما قد سلف) واتەی ئەوەی پێش ئەم کارەتان روویداوە، ئەوە لێی بوراوەو ئەمەش بنەمایەکە لەبنەماکانی نەبوونی کاریگەری پێشینەی دەق (عدم رجعية النص)، حەرامبوونەکە هیچ کاریگەری پێشینەی نیە لەرووی سزاییەوە، هیچ گوناهکار نیە پاش موسڵمانبوونی دەبێت دەستبەجێ لێی جیا ببێتەوە، چونکە ئایەتەکە گوزارشتە لەسزانەدانی ئەو کارانەی پێش ئیسلام ئەنجام دراون نەك بەدروست زانینیان، ئەوان لەنەفامیدا لەوجۆرە کارانەیان زۆر ئەنجام دەدا، چونکە ژن وەك بەشێك لەمیراتی سەیری دەکراو بەزۆری کوڕی گەورە کەلەژنێکی دیکەی پیاوەکە بوو مارەی دەکردەوە.

**پێڕی چوارەم** - ژنی لقەکانی (زوجات الفروع)، حەرامە بۆ پیاو ژنی کوڕەکەی ئیدی سەرجێی لەگەڵ کردبێت یان نا، هەروەها ژنەکانی کوڕی کوڕو کوڕی کچی و

---

[1] واتە مارەکردنیان خراپەیەکی دزێوە.

[2] واتە هۆکارە بۆ قین (مقت) کەئەویش توندترین بوغزە.

[3] واتە خراپترین ڕێچکەو ڕێگایە ئەوە.

[4] سورة النساء /٢٢.

[5] گرێبەندوسەرجێیکردن (العقد والوطء) لەسەر بنەمای کۆکردنەوەی هەردوو واتای حەقیقیو مەجازی یاخود کۆکردنەوەی هەردوو مانا حەقیقیەکە ئەگەر بەهاوبەشی دەربڕین دانرا ئەمەش بۆچوونی حەنەفیەکانە.

بەوخوارتریش، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ( وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ).[1] کۆتی کۆتایی لەم ئایەتەدا کە (من اصلابکم)ە مانای پێچەوانە نادات، چونکە هەمان حوکمی حەرامبوونی هەیە (حەرامبوونی هەمیشەیی) (التحریم المؤبد) با منالّەکانیش لەشیرەوە بن.

## جۆری سێیەم ـ حەرامبووەکان بەهۆی شیرپێدانەوە:

شیرپێدان (الرضاع) لەزمانی عەرەبیدا کە (ر) ژێرە (کسر)ە بێت یان سەرە (فتحة) لەرووی زمانەوانیەوە واتە خواردنەوەی شیر لەمەمکی مرۆڤ یان گیانلەبەر، لەرووی زاراوەی شەرعیشەوە واتە مژینی مەمکی ئافرەت لەلایەن شیرەخۆرەوە لەکاتێکی تایبەتدا.[2]

بۆچوونی پەسەند ئەوەیە مەرج نیە کەئافرەتە شیردەرەکە هاوسەری هەبێت، هەروەها مەرج نیە لەمەمکەوە بیمژێت، بەڵکو شیرپێدان کاریگەری هەیە لەحەرامبوونەکەدا با شیرەکە بکرێتە دەمی شیرەخۆرەکەوە، بەهەمان شێوە بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کەحەرامبوونەکە بەپێنج شیر خواردن تا تێربوون دێتە دی، چونکە ئەم برە مامناوەندە لەنێوان ئەوانەی پێیان وایە نابێت رادەی شیرپێدانەکە کەمتربێت لەدەجار شیرپێدان[3] و بۆچوونی ئەوانەی لایان وایە خواردنەوەی کەمترینی ئەوەی پێی بوترێت شیرپێدان[4] بەسە بۆ حەرامبوونەکە، هەروەها لەبەر ئەوەی ژمارە (پێنج) لەفەرموودەی صەحیحدا هاتووە[5].

---

[1] سورة النساء /٢٣.

[2] بەوەی نابێت تەمەنی شیرەخۆرەکە لەدوو ساڵ زیاتر بێت، ئەگەر تەمەنی لەوە زیاتر بوو ئەوا بەپێی بۆچوونی پەسەند شیرپێدانەکە هیچ کاریگەریی نابێت لەحەرامکردندا.

[3] وەك ئیمامیەکان. الروضة البهية للعاملي٣/٨٣.

[4] وەك حەنەفی ومالکیەکان.

[5] صحيح مسلم ٢/١٠٧٥ژمارە (١٤٥٢).

شایانی باسە کاریگەری خواردنی شیری ئافرەت جگە لەدایکی شیرە خۆرەکە تەنها لەسەر خودی شیرە خۆرەکە دەبێت، هیچ کاریگەریەکی نابێت لەسەر بنەچەو لقەکانیو خوشكو براكانی، چونکە تەنها شیرخۆرەکە دەبێتە یەکێك لەئەندامانی ئەو خێزانەی شێریان پێداوە، حەرامە هاوسەرگیری لەنێوان ئەم شیرخۆرەو بنەچەو لقەکانیو بنەچەو لقو خوێش (حواشی) شێردەرەکەی، ئەم شیرخواردنە هیچ کاریگەریەکی نیە لەسەر براو خوشکەکانی شیرخۆرەکە، دروستە هاوسەرگیری لەنێوان ئەوانو بنەچەو لقو خوێشەکانی شیردەرەکەدا، شیرپێدان بەهۆی شایەتیدانی ئافرەتێكو پیاوێك یاخود دوو ئافرەتەوە دەسەلمێندرێت.

حوکمی حەرامبوونەکە بەسەر ئەو کوڕو کچەشدا جێبەجێ دەکرێت کە شیری ئافرەتی سێیەمیان خواردووە کەدایکی هیچ کامیان نیە بەڵام پێنج جار یان زیاتر خواردبێتیان.

## فەلسەفەی حەرامبوونی بەهۆی ئەو جۆرانەی باسکرا (الحكمة في التحريم بسبب الانواع المذكورة):

پاش ئەوەی قورئانی پیرۆز بەدەقی راشکاو حەرامبوونی هاوسەرگیری بەهۆی خزمایەتیو ژنخوازیو شیرپێدانەوە تێدا هات هیچ پاساوێك نیە بۆ پرسیارکردن لەبارەی فەلسەفەی ئەو حەرامکردنەوە، بەڵام ئەگەر پاساوی عەقڵی زیادکرا بۆ نەقڵی ئەوا ئەو زیادکردنە هێزی پابەندکرانی بەسەر موسڵمانانندا زیاد دەکات، بەپێی ئەوەی لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، لەفەلسەفەو بەڵگە عەقڵیەکانیش ئەمانە دەخەینە روو:

١-زانستی نوێو داهێنانە پزیشکیە هاوچەرخەکان سەلماندوویانە کە پێوەندکردن (تلقيح) لەنێوان بنەماڵە جیاوازەکاندا نەوەیەکی بەهێزتر بەرهەم دێنێت لەوەی کە لەنێوان خزماندا بەرهەم دێت، ئەگەر هاتوو خزمایەتیەکە زۆر نزیك بوو.

ئـەم داهێنانــە زانســتیە هاوچــەرخە لەفــەرموودەی پێغەمبــەردا (ﷺ) هــاتووە، دەفەرمووێت: (لا تنكحوا القرابة القريبة فان الولـد يُخلـق ضـاويا).[1] واتـە: خزمـی زۆر نزیك مەخوازن چونکە منالّی لاوازی لێدەکەوێتەوە.

هەندێ لەزانایان لەم بابەتە دواون[2].

٢–پەیوەندی خزمایەتی زاڵتر دەبێت بەسەر پەیوەنـدی هاوسـەرگیریداو ئـەوەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئارەزووی سێکسی و ویستی پێکەوەبوونی هاوسەرێتی.

٣–پەیوەندی خزمایەتی لەوانەیە ببێتە هۆی هەندێ لەناکۆکی لەنێوان ژن‌و مێرددا یاخود لاساریکردن (نشوز)ی ژنەکە، یان بێ ئەمەکی پیاوەکە بەرانبەر رێزی نێوانیـان یـاخود هاوشـێوەی ئەوانـە کەلەوانەیـە ئەمـەش ببێتـە هـۆی لاوازکردنـی پەیوەنـدی خزمایەتیان ئەگەر نەبێتە هۆی پچڕانی.

٤–بنەچـەکان لـەدایکان‌و داپیرەکـان لەسـەر لقـەکان پێویسـتە رێزیـان بگـرن‌و باوەشی سۆزیان بۆ بکەنەوە، هەروەك قورئانی پیرۆز لەچەندین ئایەتدا فەرمانی بەوە کردووە، لەوانە: (وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاهُمَا فَلا تَقُلْ لَهُمَا أُف وَلا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيمـاً * وَاخْفِـضْ لَهُمَـا جَنَـاحَ الـذُّلِّ مِـنَ الرَّحْمَـةِ وَقُـلْ رَبِّ ارْحَمْهُمَـا كَمَـا رَبَّيَـانِي صَـغِيراً)[3] ئـەم رێزگرتنـەی بنەچەکان لەسەر لقەکان پێویستە کەقورئان فەرزی کردووە ئەمەش دژ دەبێت لەگەڵ ئەوەی بنەچەو بەرەوسەرتر[4] ژنی لقەکەی‌و بەروخوارتر بێت[5].

---

[1] ابن السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ٦/٣١٠.

[2] وەك زانایانی شافیعی لە ( فتح المعين واعانة الطالبين) لە(الفقه الشافعي ٣/٢٧٠ـ٢٧١): مارەکردنی خزمـی دوور لەپێشترە لەخزمی زۆر نزیکی (وەك کچـی مـامو کچـی پـورو کچـی خـاڵ)و بیانیـەك لەبـەر لاوازی ئارەزووی بەرانبەر خزمە نزیکەکەی لەبەر ئەوە منالّەکەیان لاواز دەبێت.

[3] سورة الاسراء/ ٢٣،٢٤.

[4] واتە: بنەچەی ئەصڵەکەی.

[5] واتە: لقی لقەکەی.

ئـەم خالانـەو خـالی دیکـەش زۆرێـك لەحیکمەتـەکانی حـەرامبوون بـەهۆی رەچەڵەکەوە دەخاتە روو.

بەڵام فەلسەفەی حـەرامبوون بـەژنخوازی ئەوەیـە پیـاو ئافرەتێـك دەخوازێـت تـا هەریەکەیان ببێتە داپۆشەری ئـەوی دیکـەیان وەك ئـەو بەشـەی کـەلێك جیانابنـەوە، ئەمەش وا دەخوازێت کەدایکی ژنەکە لەحەرامبووندا وەك دایکی خـۆی بێـت، بـاوکی مێردەکەش لەرووی حەرامبوونەوە وەك باوکی خۆی بێت، بـەجۆرێك تێکـەڵی یەکدی بـبن وەك یـەك خێـزان بـن لـەرووی رەچـەڵەکەوە، ئەمـەش ناکۆکـە لەگـەڵ رێگـەدان بەدروستی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەوانـەی بـەژنخوازی حـەرامبوون، بـەڵام فەلسـەفەی حـەرامبوون بـەهۆی شـیرپێدان ئەوەیـە شـیری شـیرپێدەر دەبێتـە هـۆی بونیاتنـانی گۆشـتو پێگەیشـتنی ئێسـکیو پەیوەسـتی دەکـات پێـوەی وەك پەیوەسـتی منـاڵ بـەدایکی خۆیـەوە، ئەمـە سـەرەڕای پێگـەی دایکایـەتی بـەهۆی شـیرپێدانەوە، ئـەو رێزگرتنـەی قورئـانی پـیرۆز پێویسـتی کـردووە لەسـەر لقـەکان کـەبینوێنن بەرانبـەر بنەچەکانیان بەهەمان شێوە بەتەواوی دەچەسپێت بەسەر حاڵەتی شیرپێداندا.

# دەروازەی دووەم:
# حەرامبووەکان بەشێوەیەکی کاتی

حەرامبوون لەحەرامبووە کاتیەکاندا لەبەر خودی کەسەکە نیە بەڵکو لاوەکیە هۆکارەکانیشی لاوەکین، کە هۆکارەکان لاچوون ئەوەشی بوونەتە هۆی بەدیهاتنی لادەچن[1]، پاشان لەرووی کرداریەوە هۆکارەکانی حەرامبوون رێگرن لەهاوسەرگیری، رێسای شەرعی گشتیش ئەوەیە (اذا زال المانع عاد الممنوع) [2] واتە: کەرێگرەکە نەما قەدەغەکراوەکە قەدەغە نامێنێت.

حەرامبووە کاتیەکان لەرووی سروشتی هۆکارەکانیانەوە یاخود رێگریەکانیانەوە دەبنە شەش پێڕ:

**پێڕی یەکەم** - حەرامبووەکان بەهۆی پەیوەندیان بەهاوسەرگیریەکی پێشترەوە وەك ئەوەی ئافرەتەکە ژنی کەسی تر بووبێت، یاخود لەرووی حوکمەوە وەك ئەوەی لەماوەی چاوەڕوانی جیابوونەوەدا بێت بەهۆی مردن یاخود تەڵاق یان جیاکردنەوەی دادگاوە، جا هەر پیاوێك ژنی کەسێکی تر بێنێت یاخود ئەوەی لەماوەی چاوەڕوانی کەسێکی تردا بیهێنێت پێش کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەی ئەوا هاوسەرگیریەکەی بەتاڵە، لای هەندێك لەزانایانیش بەهەمیشەیی حەرامە بۆی‌و مافی ئەوەی نیە پاش کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەش[3] بیخوازێت ئەمەش وەك

---

[1] چونکە هۆکارەکە وا دەناسرێت کە ناساندنی رووکارە بەرێکی بەهۆی بوونیەوە حوکمەکەشی بوونی دەبێت ئەگەر هیچ رێگریەك لەئارادا نەبوو، نەبوونیشی دەبێتە هۆی نەبوونی حوکمەکەی.

[2] مجلة الاحكام العدلية المادة (٢٤).

[3] شیعەی ئیمامی ئەم بۆچوونیان هەیە، بڕوانە: اللمعة الدمشقية وشرحها الروضة البهية للعاملي ٢/٩٠.

سزایەك لەسەر سەرپێچیەكەی، دواتر لەبابەتی ماوەی چاوەڕوانیدا بەدرێژی باسی ئەوە دەكەین.

**پێڕی دووەم** - بەیەكەوە هێنانی مەحرەمەكان، ڕێسای شەرعی گشتی ئەوەیە كە ئەو دوو ئافرەتەی پەیوەندی مەحرمێتی بەخزمایەتی یان شیرپێدان هەیە لەنێوانیاندا، بەجۆرێك ئەگەر هەر كامێكیان نێر بوایە ئەوی دیكەیان حەرام بوو لێی، دروست نیە بەیەكەوە ببنە هاوسەری، هەروەك لەهێنانی دووخوشك بەیەكەوە باسمان كرد، هەركەس یەكێكیانی هێنا ئەوەی دیكەیان حەرامە بۆی مەگەر پاش جیابوونەوە لەوەی یەكەمو كۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەكەی، لەحەرامبووەكانی تری ئەم هۆكارە هاوسەرگیری ئافرەتە بەسەر پوریدا (خوشكی باوكی بێت یان خوشكی دایكی) یاخود بەسەر كچی برایدا یان كچی خوشكیدا، لەبەر ئەو فەرموودە مەشهورەی كە كۆدەنگی لەسەرەو وەك تەواتر وایە لەپێویستبوونی كاركردن پێی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (لا تُنكح المرأة على عمتها ولا على خالتها ولا المرأة على ابنة اخيها ولا ابنة اختها، انكم ان فعلتم ذلك قطعتم ارحامكم).[1]

واتە: ئافرەت بەسەر پور(خوشكی دایك)یدا مارە ناكرێتو بەسەر پور (خوشكی باوك)یدا مارە ناكرێت، بەسەر كچی براو كچی خوشكیشیدا، ئێوە ئەگەر ئەوەتان كرد ئەوا پەیوەندی خزمایەتیتان پچڕاندووە.

لەم فەرموودەیەوە ئەم دوو حوكمە وەردەگیرێت:

یەكەمیان: ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) لەم ئایەتەوە سەرچاوەی گرتووە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الأُخْتَيْنِ)، پێكەوە هێنانی دوو خوشك.

دووەمیان: فەلسەفەی حەرامكردن بریتیە لەكەراهیەتی غەریزەی دەروونی هەر ئافرەتێك بەرانبەر هەوێ (ژنەكەی تری مێردەكەی)كەی هەیەتی، ئەم دیاردە

---

[1] مسلم في شرحه للنووي ٢٩٠/٩. سنن أبي داود ٥٥٣/٢ والنسائي ٩٧/٦. السنن الكبرى ١٦٥/٧.

سروشتیەش دژە لەگەڵ سیلەی رەحمو پەیوەندی خزمایەتی، بەزۆریش دەبێتە هۆی پچڕانی ئەو پەیوەندییە.

**پێڕی سێیەم** ـ هێنانی زیاتر لەچوار ژن کەدیاریکراوە لەحاڵەتی چەند ژنیدا، هەربۆیە هاوسەرگیری پێنجەم بەتاڵە، مەگەر لەیەکێك لەچوار ژنەکەی تری جیا ببێتەوەو ماوەی چاوەڕوانیەکەی تەواو ببێت، ئەم دیاریکردنەش لەقورئانی پیرۆز فەرمووەکانی پێغەمبەردا هاتووە.

خوای گەورە دەفەرموێت: (فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً )[1].

پێغەمبەر (ﷺ) بەگەنجێك کە دە هاوسەری هەبوو کاتێ کە موسڵمان بوو، پێی فەرموو:(امسك اربعا وفارق سائرهن)[2]، واتە: چواریان بهێڵەرەوەو لەوانەی دیکە جیابەرەوە، لەم فەرموودە پیرۆزەش ئەم دوو حوکمە وەردەگیرێت:

یەکەمیان: دەبێت لەنێوان ئەو چوارەی کەدەیانهێڵێتەوە رێگرێك لەرێگریەکانی هاوسەرگیریو پێکەوەهێنان وەك خزمایەتیو شیرپێدانو ژنخوازی نەبێت.

دووەمیان: بۆ دادوەر نیە لەبارەی چۆنیەتی ژنهێنانی ناموسڵمانێك کە موسڵمان بووەو ژنێك یان زیاتری هەیە، یان پایەو مەرجەکانی هاوسەرگیری شەرعی داواکراو لەهاوسەرگیریدا بەپێی ئاینی ئیسلام پرسیار بکات، ئەمەش لەبەر هاندان بۆ موسڵمان بوون.

**پێڕی چوارەم** ـ حەرامبووەکان بەهۆی نەبوونی باوەڕ بەئاینێکی ئاسمانی وەك هاوبەش پەیداکاران، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وَلا تَنْكِحُوا الْمُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ وَلَأَمَةٌ مُؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ وَلا تُنْكِحُوا الْمُشْرِكِينَ حَتَّى

---

(١) سورة النساء /٣.

(٢) السنن الكبرى ١٤٩/٧.

يُؤْمِنُوا وَلَعَبْدٌ مُؤْمِنٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ أُولَئِكَ يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى الْجَنَّةِ وَالْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِ).[1]

فەلسەفەی حەرامبوون ئەوەیە ئەو کەسەی باوەڕی نەبێت هیچ پابەندیەکیشی نیە، هەرکەسیش هیچ پابەندیەکی نەبێت سپاردە پارێز نابێت، هەر کەسیش سپاردەپارێز نەبێت شیاو نیە بۆ هیچ بەپرسیارێتیەكو شایستەی ئەوە نیە هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ ببەسترێت، بەپێچەوانەی بڕوادارەکان بەپەیامە ئاسمانیەکان وەك ئافرەتانی مەسیحیو جولەکە، بەڵگەی ڕەوایەتی ئەمەش ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە:(الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ )[2].

بەپێچەوانەی ئەوەوە دروست نیە ئافرەتی موسڵمان هاوسەرگیری بکات لەگەڵ پیاوی مەسیحی پێش موسڵمان بوونی، یان جولەکە پێش موسڵمان بوونی، هەندێك وا لێکی دەدەنەوە کەئەم جیاوازیکردنە دەمارگیری ئاینیە، حوکمو پەسندکردنێکە بەبێ بوونی هۆکاری پەسەند کردنەکە.

وەڵامی ئەم بانگەشەیە بەوەیەهۆکاری پەسەندکردن هەیە ئەویش بریتیە لەوەی پیاوو ئافرەتی موسڵمان ئیمانەکەیان قبوڵ نیە ئەگەر بڕوایان بەهەموو پێغەمبەرانو کتێبە ئاسمانیەکانو پەیامەکانی پێشتر نەبێت، هەربۆیە تەنها بڕوا هێنان بەپێغەمبەرمان محەمەد (ﷺ) و بەقورئان بەس نیە، ئەمەش بەراشکاوی لەدەقی قورئانی پیرۆزدا هاتووە: (لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ )[3] لەسەر ئەم بنچینەیە هەموو ئەوەی مەسیحیەکانو جولەکەکان لەبیروباوەڕە ئاینیە دروستەکان بڕوای پێیەتی موسڵمانیش بڕوای پێی هەیە،

---

(١) سورة البقرة /٢٢١.

(٢) سورة المائدة /٥.

(٣) سورة البقرة /٢٨٥.

بەپێچــەوانەوە مەســیحیو جولەكــە بــڕوای نەبــە قورئــان هەیــە نەبەپەیامەكــەی محەمەد(ﷺ) وەك ئەوەی موسڵمان بڕوای پێی هەیە، ئەگەر ئەو جیاوازیە نەمایە ئــەوا جیاوازی نەبوو لــەنێوان هاوســەرگیری پیــاوی موســڵمان لەگــەڵ ئــافرەتی مەســیحیو ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ پیاوی مەسیحی، ئاشكرایە كەهاوبەش بڕیاردانو بێبــاوەڕی ئەگەری نــەمانیان هەیــە بــەهۆی هیدایــەتی ئیمانــەوەو ئــەوانیش دوو ڕێگــری كــاتین، بەڵگەش لەسەر حەرامبوونی هاوسەرگیری ئافرەتی موسڵمان لەگەڵ ناموســڵمان ئــەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَـامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وأتوهم ما أنفقـوا ولاجنـاح علـيكم ان تنكحـوهن اذا آتيتمـوهن أجـورهن ولا تمسكوا بعصم الكوافر).[1]

**پێــڕی پێنجــەم:** ئــەو جیابونــەوەی بــەهۆی نــەفرینلێكردن (الملاعنــة) دروســت دەبێت، ڕێگەنادرێت بەگەڕاندنەوەی ژنو مێرد بــۆ ئــەو حاڵەتــەی پــێش نــەفرین لێــك كردنەكە تێیدا بوون دوای ئەوە نەبێت كــەخۆی بــەدرۆ بخاتــەوەو لەبــەردەم دادوەردا دان بەوەدا بنێــت كەئــەو تۆمەتــەی داویەتیــە پــاڵ ژنەكــەی ڕاســت نــەبووە، قورئــانی پیرۆزیش حوكمی نەفرین لێككردنی ڕوونكردۆتەوە: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُـمْ وَلَـمْ يَكُـنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنْفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ * وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ * وَيَدْرَأُ عَنْهَـا الْعَـذَابَ أَنْ تَشْـهَدَ أَرْبَـعَ شَـهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ * وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ).[2]
پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) دەفــەرمووێت: (المتلاعنــان لا يجتمعــان)، واتــە: دوو نــەفرین لێككار بەیەكەوە كۆنابنەوە.

---

[1] سورة الممتحنة:١٠.

[2] سورة النور: ٩،٨،٧،٦.

**پێـــری شەشـــەم:** حـــەرامبووەکان بـــەهۆی تەڵاقدانـــەوە لەتـــەڵاقێکی لێکترازانـــی لێکترێزەنەری گەورە (البائن بینونـة کـبری)دا، هەرکـەس ژنەکـەی بـۆ جـاری سـێیەم تەڵاقدا حەڵاڵ نابێتەوە بۆیو ناگەڕێتەوە بۆ لای بەگرێبەندێکی تازە پـاش شـوکردنی نـەبێت بـەپیاوێکی دیکـە بەشـێوەی هاوسـەرگیری بـەردەوام نـەك کـاتی بەویسـتی ئازادانەی خۆیو پاشان سەرجێی لەگەڵ ئەنجام بدات، دواتر بەمردنی مێـردە تازەکـە یان بەتەڵاقدان جیاببنەوە، پاش کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەی بۆ ئـەو مێـردەی پێشووی هەیە کەسێ جار تـەڵاقی دابـوو بەگرێبەنـدێکی تـازە هاوسـەرگیری لەگەڵـدا دەست پێبکاتەوە، چونکە هەریەك لەژنو مێردەکە بەئەزموونێکدا تێپـەڕینو ئـەوەیان کەهەڵەی کردووە هەڵەکەی خۆی بۆ دەرکەوتووەو دووبارە ناگەڕێنـەوە بـۆ نـاکۆکیو دەمەقاڵێو بەویستی خوای گـەورە درێـژەی ئـەم بابەتـە لـەکاتی باسـکردنی تەڵاقـدا دەخەینە روو.

# دەروازەی سێیەم:
# پاساوەکانی چەند ژنی

پێشتر باسمانکرد مەبەست لەهاوسەرگیری تێرکردنی ئارەزووە سێکسیەکان نیـە، لەڕووانگەی ئەم واقعە شەرعیەوە دەبێت مەبەستی فەلسەفەی فرەژنی ئـەم خالآنـە بێت:

١-لەوانەیـە ژنەکـە تووشـی شـتێك ببێـت کـە ڕێگـری بکـات لـەوەی بەئەرکـە شەرعیەکان هەستێت وەك نەخۆشیو پیریو هاوشێوەکانی، مێردەکەشی ساغ بێتو بەرگەی ئەو بێبەشبوونە لەپەیوەندی هاوسەرێتی نـەکات، لـەم جـۆرە کاتـەدا ئەگـەر ڕێگەی نەدرێت ژنێکی دیکە بهێنێتو پەیوەندی بەهاوسەرەکەی دیکەیـەوە بمێنێـت، ئەوا ناچار دەبێت ژنە تووشبووەکەی تەڵاق بدات تـا دەروازەی لەبەردەمـدا والا بێـت بۆ هێنانی هاوسەری دووەمو، بەمەش ژنەکەی یەکەمی تووشی نەهامەتیەکی دیکەش دەبێـتو ژیـانی بەتـەواوەتی تێکدەدات، لەبـەر ئـەوە حیکمـەتی خـوایی دەیـەوێت هاوسەرەکەی یەکەمی پارێزراو بێتو مۆڵەتی بدرێت ژنێکی دیکە بهێنێـت بەمـەرجێك هاوسەرگیریە نوێیەکە کاریگەری نەبێت لەسەر ڕێزو ئارامی هاوسەری یەکەمی.

٢-لەوانەیـە ژنەکـە تووشـی نـەزۆکی ببێـت، مـاڵو منـاڵیش ڕازێنـەرەوەی ژیـانی دونیان، هەروەك خوای گەورە دەفـەرمووێت: ( الْمَـالُ وَالْبَنُـونَ زِينَـةُ الْحَيَـاةِ الـدُّنْيَا )[١]، لـەبری لەیـەك جیابوونـەوەو تـەڵاق کـەبێزراوترین حەڵاڵـە لای خـوای گـەورە، ڕێگـە دەدرێت هاوسـەرگیری لەگـەڵ ئـافرەتێکی دیکـەدا بکـات کـەتوانای منـاڵبوونی هەیـە ئەگەر نەسەلمابوو کەپیاوەکەش بەهەمان شێوە تووشی نەزۆکی بووە.

---

[١] سورة الكهف: الاية ٤٦.

٣—لەوانەیە سروشتی کاری پیاوەکە یاخود پێگە کۆمەڵایەتیەکەی ئەوە بخوازێت زیاتر لەژنێکی هەبێت، هەروەك ئەم راستیە لەژیانی عەشایەری‌و ئەو کۆمەڵگایانەدا دەبینین کەگرنگی بەسامانی ئاژەڵی‌و کشتوکاڵی دەدەن.

٤—لەوانەیە پیاوەکە باری سێکسی نائاسایی بێت‌و تەنها یەك ژن بەشی نەکات بەتایبەت کەئافرەت خوێنی مانگانەی هەیە، لەکاتی ئەو خوێنە مانگانەیەدا بەمەبەستی پاراستنی تەندروستی ژن‌و مێردەکە چوونە لای حەرامە، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذىً فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ)[1]، لەبری ئەوەی مێردەکە تووشی هەڵەو لادانی سێکسی ببێت کەزیانی بۆ خۆی‌وماڵبات‌و کۆمەڵگاکەشی هەیە، خوای گەورە رێگەی داوە ژنێکی دیکە بهێنێت تا لەکەوتنە هەڵە پارێزراوبێت.

٥—لەوانەیە ئارەزووی ئافرەت پاش منداڵبوون بۆ پەیوەندی ژن‌و مێردی کەمتر ببێت‌و مێردەکەش چالاکی‌و ئارەزووی سێکسی وەك خۆی مابێتەوە، لەبەر هەمان مەبەستی خاڵی رابردوو بۆی هەیە ژنێکی دیکە بهێنێت.

٦— لەوانەیە لەبەرانبەر ژمارەی ئافرەتاندا ژمارەی پیاو کەمتر بێت بەهۆی رەوشی جەنگ یاخود سروشتی ژینگەکە یان شتێکی تری لەو جۆرە، دادپەروەری ئەوە دەخوازێت رێگە بەپیاو بدرێت لەیەك ژن زیاتر بهێنێت بەمەبەستی رزگارکردنی ئەو بێوەژنانەی مێردەکانیان لەدەست داوە بەهۆی جەنگ‌و کارەساتەوە تابێبەش نەبن لەچێژ وەرگرتن لەژیانی هاوسەرێتی‌و پەیوەندی ژن‌و مێردایەتی بەرێگەیەکی رەوا لەبری ئەوەی تووشی لادانی سێکسی ناڕوا ببن. پاش جەنگی جیهانی دووەم وتارێکم دەربارەی نەهامەتیەکانی ئافرەتانی ئەو وڵاتانەی بەشداری ئەو جەنگەیان

---

[1] سورة البقرة: الاية٢٢٢.

کردووەو بووە هۆی گیانلەدەستدانی ملیۆنەها پیاوو ئافرەتەکانیان بێ دەرامەتو هاوبەشی ژیان مانەوە لەیەکێك لەگۆڤارەکاندا خوێندەوە کە ئێستا ناوی گۆڤارەکەم لەیاد نەماوە، لەوتارەکەدا هاتبوو کە ئافرەتە ئەڵمانیو ئینگلیزەکان لەڕێگەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە داوا دەکەن هاوشێوەی ئەوەی لەشەریعەتی ئیسلامیدا ڕێگەی پێدراوە لای ئەوانیش ڕێگە بەفرەژنی بدرێت.

٧- لەوانەیە پیاو لەبەر هۆکارێك ژنەکەی تەڵاق بداتو ژنێکی دیکە بهێنێت پاشان وای دەبینێت بەرژەوەندی لەوەدایە ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ ژنەکەی پێشتریدا دەست پێبکاتەوەو بیگەڕێنێتەوە بەبێ گرێبەند ئەگەر تەڵاقەکەی گەڕانەوەیی (رجعی)بوو ماوەی چاوەڕوانی (عدە)ی تەواو نەبووبوو، یاخود بەگرێبەندێکی تازە ئەگەر تەڵاقەکەی جیاکەرەوە بوو یاخود ماوەی چاوەڕوانیەکەی تەواو بووبوو، ئەگەر ڕێگە بەفرەژنی نەدرێت ئەوا ناچار دەبێت ژنە نوێیەکەی تەڵاق بدات تا ژنە تەڵاقدراوەکەی پێشتری بهێنێتەوە.

٨- خوای گەورە ڕێژەی هەرە زۆری چەند ژنی بەچوار ژن داناوە تا ڕێگە بگرێت لەزیادە ڕەوی کەلەرووی شەرعو عەقڵیشەوە بێزراوە. چونکە ئەو ژمارەیەش زۆرترین ژمارەیە کەبتوانرێت دادپەروەری لەنێوان ژنەکاندا لەمافو پابەندیەکان بەدی بهێنرێت دوور لەستەمی مادی یاخود مەعنەوی مافەکانیان.

٩-قورئانی پیرۆز فەرمان دەکات تەنها یەك هاوسەر بهێنرێت لەهەموو حاڵەتەکاندا ئەگەر هاتوو چەند ژنی بووە هۆی ستەمکردن لەمافی ژنەکەی پێشتر یاخود ئەوەی دواتر یان هەردووکیان یا منداڵەکانیان هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: (فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً )[1].

---

[1] سورة النساء: الاية ٣.

پێکهێنەری هەر شتێك بریتیە لەوەی کەلەسەری وەستاوە، ئەگەر بەشێك بوو لێی ئەوا بەپایە ناودەبرێت، ئەگەرنا بە مەرج ناو دەبرێت.

هاوسەرگیری تەنها دوو پایەی هەیە، ئەوانیش داواکاری‌و رازیبوون (ایجاب و قبول).

مەرجەکانیشی لەرووی گرنگی‌و جێکەوتەوە چوار جۆرە:

مەرجەکانی بەستن، مەرجی دروستی، مەرجی جێبەجێکران، مەرجی پابەندی.

ئەمجۆرانە هەموویان شەرعی‌و یاسایین‌و مەرجەکانی خستنەسەر(جعلیە)یان بۆ زیاد دەکەین کەپەیوەندارن بەهاوسەرگیریەوەو شوێنەوارەکانی دیاری دەکات‌و بە خستنەسەر(جعلیة) ناونراوە چونکە لە خستنەسەر(جعل)ی ئیرادەی یەکێك لەهاوسەرانە، بەڵام خوای یاسادانەری دانی پێدا دەنێت‌و ئەگەر رەوا بوو شوێنەواری لێدەکەوێتەوە.

لەسۆنگەی ئەم پێشەکیەوە توێژینەوەی پایەو مەرجەکانی هاوسەرگیری بۆ سێ دەروازە دابەش دەکەین: یەکەمیان تەرخان دەکەین بۆ پایەو مەرجەکانی بەستن، دووەمیش بۆ مەرجەکانی دروستی‌و جێبەجێکران، سێیەمیش بۆ مەرجەکانی پێویستبوون (لزوم)و مەرجە سەریەکانە.

# دەروازەی یەکەم:
# پایە و مەرجەکانی جێبەجێکران
## ( الارکان وشروط الانعقاد )

مەبەست لەپایە لێرەدا بریتیە لەمانا تایبەتەکەی کەبریتیە لەوەی شتەکەی لەسەر وەستاوەو بەشێکە لێی.

بەڵام پایە بەمانا گشتیەکەی بریتیە لەوەی بەرەهایی بوونی شتەکەی لەسەر دەوەستێت ئیدی بەشێك بێت لێی یان بەشێك نەبێت، ئەویش بەم واتایە بەهەمان شێوە مەرجەکانیش دەگرێتەوەو ئەوەی گرنگە لامان مانا تایبەتەکەیەتی.

### یەکەم: پایەکانی هاوسەرگیری ( ارکان الزواج):

هاوسەرگیری هەڵس و کەوتێکی شەرعی و یاساییە بەدەربڕین و لەدوو بەش پێکدێت، یەکەمیان داواکردن(ایجاب) ئەویش بریتیە لەیەکەم قسە کەلەلایەن هەردوو لایەنی پێکهێنانی هاوسەرگیریەکەوە بکرێت، ئیدی پیاوەکە بێت یان ژنەکە یان یەکێك کەبریکاریان بێت[1].

دووەمیشیان پێی دەوترێت رازیبوون (قبول)، ئەویش بریتیە لەو قسەیەی پاش داواکردن لەلایەنی دووەمەوە دەکرێت، شێوەی هاوسەرگیری تێکەڵەیە لەو دوو بەشە پێکهاتووە، کە دەڵێین هاوسەرگیری تەنها لە داواکردن و رازیبوون پێکدێت ئەمە

---

[1] لەوانەیە دلخوازو رەزامەند راستەوخۆ ژن و مێردەکە بن یاخود یەکێك بریکاریان بێت یان بریکاری یەکێکیان بێت بریکارێتیەکی رێکەوتن وەك وەکیل، یاخود جێگرەوەی شەرعی و یاسایی بێت وەك بەخێوکار، یان بریکارێتیەکی دادگایی بێت وەك دادوەر لەهاوسەرگیری ژن و پیاوی شێتدا.

بۆچـوونی زانـا حەنەفیەکانـە [1] کەراسـترینی بۆچـوونەکانە لـەنێو هـەموو زانایانـدا، ئەوەشی شافیعیەکان[2] بـۆی چـوون کەپایـەکانی هاوسـەرگیری پێـنجن: یەکـەمیان: شێوەکەی (داواکردنو رازیبوون)، دووەم: بـەخێوکار(ولی)، سـێیەم: مێـرد، چـوارەم: ژن، پێنجەم: شایەتەکان، ئەوەشی مالکیەکان[3] کەوتوویانە پایـەکانی هاوسـەرگیری سـیانن: بـەخێوکار (ولـی)، بابـەت –محـل– (ژنو مێردەکـە)، شـێوە (داواکـردنو رازیبوون)کـە یەکدەگرێتـەوە لەگـەڵ گوتـەی شـافیعیەکاندا لـە مانـادا، ئەمـەش ئیجتیهـادێکی نادروسـتە چـونکە لەگـەڵ لـۆژیکی دروسـتدا یەکناگرێتـەوە کەبابـەتی هەموویـەتی (الکلیـە)و بەشـێتی (الجزئیـە)ی بابەتـەکان یـان هـەموو و بەشـی بـۆ دەگەڕێتەوە، هاوسەرگیریش ئیدی بەگرێبەست دابنرێت هـەروەك زانایـانی گووتویانـە یان پەیماننامە بێت هەروەك قورئان ناوی بردووە، بریتیە لەشێوەیەك کەلە داواکردنو رازیبـوون پێکـدێت، چـونکە هـەڵسو کـەوتێکی شـەرعی ناوێتەیـەو لـەدوو بـەش پێکهـاتووەو بەهەردووکیانـەوە گوزارشـتێکی هاوواتـای هەیـەو هەریەکەشـیان لـەنێو کۆیەکەدا مانایەکی (دلالة تضـمنیة) هەیـەو بـۆ مـافـو پابەندیـە هاوسـەرگیریەکانیش دەلالەیەکی پابەندی هەیە، بۆیە دەبێـت شـێوەکەی بۆخـۆی پایەیـەکی بێـتو چـۆن دەکرێت بەخێوکار پایەیەکی بێت لەکاتێکدا زۆرینـەی زانایـان دەڵـێن دروسـتە کچـی بـالّغی عـاقڵی پێگەیشـتوو خـۆی شـوو بـەو کەسـە بکـات کەهەڵیدەبـژێرێت بیکاتـە هاوبەشی ژیانی کەهاوشانی بێـتو بـەمارەیی هاوشـێوە بێـت، بەشـێوەیەکی گشـتی ئەگەر بێوەژن(ثیّب) یاخود قەیرە کچ (عاضلا)و هاوسـەرگیریەکە لەبـەردەم دادوەردا ئەنجامـدرا، شـەریعەتی ئیسـلام وشـەیەکی تایبـەتی یـان دەسـتەواژەیەکی دیـاری

---

[1] له (بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع)ی (علامة الفقيه الحنفي علاء الدين ابي بكر بن مسعود المعروف بالكاساني ١٣٢٧/٣) دا هاتووە: (پایەی مارەبڕین داواکردنو رازیبوونە).

[2] الانوار لاعمال الابرار للفقيه الشافعي العلامة يوسف الاربيلي ٦٢/٢–٧٧.

[3] الشرح الصغير للفقيه المالكي الدردير مع حاشية الصاوي ٣٤٨/١.

نەکردووە تا بۆ داواکردنو رازیبوون بەکاربهێنرێت بەتایبەت بۆ ئەوانەی کەزمانی عەرەبی باش شارەزا نین، دیاریکردنی هەر دەربڕینێك بۆ داواکردنو رازیبوون بە وشەی تایبەتکراو یەکناگرێتەوە لەگەڵ فەرمایشتی خوای گەورە: (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ)[1] هەروەها دەفەرمووێت: (يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ)[2] لەئایەتێکی دیکەدا فەرموویەتی: (لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا وُسْعَهَا)[3] و ئەو ئایەتانەی دیکە کەراستەوخۆ ئەوە دەخاتە روو ئازادی رادەربڕینی دەدرێتێ تا لەبەر رۆشنایی تواناو ئەوەی هەیەتی گوزارشت لەویستی ناخی بکاتو ئەو گوزارشتکردنە رەزامەندی دەربخات لەسەر پێکهێنانی هاوسەرگیریەکەو هەریەك لەداخوازکارو بەرانبەرکەی لەمەبەستی یەك تێبگەن، پاڵپشت بەو گشتگیریەی لەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هەیە: (انما الاعمال بالنيات)[4] واتە: کاروکردەوەکان بەپێی نیەتەکانە، هەندێك لەزانایان[5] بۆ دیاریکردنی دەستەواژە بەکارهاتووەکان لای عەرەب رۆشتوون بەبێ ئەوەی رەچاوی ئەوە بکەن کەشەریعەتی ئیسلام تەنها بۆ یەك نەتەوە نەهاتووە، ئاشکرایە کەشەریعەتی ئیسلام فەرمانی نەکردووە بەپابەندبوون بەدەربڕینە عەرەبیەکانەوە تەنها لەنوێژدا نەبێت، لەبەر رۆشنایی ئەمەشدا هەر دەربڕینێك مەبەست لێی پێکهێنانی هاوسەرگیری بگەیەنێت لەشەریعەتی ئیسلامیدا کاری پێدەکرێت، ئیدی بەهەر زمانێكو هەر جۆرە دەبڕینێك بێت، پێوەری دیاریکردنی

---

[1] سورة: الحجر ٧٨.

[2] سورة: البقرة /١٨٥.

[3] سورة: البقرة /٢٨٦.

[4] رواه البخاري:١.

[5] لە: (البدائع ) سەرچاوەی پێشوو٣/ ١٣٢٧ دا هاتووە: (شافیعی وتوویەتی هاوسەرگیری دانامەزرێت بەدەربڕینی (الانكاح والتزويج) نەبێت) ئەم وتەیەی شافعی هەمان بۆچوونە کەشیعەی ئیمامی بۆی چوون (الروضة البهية واللمعة الدمشقية٢/٦٩ـ وبولتر).

دەربڕینو دەستەواژەکانی داواکردنو ڕازیبوون لەهاوسەرگیریدا بریتیە لەنەریتی باو لەهەر وڵاتێکدا.

شایانی باسە مەرجەکانی داواکردنو ڕازیبوون لەمەرجەکانی گرێبەندن (انعقاد) کەئەویش بریتیە لەوەی دانیشتنی داواکردنو ڕازیبوونەکە یەك بێتوهەردوولا لەوە تێبگەن کەبەرانبەرەکەیان دەیڵێت.

## دووەم: مەرجەکانی گرێبەند (شروط الانعقاد):

مەرجەکانی گرێبەند لەرووی گرنگیەوە لەپاش پایەکان دێت، بەجۆرێك ئەگەر یەکێکیان نەهاتەدی ئەوا هاوسەرگیریەکە بەتاڵ دەبێت، لەگرنگترین مەرجەکانی گرێبەندی هاوسەرگیری کەلەشەریعەتی ئیسلامدا لەهاوسەرگیریدا کاری پێبکرێت ئەمانەیە:

١–شیاوێتی ڕاپەڕاندن (اهلیة الاداء)[1]: ئەگەر داواکار یان ڕەزامەند دەربڕ لەهاوسەرگیریدا شیاوێتی ناتەواو (عدیم الاهلیة)بوو، بەوەی منداڵێکی ناهەراش (صبي غير ممين) یاخود شێت یان لەحوکمی ئەواندا بوو، ئەو کاتە هاوسەرگیریەکە بەتاڵ

---

[1] شیاوێتی مرۆڤ بەپێی ئەو قۆناغانەی کەلەژیانیدا پێیدا تێدەپەڕێت دابەش دەبێت بۆ چوار بەش:

١ـ شیاوێتی هەمیشەیی ناتەواو (اهلية الوجوب الناقصة): بریتیە لەدەسەڵاتی (صلاحیە) بەدەستهێنانی هەندێك لەمافەکان وەك شیاوێتی کۆرپەلە پێش لەدایکبوون کەمافی میراتیو ڕاسپاردنو بەخشینی بۆ هەیەو ئەم مافانەی دەبێت ئەگەر بەزیندووی لەدایکبوو.

٢ـ شیاوێتی هەمیشەیی تەواو (اهلية الوجوب الكاملة): بریتیە لەدەسەڵاتی (صلاحیە) هەندێك لەمافەکانو هەندێك لەپابەندیەکان وەك شیاوێتی مرۆڤ پاش لەدایکبوون.

٣ـ شیاوێتی ڕاپەڕاندنی ناتەواو (اهلية الاداء الناقصة): بریتیە لەدەسەڵاتی (صلاحیە) ئەنجامدانی هەندێك لەمافەکانی بۆ مرۆڤ دەچەسپێت پاش هەراشبوون (التمیین)و پێش باڵغبوون.

٤ـ شیاوێتی ڕاپەڕاندنی تەواو (اهلية الاداء الكاملة): لای کۆمەڵی زانایان پاش باڵغبوون بۆ مرۆڤ دەسەلمێتو لای هەندێك لەزانایانیش پاش تەواوکردنی تەمەنی هەژدەساڵیو، یاسادانەری عێراقی ئەمەیانی وەرگرتووە وەك ئەوەی لەیاسای مەدەنی بەرکار مادە (١٠٦)دا هەیە.

دەبێت‌و بەجێی ئەم مەرجەش بەوانەوەیە کەداواکردن‌و رازیبوونەکە دەکەن، ئیدی پیاو و ژنەکە بن یاخود بریکارەکانیان، ئەو شیاوێتیەی داواکراوە لەو کەسەدایە کەبەهاوسەرگیریەکە هەڵدەستێت، ئەگینا هاوسەرگیری کوڕو کچی بچوك‌و پیاوو ژنی شێت دروستە کەلەلایەن سەرپەرشت یاخود دادوەرەوە ئەنجام بدرێت، ئەگەر یەکێك لەدوو لایەکە (داواکار یان بەرانبەرەکەی) شیاوێتیەکەی ناتەواو بوو ئەوا هاوسەرگیریەکەیان لەسەر رەزامەندی بەخێوکار (ولی)ە هەروەك دواتر لەشوێنی خۆیدا باسی دەکەین.

٢-داواکردن‌و رازیبوون لەیەك دانیشتندا بێت بەراستی یان بەحوکمی، یەك دانیشتنیش بەراستی بریتیە لەدانیشتنی داواکارو بەرانبەرەکەی لەیەك جێگاو داواکردن‌و رازیبوونەکە لەوێدا راستەوخۆ بەبێ بەکارهێنانی هیچ هۆکارێك رووبدات، یەك دانیشتنی حوکمیش ئەوەیە داواکار لەجێگایەك بێت‌و بەرانبەرەکەی لەجێگایەکی تر بێت‌و، داخوازیی داواکارو رەزامەندی داخوازیکراو لەرێگەی هۆکارێکەوە بەیەك بگەیەنرێت وەك نامە یاخود تەلەفۆن یان مۆبایل یا ئیمەیڵ یاخود هاوشێوەکانیان.

لەهەردوو حاڵەتەکەدا دانیشتنەکە وەك یەك دادەنرێت، ئەگەر هاتوو پاش داواکردن‌و رازیبوونەکە یەکێکیان شتێکی نەوت کەبەتاڵبوونەوەی داواکردنەکە یاخود نارەزایەتی لەهاوسەرگیریەکە بگەیەنێت، وەك ئەوەی پێش رازیبوون شوێنەکە نەگۆڕێت یاخود قسەیەك نەکات دوور بێت لەبابەتەکەو ئەوەی لێبخوێنرێتەوە کەویستی نیە لەسەر ئەنجامدانی هاوسەرگیریەکە.

جیاوازی نێوان دوو دانیشتنەکە ئەوەیە لەدانیشتنی راستەقینەدا تەنها ئامادەبوونی دوو شایەت بەسە کەگوێیان لێ بێت‌و لەداواکردن‌و رازیبوون‌و مەبەستەکەی تێبگەن، بەپێچەوانەی دانیشتنی حوکمیەوە کە مەرجە دوو شایەت لەلایەن داواکارەکەوە هەبێت کاتی وتنی داواکردنەکەی، دوو شایەتیش لەلایەنی بەرانبەرەوە هەبێت کاتی بیستنی یان بینینی داواکردنەکە بەو جۆرەی

کەبەبەرانبەرەکە دەگات، بەهەمان شێوە وتنی رازیبوونەکەی ببیستێو تێی بگەن بەبێ ئەوەی هیچ وچانێك بکەوێتە نێوان داواکردنو وبیستنی رازیبوونەکەوە، بەشێوەیەك کە ئەوە بگەیەنێت نارازییە بەو هاوسەرگیرییە.

٣-وەك یەکبوونی داواکردنو رازیبوون (مطابقة الایجاب والقبول): بەوەی لەکارە سەرەکیەکاندا رێکبکەونو ناکۆکیان ئەگەر تەنها لەدەربڕیندا بوو یاخود لەبەرژەوەندی مێردەکە بوو کاریگەری نەبێت، بۆ نمونە ئەگەر وتی تۆم کردە هاوسەری خۆم لەسەر سێ ملیۆن دیناری عێراقی، ئەویش وتی ئەوا قبوڵم کرد لەسەر سێ هەزار دۆلاری ئەمریکی، لەکاتی داواکردنو رازیبوونەکەدا ئەو بڕە دراوە عێراقیە هێزی کڕینی یەکسان بوو بەهەمان بڕە پارەی ئەمریکی وەك ئەوەی لەئێستادا هەیە ئەوا هاوسەرگیرییەکە دروستە، چونکە ناکۆکیەکە تەنها لەدەربڕیندایەو شێوەییە، بەو مەرجەی کەدەبێت ئەو بڕە پارەیە پێشەکی وەربگرێت تا گۆڕانی بەهای دراوی بەسەردا نەیەتو کێشە دروست بکات.

بەهەمان شێوە جیاوازی کاریگەری نابێت ئەگەر لەبەرژەوەندی ژنەکە بوو، وەك ئەوەی بڵێت شووم پێکردیت لەسەر بیست میسقاڵ زێڕ، پیاوەکەش وتی رازیبووم بەهاوسەرگیرییەکە لەسەر بیستو پێنج میسقاڵ زێڕ.

بەڵام جیاوازی گەورە لەداواکردنو رازیبووندا دەبێتە هۆی بەتاڵکردنەوەی هاوسەرگیری، وەك ئەوەی بەخێوکار (ولی)ەیەکەی بڵێت (خالیدە)ەی کچە گەورەمت لێ مارەکردیت، خوازبێنیکارەکەش بڵێت رازیبووم بەهاوسەرگیری لەگەڵ (ناهیدە)ی کچە بچوکت، لێرەدا هاوسەرگیرییەکە بەتاڵ دەبێت، یاخود خوازبێنیکار بڵێت تۆم کردە هاوسەری خۆم بەمارەییەك کەبڕەکەی سی میسقاڵ زێڕ بێت، ژنەکەش بڵێت رازیبووم شووت پی بکەم لەسەر چل میسقاڵ زێڕ، ئەم هاوسەرگیرییە بەتاڵ دەبێت، هەرچەندە کەمارەیی نەپایەیە نە مەرج لەهاوسەرگیریدا، هەروەك دواتر لەشوێنی

خۆیدا بەویستی خوای گەورە لێی دەدوێین، بەڵام لەشوێنەوارەکانی هاوسەرگیریەو جیاوازییەکە تێیدا کاریگەری هەیە.

٤-بیستن‌و تێگەیشتن هەردوولا (داواکارو رازیبوو) لەو قسەیەی کەبەرانبەرەکەی دەیکات‌و جیاوازی زمان کاریگەری نابێت ئەگەر هەردوولایان تێدەگەیشتن کەمەبەستی قسەی بەرانبەرەکەی پێکهێنانی هاوسەرگیریە.

لەحاڵەتێکدا یەکێکیان توانای بیستنی نەبوو، یاخود هەردووکیان توانای بیستنیان نەبوو ئەوا تەنها ئاماژە بەسە بەڵام بەشێوەیەك بێت لێك تێبگەن.

٥-نەسەلماندنی رێگرێك (مانع) لەرێگرییەکانی هاوسەرگیری بەسەلماندنێکی بنبڕ(ثبوت قطعي) وەك خزمایەتی‌و، ژن‌و ژنخوازی (المصاهرة)و، شیرپێدان بەپێی ئەو درێژەیەی کەلەبەندی سێیەمدا روونمان کردەوە، ئەگەر یەکێك لەو رێگریانە پێش هاوسەرگیریەکە هەبوو ئەوا ئەنجامدانی ئەو هاوسەرگیریە بەتاڵ دەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو رێگریە پاش هاوسەرگیریەکەو تێپەڕبوونی ماوەیەك بەسەر ژیانی هاوسەریاندا دەرکەوت‌و سەلمێنرا، ئەوا هاوسەرگیریەکە لەبەرواری زانینی هۆکاری بەتاڵبوونەکەوە بەتاڵ دەبێتەوە نەك لەو ماوەیەوە کە تێپەڕیوە، بۆ نمونە ئەگەر پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك‌و لەدایکبوونی منداڵ خوشك‌و برایەتی لەشیرەوە لەنێوان ژن‌و مێردێکدا سەلمێنرا، ئەوا فەرمان دەکرێت بەبەتاڵکردنەوەی ئەو هاوسەرگیریە لەبەرواری سەلماندنی ئەو خوشك‌و برایەتیەوە نەك لەبەرواری هاوسەرگیریانەوە، لێرەوە پەیوەندی هاوسەرێتی پێشتریان رەوایەو رەچەڵەکی منداڵەکانیان شەرعیەو، کاریگەری بەتاڵبوونەوەکە تەنها بۆ ئایندەیەو کاریگەری لەسەر رابردوو نیە.

لەوەی کەباسمانکرد دەردەکەوێت مەرجەکانی گرێبەند هەیانە بۆ ژنەکە دەگەڕێتەوەو مەرجە کەبەهەمیشەیی حەرام نەبێت بۆ ئەو پیاوەی کەدەیەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ بکات.

هەشیانە بۆ داواخوازیکارو داخـوازیکراو (الموجـب والقابـل) دەگەڕێتـەوەو مەرجـە هەردووکیان شیاوێتی راپەڕاندن (اهلیـة الاداء)یـان تێـدا بێـت بـا ناتـەواو (نـاقص)یش بێت.

هەشیانە بۆ شێوەی پێکهێنانەکەی لە داواکردن‌و رازیبوون دەگەڕێتـەوەو مەرجـە کـەوەك یـەك بـن‌و لەیـەك دانیشـتندا بێـت‌و هـەردوولایان خوازبێنیکـارو داخـوازیکراو لەیەکدی تێبگەن‌و مەبەستی قسەکان بزانن کەپێکهێنانی پەیماننامـەی هاوسـەرگیریە بەشێوەی هەمیشەیی.

## دەروازەی دووەم:

# مەرجەکانی دروستی و جێبەجێکران

## (شروط الصحة والنفاذ)

مەرجی دروستی هەر هەڵسوکەوتێکی شەرعی ئیدی هاوسەرگیری بێت یان هەڵسوکەوتێکی دیکە -وەك فرۆشتن- ئەوەیە کەئەو دروستێتیەی لەسەر راوەستابێت، بەجۆرێك ئەگەر ئەو مەرجە نەهاتەدی ئەوا هەڵسوکەوتەکە پوچەڵ (فاسد) دەبێت.

مەرجی جێبەجێکرانی هەر هەڵسو کەوتێکی شەرعی، ئیدی هاوسەرگیری بێت یان هەڵسو کەوتێکی تر، ئەوەیە کەجێبەجێکران لەسەری وەستابێت، واتای جێبەجێکران بریتیە لە دروستبوونی شوێنەواری شەرعیو یاسایی لەماف و پابەندییەکان لەسەر هەڵسوکەوتەکە دەستبەجێ لەکاتی ئەنجامدانیەوە، ئەگەر مەرجێك لەمەرجەکانی جێبەجێکران نەهاتە دی ئەوا هەڵسو کەوتەکە بەدروست دادەنرێت، بەڵام شوێنەواری (ماف و پابەندییەکان)ی لەسەر دروست نابێت، بەڵکو دروستبوونی ئەو شوێنەوارانە رادەوەستێت لەسەر مۆڵەتدانی ئەو کەسەی مافی مۆڵەت پێدانی هەیە.

### یەکەم: گرنگترین مەرجەکانی دروستی هاوسەرگیری (اهم شروط صحة الزواج):

گرنگترین ئەو مەرجانەی لەفیقهی ئیسلامیو لای زۆرینەی زانایانی موسڵمان (رەحمەتی خوایان لێبێت) پەسند بێت بۆ دروستی هاوسەرگیری ئەمانەیە:

١– ئامادەبوونی دوو شـایەتی بـالّغی عـاقلّی موسـلّمانی دادپـەروەر ئەگـەر هـەبوو لەهاوسەرگیری پیاو و ژنی موسلّماندا، ئەگـەر خراپـەکاری (فسـق) بڵاوبوبـوەوە ئـەوا لەبەر پێویستی دروستە خراپـەکار (فاسـق)یش بـن، (الضـرورات تُجيـز المحظـورات)، لەبـەر پێویسـتی ڕێگـە بـە قەدەغـەکراوەکان دەدرێـت، دروسـتە هاوسـەرگیری بەئامادەبوونی پیاوێكو دوو ئافرەت وەك شایەت ئەگەر پیاوی تری[١] لێ نـەبوو لەبـەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا: (وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى)[٢]، سـەرەڕای ئـەوە پێویسـتە شـێوازی دەربڕینـی داواکـردنو ڕازیبوونەکـە ببیسـتنو مەبەسـتەکەیان بـزانن کەئـەویش پەیماننامـەی هاوسـەرگیریە لـەنێوان کـوڕو کچـێك کەدەیانناسن، هەموو هاوسەرگیریەك بەبێ ئامادبوونی دوو شایەت کەئـەو مەرجانـەی باسـکران تێیانـدا بێـت ئـەوا بەتاڵـەو هـیچ شـوێنەوارێکی شـەرعی لـەڕووی مـافـو پابەندیەکانی هاوسەرگیریەوە دروست ناکاتو پێکەوەژیانی هاوسەریان حەڵاڵ نابێـت لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): (لا نكاح الا بـولي وشـاهدي عـدل)[٣]، واتـە: مارەکردن بەبێ بەخێوکار و دووشایەتی دادپەروەر نابێت).

هەندێك لەمەزهەبەکان[٤] بۆ ئەوە چوون کەئەم مەرجە مەرج نەبێت بـۆ مەبەسـتی دروستی هاوسەرگیری، بەڵام لەڕاستیدا پاراستنی ناوبانگی ژنو ماڵە باوانی پێویسـت

---

[١] لەکتێبی (النيل وشفاء العليل)ی شيخ ضياء الدين عبد العزيز وشرحه للعلامـة محمـد بـن يوسـف اطفـيش ٨٧/٦: (دوو پیاوی سپاردەپارێز (امين) دروستە یاخود پیاوێكو دوو ئافرەت کەسپاردە پارێز بن).

[٢] سورة البقرة /٢٨٢.

[٣] الإلمام بأحاديث الأحكام ٦٢٨/٢ ، البدر المنير ٤٧٥/٧ ، تحفة المحتاج ٣٦٤/٢ ، السـنن الكـبرى للبيهقـي ١٢٥/٧ ، نيل الأوطار ٢٥٨/٦.

[٤] هـەروەك لـە فيقـی ئیماميـدا هەيـە (الروضـة البهيـة واللمعـة الدمشـقية ٧٠/٢): (دوو شـايەت مـەرج نيـە لەهاوسەرگیرێتی هەمیشەیداو بەخێوکار (ولی) لەمارەبڕینی ئـافرەتی پێگەیشـتوو (الرشـيدة) ئەگەرچـی ئامادەبوونی باشترە.

بەئامادەبوونی دوو شایەت دەكات، سەرەڕای ئەوە ئەم مەرجە رووكاریە لەئیسلامدا پارێزگاری لەمافەكانی هاوسەرێتی دەكات.

شایانی باسە كەهاوسەرگیری پوچەڵ(فاسد) پێش چوونەلا وەك بەتاڵ (باطل) وایە كەهیچ شوێنەوارێك جێ نایەڵێت، بەڵام پاش چوونەلا ئەوا شوێنەواری شەرعی دەبێت هەروەك پێشتر لەبەندی سێیەمدا باسمان كرد.

٢-بەبەڵگەی ناڕوون (دلیل ظني)یش بێت رێگرێك لەرێگریەكانی هاوسەرگیرێتی بوونی نەبێت، وەك هاوسەرگیری لەگەڵ خوشكێكی دیكەی هاوسەرەكەیدا پاش مردنی هاوسەری یەكەمی یاخود پاش تەڵاقدانی تەڵاقێكی لێكترازان یان گەڕانەوەیی پێش كۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەكەی.

هەندێ لەمەزهەبەكان[1] وتوویانە هەركەس هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێكدا بكات كەلەماوەی چاوەڕوانی مێردێكی ترلایدایەو دەزانێت بەوەی لەماوەی چاوەڕوانیو حەرامبووندایە، ئەوا بەهەمیشەیی لەسەری حەرام دەبێت وەك سزایەك لەسەر ئەو كارەی ئەنجامی داوە.

٣-دیاری نەكردنی كات: هەموو هاوسەرگیرییەك كاتی بێت وەك هاوسەرگیری موتعە و هاوسەرگیری مارەبەجاش، ئەوا هاوسەرگیریەكی پوچەڵ(فاسد)ە لای زۆرینەی زانایانی شەریعەت، پێغەمبەر (ﷺ) هاوسەرگیرێتی موتعەی بۆ ئەو موجاهیدانە حەڵاڵكرد كەدوور بوون لەژنەكانیان لەبەر پێویستبوون، پاشان كەبینی لەرووی كۆمەڵایەتیەوە خراپەی زۆرە رێگری لێكردو حەرامیكرد، لە (صحیح

---

[1] وەك شیعەی ئیمامی. لە (الروضة واللمعة المرجع السابق ٩/٢)دا هاتووە: (هەركەسێك ژنێك لەكاتی ماوەی چاوەڕوانیدا ئیدی لێكترازان بێت یان گەڕانەوەیی یاخود ماوەی چاوەڕوانی مێرد مردن یاخود ماوەی چاوەڕوانی گومانكردن بهێنێتو بزانێت كە لەماوەی چاوەڕوانیدا بووەو بزانێت ئەوە حەرامە ئەوا گرێبەستەكەی بەتاڵ دەبێتەوەو بۆ هەمیشەیی لێی حەرام دەبێت).

مسلم)[1]دا هاتووه، لەعەلی کوڕی ئەبو تالبەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەڕۆژی خەیبەردا نەهی کردووە لە هاوسەرگیری موتعە لەگەڵ ژنان، لە (صحیح مسلم)دا گێڕانەوەی دیکە هەیە کەهاوشێوەی ئەم گێڕانەوەیە بێت.

دروست نیە بۆ ڕێگە پێدرانی هاوسەرگیرێتی موتعە بەڵگە بەم ئایەتە بهێنرێتەوە: (فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً)[2] چونکە ئەم ئایەتە لەبارەی هاوسەرگیرییەوە هاتووەو، چێژ لێبینینەکەش پاش دروستی هاوسەرگیرێتی دەبێت پاداشتیش لێرەدا مارەییەکەیە، سەرەڕای ئەم بەڵگە نەقلیە چەسپاوە زۆرانە لەسەر نادروستێتی موتعە، چەندین بەڵگەی عەقلیش هەیە کەڕازیبوون بەوکارە ڕەت دەکاتەوە بەهۆی ئەو خراپەو زیانە کۆمەلایەتیانەی بەهۆیەوە دروست دەبێت، ئیدی ئەوە بۆ ژنەکە بێت یان بۆ پیاوەکە یان بۆ کۆمەڵگا، هاوسەرگیری مارەبەجاشیش لای کۆمەڵی زانایان ڕەتکراوەیە، هەروەك لەباسی تەلاقدا باسی دەکەین کەئەویش ئافرەتی تەلاقدراو پاش تەلاقی سێیەم و تەوابوونی ماوەی چاوەڕوانیەکەی لەپیاوێکی نەناسراو مارە دەکەن بەو مەرجەی پاش چوونەلا لەگەڵی تەلاقی بدات، دواتر پاش ئەمە کاتێ ماوەی چاوەڕوانیەکەی تەواو دەبێت بەهاوسەرگیرێتیەکی نوێ دەگەڕێتەوە بۆ لای هاوسەری یەکەمی، ئەم هاوسەرگیریەش پوچەڵ(فاسد)ە چونکە هاوسەرگیریەکی کاتیەو ئەنجامدانی هاوسەرگیریش بەمەرجی پوچەڵ (فاسد) پوچەڵکراو(مفسد) دەبێت کەئەویش ئەو مەرجەیە کەپاش چوونەلا لەگەڵی تەلاقی بدات، سەرەڕای ئەوەی مەرجی ڕازیبوونی تێدا نیە، چونکە ئەو ژنە بەستەزمانە لەبەر ناچاریو پێویستی ڕازی دەبێت بەهاوسەرگیری لەگەڵ ئەو پیاوە نەناسراوەدا، ڕاڤەی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەش : (فَإِنْ طَلَّقَهَا - واتە پاش تەلاقی سێیەم - فَلاَ تَحِلُّ

---

[1] ٢/١٠٢٧.

[2] سورة النساء: ٢٤.

لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ) بەو جۆرە هاوسەرگیریە لێکدانەوەیەکی هەڵەیە هەروەك دواتر لەشوێنی خۆیدا بەویستی خوا ئەوە راڤە دەکەین.

٤-نەبوونی مەرجێکی پوچەڵ (فاسد)، ئەگەر ئەو جۆرە مەرجە بوونی هەبوو ئەوا هاوسەرگیریەکە پوچەڵ (فاسد) دەبێت هەروەك لەهاوسەرگیرێتی ژن بەژن (زواج الشغار)دا، لە (صحیح مسلم[1]باب تحریم نكاح الشغار وبطلانه[2]) لە عومەرەوە دەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهی کردووە لەهاوسەرگیرێتی ژن بەژن (شغار)[3]، ژن بەژن (شغار) بریتیە لەو هاوسەرگیریەی پیاوێك کچەکەی بدات بەپیاوێکی تر کەئەویش کچەکەی بدات بەمو هیچ مارەییەکیان لەنێواندا نەبێت، تێیدا هاتووە: (ابن نمیر ئەمەی زیاد کردووە: ژن بەژن ئەوەیە کەپیاوێك بەپیاوێکی تر بڵێت کچەکەتم لێ مارەبکەو منیش کچەکەمت لێ مارەدەکەم، یاخود خوشکەکەتم لێ مارەبکە منیش خوشکەکەمت لێ مارە دەکەم) مەرجی پوچەڵ (فاسد)یش لەم فەرموودەیەدا لەتێگەیشتنەکەیدایە (ضمني).

٥-ئەو ژنە یان پیاوەکە یان بەخێوکار (ولی) لەئیحرامدا نەبن، لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): (لَا يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ وَلَا يُنْكَحُ وَلَا يَخْطُبُ)[4] واتە: ئەو ئافرەت یان پیاوەی کەلەئیحرامدایە مارە ناکرێن‌و ناخوازرێن.

شایانی باسە کە زانایان لەبارەی ئەم مەرجەوە بۆچوونی جیاوازیان هەیە بەهۆی دژیەکی فەرموودەکان لەبارەیەوە.

٦- شێوەی دەربڕینەکە لەتوانادا بێت ئەنجام بدرێت (كون الصيغة مُنجِزة): واتە مەرجە بۆ دروستی هاوسەرگیری کە شێوەی داواکردن‌و رازیبوونەکە

---

[1] ١٠٣٤/٢.

[2] بەتاڵبون لێرەدا هاو واتای خراپ بوونە لای ئەوانەی کەجیاوازی ناکات لەنێوانیاندا.

[3] واتە لە ماربڕینی ژن بەژن.

[4] صحیح مسلم: ٢٥٢٤.

نەبەسترابێتەوە بەمەرجەوە، وەك ئەوەی بڵێت رازیبووم شوت پێ بکەم بەو مەرجەی ژنی دیکە نەهێنیت، یاخود پیاوەکە بڵێت تۆم خواست ئەگەر هاوسەرەکەی پێشترم رازیبێت.

نابێت شێوەی دەربڕینەکە بۆ داهاتوو بێت وەك ئەوەی ژنەکە بڵێت رازیبووم بەهاوسەرگیری لەگەڵت لەکۆتایی ئەم مانگەوە بۆ نمونە، پێشتر گرنگی جیاوازیکردنمان باسکرد لەنێوان هاوسەرگیری پوچەڵ (الزواج الفاسد) لەگەڵ هاوسەرگیرێتی بەتاڵ (الزواج الباطل) پاش چوونە لا، چوونەلا لەهاوسەرگیرێتی بەتاڵدا بەتاوانی زینا ئەژمار دەکرێت ئەگەر پیاوە ئەنجامدەرەکەو ژنەکەی لەگەڵ ئەنجامدراوە بەبەتاڵێتیەکەیان زانیبێت، بەپێچەوانەی چوونەلا لەهاوسەرگیرێتی پوچەڵ(زواج فاسد)دا کەئەمەیان بەستراوەتەوە بەگومانەوەو ئەم چوونەلایە ئەم پێنج شوێنەوارە شەرعیە بەجێ دەهێڵێت کەپێشتریش باسمانکرد:

١–رەچەڵەکی شەرعی ئەو منداڵە دەسەلمێت کەبەهۆی ئەو چوونەلاوە لەدایك دەبێت.

٢–بەهۆی بوونی گومانەوە تاوانی زینای لەسەر لادەچێت.

٣–مارەیی هاوشێوەی بۆ ژنە لەپەردە کراوەکە دەسەلمێت وەك قەرەبوویەك بۆ ئەو زیانە مەعنەوییەی پێی گەیشتووە.

٤–ژنە لەپەردەکراوەکە لەبەرواری جیابوونەوەیانەوە ماوەی چاوەڕوانی لەسەر پێویست دەبێت.

٥–هاوسەرگیرێتیان دەسەلمێت (ثبوت المصاهرة).

بەڵام لەپێویستی جیاکردنەوەی ژن‌و مێردو حەرامێتی پێکەوەژیانی هاوسەرییاندا هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان هاوسەرگیرێتی پوچەڵ(فاسد)و هاوسەرگیرێتی بەتاڵ.

## دووەم ـ گرنگترین مەرجەکانی جێبەجێکران (اهم شروط النفاذ):

مەرجـەکانی جێبـەجێکران ئـەو مەرجانەیـە کەئەگـەر یـەکێکیان نـەبوو ئـەوا هاوسەرگیریەکە شوێنەوارە شـەرعیەکان (مـافو پابەندیـەکانی هاوسـەرێتی) لەسـەر دروست نابێت هەرچەندە گرێبەستەکە دروستە، مەگەر پـاش مۆڵەتـدان لەلایـەن ئـەو کەسەوە کەمافی مۆڵەتدانی هەبێت.

ئەگـەر مۆڵەتیـدا ئـەوا هاوسـەرگیریەکە شـوێنەوارەکانی دەبێـتو لـەو بـەروارەی کەتێیدا ئەنجامدراوە (واتە بەکاریگەری پێشـخۆیی)، ئەگـەر ئـەو کەسـەی مۆڵەتـدانی بەدەسـتە ئامـادە نـەبوو مۆڵـەت بـدات ئـەوا هاوسـەرگیریەکە وەك ئـەوە دادەنرێـت کەروونەداوە، چونکە وەك بەتاڵ وایە لەوکاتەدا.

### گرنگترین مەرجەکانی جێبەجێکران:

١ـ شیاوێتی راپەڕاندنی تەواو(أهلیة الاداء الكاملـة) بـۆ ژنو مێردەکـە ئەگـەر خـۆی هاوسەرگیریەکەی ئەنجامدا، ئەم شیاوێتیەش ئەوەیە بگاتە قۆناغی باڵغبوون، قۆناغی بـاڵغبوونیش لای هەنـدێك لـەزانایان ئەوەیـە تەمـەنی هـەژدە سـاڵی تـەواو بکـات، یاسادانەری عێراقیش لەمادە (١٠٦)ی یاسای مەدەنی بەرکاردا کاری بەمە کردووە.

ئەگەر خوازبێنیکار یان بەرانبەرەکەی لەهاوسەرگیریدا شیاوێتیەکەی تەواو نـەبوو، وەك ئـەوەی شـێت بێـت یـان منـداڵێکی ناهـەراش(صبـي غـیر ممیـز) یـان کەسـێك کەلـەحوکمی ئەوانـەدا بێـت، ئـەوا هاوسـەرگیریەکە بـەتاڵ دەبێـت، ئەگـەر شـیاوێتی راپەڕاندنیشی تەواو نەبوو بەوەی حەقدەساڵی تەواو کردبووو بەڵام نەچوبووە تەمەنی شـیاوێتی راپەڕانـدنی تـەواوو خـۆی هاوسـەرگیریەکەی کـرد ئیـدی داواکـار بێـت یـان داواکـراو، نێرینـە بێـت یـاخود مێینـە، هاوسـەرگیریەکەی لەسـەر رەزامەنـدی دانـی بـەخێوکار (ولی)ەکـەی رادەوەسـتێت، ئەگـەر رێگـەی پێـدا ئـەوا شـوێنەواری

هاوسەرگیریتی بە کاریگەری پێشخۆیی لێدەکەوێتەوە لەرۆژی ئەنجامدانیەوە، ئەگەر ڕێگەشی پێنەدا ئەوا وا دادەنرێت کەهەر ئەنجام نەدراوە.

شایانی باسە هەڵس و کەوتەکانی ئەو کەسەی شیاویتی تەواو نیە لەیاساو شەرعدا ئەگەر زیانێکی ئاشکرای لێدەکەوتەوە ئەوا بەتاڵە ئیدی بەخێوکار مۆڵەتی بدات یان نەیدات وەك بەخشینەکانی بەکەسانی دیکە، ئەگەر سوودی تەواوو ئاشکرای هەبوو ئەوا دروستەو بەرکارە ئیدی بەخێوکار ڕێگەی پێدابێت یان، وەك قبولکردنی دیاریو ڕاسپاردن (وصیەت)و هاوشێوەکانی، ئەگەر لەنێوان زیانو سووددا بوو ئەوا دروستبوونەکەی لەسەر ڕەزامەندی بەخێوکار دەوەستێت.

ئاشکرایە هاوسەرگیری هەڵس و کەوتێکە دەکەوێتە نێوان سوودو زیانەوەو ئەگەری سوود گەیاندنو زیانگەیاندنی هەیە.

٢- شیاویتی ڕاستەوخۆی هەڵس وکەوتکردن بەبێ مۆڵەتی دەرەکی (اهلية مباشرة لتصرف بدون اذن خارجي): ئەگەر بەخێوکار ئیدی باوك بێت یان باپیر، کچە بالغە عاقڵە تێگەیشتووەکەی بەبێ مۆڵەتی کچەکەو ئاگاداربوونی بەشوودا، هاوسەرگیریەکە لەسەر ڕازیبوونو مۆڵەتدانی ڕادەوەستێت، با ئەو پیاوەشی پێی دراوە کەسێکی پێگەیشتوو بێتو هاوسەرگیریەکەش بەمارەیی هاوشێوە بوو، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەهیکردووە لەبەشوودانی کچ بەبێ ڕەزامەندی ئاشکرای خۆی ئەگەر بێوەژن بوو و ناڕاستەوخۆ ئەگەر شونەکردوو بوو، فەرمووی: (لا تُنكح الأيِّم[1] حتى تُستأمر[2] والبِكر حتى تُستأذن. قالوا يا رسول الله وكيف اذنها؟ قال ان تسكُت.[3] وقالت عائشة ﵂ سألت رسول الله ﷺ عن الجارية ينكحها اهلها، أتُستأمر ام لا؟ فقال لها رسول الله ﷺ:

---

[1] الايم: الثيب واتە بێوەژن.

[2] واتە مۆڵەتو ڕەزامەندی بەڕاشکاویو ویستی ئازادی خۆی لێوەردەگیرێت.

[3] صحيح مسلم:/ ٢/١٠٣٦.

نعم، فقالت عائشة: فقلت له فانها تستحي! فقال رسول الله: فذلك اذنها اذا هي سكتت[1]) واته:

له ئيبن عەباسەوە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: بێوەژن خۆی لەپێشترە لەبەخێوکارەکەی‌و کچیش مۆڵەتی لێوەردەگیرێت‌و بێدەنگبوونیشی واتە رازیبوون، –لەگێڕانەوەی سوفیاندا– بێوەژن خۆی لەپێشتر لەبەخێوکارەکەی‌و کچیش باوکی مۆڵەتی لێوەردەگرێت لەخۆیداو بێدەنگبوونیشی رازیبونیەتی، لەوانەیە فەرموویێتی بێدەنگیەکەی بڕیاردانیەتی[2].

بۆچوونی پەسەند لەفیقهی ئیسلامیدا لەسەر ئەمە چەسپاوە [3].

٣– رازیبوون: هەبوونی مەرجی رازیبوونی لە ژن‌و مێرددا ئەگەر باڵغ‌و عاقڵ بوون، ئەگەر زۆر لەپیاو کرا هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکدا بکات کەرازی نیە بیکاتە هاوسەری، وەك زۆرکردنی باوك لەکوڕەکەی کە کچە مامەکەی یان کچە پورەکەی بخوازێت، یان لەلایەن بەخێوکار یان کەسی دیکەوە زۆر لەکچ بکرێت کەهاوسەرگیری لەگەڵ کوڕێکدا بکات کە ئەم پێی رازی نیە ئەگەر لەبڕیاردانـدا ئازاد بێت، وەك زۆرکردنی باوك لەکچەکەی یان زۆرکردنی برا لەخوشکەکەی کەشوو بەکوڕە مامەکەی یان کوڕە پورەکەی بکات، لەو دوو حاڵەتەدا کەباسکران هاوسەرگیریەکە لەسەر رەزامەندی زۆرلێکراوەکە رادەوستێت پاش نەمانی شوێنەواری زۆرلێکردنەکە پاڵپشت بەو فەرموودانەی کەباسمان کردن.

یاسادانەری عێراقیش بەهەڵە هاوسەرگیری زۆرلێکراوی بەبەتاڵ داناوە، لەبڕگەی یەکەمی ماددەی نۆی یاسای باری کەسیی عێراقی بەرکاردا هاتووە کە: (بۆ هیچ

---

[1] صحيح مسلم: ١٣٧/٢.

[2] (صحيح مسلم) سەرچاوەی پێشوو.

[3] لە:(الشرح الصغير للدردير مع حاشية الصاوي ٣٥٥/١ ): (ئەوە کچێکی باڵغ نەك بچوك بەمۆڵەتی خۆی‌و رەزامەندی خۆی درا بەشوو ئیدی باڵغەکە بێوەژ بێت یان کچ).

کەس لەخزمان یاخود بێگانە نیە زۆر لەکەس بکات نێر یان مێ لەسەر هاوسەرگیری بەبێ رەزامەندی خۆی‌و هاوسەرگیریەکەش بەبەتاڵ دادەنرێت ئەگەر چوونەلا رووی نەدابوو) یاسادانەر کەوتۆتە ئەم هەڵانەوە:

أ– هاوسەرگیری زۆرەملێی بەبەتاڵ داناوە، تێکەڵکردنی بەتاڵ‌و راگیراو (الباطل والموقوف) راستەکە ئەوەیە کەبوترێت: (هاوسەرگیری زۆرلێکراو راوەستاوە لەسەر مۆڵەتدانی پاش نەمانی شوێنەواری زۆرلێکردنەکە).

ب– بەتاڵ بەوەدانراوە کە دواتر دەتوانرێت مۆڵەتدانی بەشوێندا بێت، لەکاتێکدا لەهیچ یاسایەك لەیاساکانی جیهاندا نیە وترابێت گرێبەستی بەتاڵ مۆڵەتدانی بەدوادا دێت، چونکە بەتاڵ نەبوونە (معدوم)و بەتاڵی‌و نەبوون وەك یەکن، ئەگەر بویسترێت گرێبەستەکە تەواو بکرێت دەبێت سەرلەنوێ ئەنجام بدرێتەوە دوور لەهەر هۆیەکی بەتاڵبوون.

ت– چوونەلا بەرەهایی بەمۆڵەتدان دانراوە (ئەگەر چونەلا روونەدابوو)، چەمکی پێچەوانەی ئەم کۆتە ئەوەیە کەچونەلا بەمۆڵەتدان دانراوە با بەزۆریش بێت، ئەوەش هەڵەیە چونکە چوونەلا بەزۆرەملێ نابێتە مۆڵەتدان.

# دەروازەی سێیەم:
# مەرجەكانی پێویستی و دروستبوون
# (شروط اللزوم والجعل)

## یەكەم: مەرجی پێویستی (لزوم)

**بریتیە لە:** ئەو مەرجانەی ئەگەر هەبوو بۆ هیچ لایەكیان و كەسی دیكە نیە هەڵیبوەشێنێتەوە بەویستی یەكلایەنە یاخود لەرێگەی دادگاوە، بەڵام دەكرێت بەرێككەوتنی هەردوولا هەڵبوەشێتەوە هەروەك لە خولع(تەڵاقی بەبەرانبەر)دا هەیە.

بەڵام ئەگەر مەرجێك لەمەرجەكانی پێویستی نەهاتەدی، ئەوا بۆ ئەو لایە هەیە كەبریاری نا پێویستی بۆ بەرژەوەندی خۆی داوە داوای هەڵوەشاندنەوەی بكات.

گرنگترین مەرجەكانی پێویستیش بریتیە لە:

١- پیاو و ژنەكە هیچ یەكێك لەو ناتەواوێتیانەیان تێدا نەبێت كەدەبێتە هۆی جیاكردنەوە لەدادگا، لەبەشی دوومی ئەم كتێبەدا بەپشتیوانی خوای گەورە بەدرێژی باسی هۆكارەكانی جیاكردنەوە لەدادگا دەكەین.

ئەگەر ناتەواویەك لەپیاوەكە یان ژنەكەدا دۆزرایەوە ئەوا پاساوی هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیریەكە دەداتە دەست دادگا، بۆ لایەنی بەرانبەر هەیە كە ئەو ناتەواویە یان هاوشێوەی تیا نیە داوای هەڵوەشاندنەوە بكات بەو مەرجانەی كەلەبەشی تەڵاقدا باسی دەكەین دواتر.

٢-ژن و پیاوەكە یەكێكیان وا نەبن شیاوێتیان تێدا نەبێت بەوەی بچوك بێت و یان شێت لەكاتی ئەنجامدانی هاوسەرگیریەكەدا، ئەگەر كچی بچوك لەلایەن بەخێوكارەكەیەوە درایە شوو یاخود كوری بچوك هاوسەرگیری كرد، یان

هاوسەرگیری کوڕ یان کچی شێت لەلایەن دادوەرەوە ئەنجامدرا، کوڕ یان کچە بچوکەکە گەیشتە تەمەنی پێگەیشتن یاخود شێتێتیەکە نەما، بۆ ئەو کەسە هەیە شیاوێتی تەواو نەبووە یان ویست و تێگەیشتنی لەکاتی هاوسەرگیریەکەدا نەبووە، ئەگەر بەو هاوسەرگیریە رازی نەبوو بۆی هەیە هەڵیبوەشێنێتەوە، وەك ڕێزێك لەویستی و کارکردن بەرەزامەندیەکەی، هاوسەرگیریەکە پێش ئەنجامدان و پێش هەڵوەشاندنەوەکە دروستو بەرکارە، بەلاّم ناپابەندە واتە دەتوانرێت هەڵبوەشێنرێتەوە، هەندێك لەزانایان وایدەبینن کەمافی هەڵوەشاندنەوە ئەو کاتە دەبێت کەبەخێوکارەکە باوك یان باپیر نەبوبێت، ئەگەر وانەبوو ئەوا مافی هەڵوەشاندنەوەی نابێت، بەلاّم ئەمە لەگەلّ دەقی قورئانی پیرۆزدا یەکناگرێتەوە کەبەپێویستی دەزانێت لەکاتی ئەنجامدانی کارەکەدا یاخود پاش ئەوە رەزامەندی لەسەر بێت، هەروەك دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ)[1] بابەتی هاوسەرگیریش مەترسیدارترە لەمامەڵەی دارایی.

٣-هاوسەرگیریەکە هاوشان (غير كفء) نەبێت، ئەگەر ئافرەتێك کەسێکی بۆ خۆی هەڵبژارد وەك هاوسەری ژیانی بەبێ ئەوەی رەزامەندی بەخێوکارەکەی وەربگرێت، لەم کاتەدا هاوسەرگیریەکە کارێکی ناپابەندە، ئەگەر پیاوەکە هاوشان نەبوو بۆ بەخێوکارەکە هەیە داوای هەڵوەشاندنەوە بکات.

(الكفاءة)لەرووی زمانەوانیەوە: واتە یەکسانی، لەقورئانی پیرۆزدا بەم مانایە هاتووە: (وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ)[2]، لەفەرموودەی پێغەمبەریشدا هاتووە، لە ئیبن عەباس -خوا لێی رازی بێت- لەپێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە فەرموویەتی:

[1] (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً) (النساء:٢٩)
[2] سورة الاخلاص/ ٤.

(المُسْلِمُونَ تَتَكَافأُ دِماؤُهُمْ وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ وَيُرَدُّ عَلَى أَقْصَاهُمْ) [1] واته: لەتۆڵەکردنەوەدا خوێنیان یەکسان دەبێت، هەر کەس ئافرەتێکی کوشت ئەوا لەتۆڵەیدا دەکوژرێتەوە، ئەگەر کەسێکی خاوەن پایەی کۆمەڵایەتی یان سیاسی یان کارگێڕی یاخود هاوشێوەیان کەسێکی لاوازی کوشت کەئەو پلانەی نەبوو ئەوا تۆڵەی لێدەکرێتەوەو دەکوژرێتەوە.

(الکفاءة) لەزاراوەناسی شەرعیشدا: بریتیە لەوەی پیاوەکە لەپلەیەکدا بێتو ژنەکەش لەپلەیەکی دیکەی کۆمەڵایەتی کەژنەکە یان بەخێوکارەکەی بەوە رازی نەبن.

یەکسانی لەلای پیاوەکەوە جێی بایەخە نەك ژنەکە، مەرج نیە ژن هاوشانی پیاو بێت.

رای پەسەندیش ئەوەیە کەهاوشانی مەرجی پابەندی (لزوم)ە نەك دروستیو بەرکاریو ئەو خەسڵەتانەشی لەهاوشانیدا جێی بایەخە پاش ئاین بەپێێ نەریتی دروستی باو لەهەر سەردەمو جێگایەکدا بڕیاری لەسەر دەدرێت.

## دووەم – مەرجە لەسەر پێکهاتووەکان(الشروط الجعلیة)[2]

بریتیە لەو مەرجانەی کەلەلایەن لایەنێکی هاوسەرگیریەکەوەیە، هەر ئەمیش تا رادەیەك جێکەوتەی هاوسەرگیریەکە دیاری دەکاتو ئەگەر رەوا بوو ئەوا پێویستە جێبەجێ بکرێت، لەیەکێك لەم سێ حاڵەتەدا رەوا دەبێت:

---

[1] ابن ماجة ٢٦٧٣.

[2] مەرجەکانی پێویستبوون (الشروط الجعلية) بریتە لەو مەرجەی کەبەهەڵبژاردەی خودی کەسەکە دەبێت، واتە شتەکە دەکاتە مەرج بۆ شتێکی دیکە، وەك ئەوەی شەرعو نەریت پێشتر بڕیاریان لەسەر نەدابێت یاخود بڕیاریان لەسەر دابێت بەڵام پێویست نەبێت بۆ هەڵسوکەوت، وەك ئەوەی ژن کاتی هاوسەرگیری بیکاتە مەرج لەسەر مێردەکەی ئەگەر ژنی بەسەردا هێنا ئەوا مافی تەڵاقدانی خۆی هەبێت.

١ـ ئەگەر جەختكەرەوە بوو لەپێویستیەکانی هاوسەرگیری وەك ئەوەی ژنەکە داوای کرد ماڵو پێداویستیەکانی بۆ دابین بکرێت.

٢ـ ئەگەر لەنەریتدا هەبوو، وەك ئەوەی ژنەکە بیکاتە مەرج لەسەر پیاوەکە بەپێی باو بێت (واتە بەپێی ئاستی ژنەکە بێت).

٣ـ ئەگەر لەشەرعدا هاتبوو، وەك ئەوەی بیکاتە مەرج لەسەر پیاوەکەی تواناو دەستەڵاتدانی خۆ تەلاقدانی هەبێت ئەگەر ژنێکی دیکەی هێنا، ئەم مەرجانەو هاوشێوەکانیان شەرعین و دەبێت پێیانەوە پابەند بن لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): (أَحَقُّ مَا أَوْفَيْتُمْ مِنْ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ)[١]. واتە: رەواترین مەرج کەپێیەوە پابەند بن ئەو مەرجەیە بۆتە هۆی حەڵاڵکردنی دامەن بۆتان.

لەگێڕانەوەی موسلیمیشدا: (ان أحق شرط ان یوفی به ما استحللتم به الفروج).[٢] واتە: رەواترین مەرج پێیەوە پابەند بن ئەوەیانە دامەنی بۆ حەڵاڵ کردوون.

## هەڵوێستی یاسا:

یاسادانەری عێراقی بەشێوەیەکی نادروستی پەرت و ناتەواو چارەسەری مەرجەکانی هاوسەرگیری کردووەو سروشتی ئەو مەرجانەی دیاری نەکردووە.[٣]

لەمادەی شەشدا هاتووە :

١ـ گرێبەندی هاوسەرگیری نابەسترێت ئەگەر مەرجێك لەمەرجەکانی بەستنی یاخود دروستی کەلێرەدا خراوەتە روو لەدەستدا:

---

[١] البخاري: ٤٧٥٤.

[٢] صحیح مسلم: باب الوفاء بالشروط في النكاح ٢/١٠٣٥.

[٣] ولنه بەراشكاوی جۆرەكانی روون نەكردۆتەوە.

أ- یەکبوونی دانیشتنی (داواکردن) و (قبوڵکردن).

ب- هەردوو لایەنی گرێبەندەکە گوێیان لە قسەی یەکتربێت و، لەیەك تێبگەن کە مەبەستەکە بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتییە.

ج- گونجانی (داواکردن) ەکە لەگەڵ قبوڵکردنەکە.

د- شایەتیدانی دوو شایەت کە شایستەیی یاسایان هەبێ، بۆ گرێبەندی هاوسەرگیرییەکە.

هـ- نابێت گرێبەستەکە پەیوەستکرابێت بەمەرجێك یاخود ڕووداوێکی ئەنجام نەدراوەوە.

٢- گرێبەندی هاوسەرێتی بەنووسراوێك لەلایەن ئامادەنەبوو(غائب)ەوە، بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ بیخوازێت دەبەسترێت، بەمەرجێك نووسراوەکە لەبەردەم دوو شایەت بخوێندرێتەوە کە گوێیان لێی بێت و، شایەتی لەسەر ڕەزامەندیی ئافرەتەکە بدەن کە قبوڵی کردووە شووی پێ بکات.

٣-ئەو مەرجە ڕەوایانەی لە گرێبەندی هاوسەرگیرییەکەدا دەستنیشان دەکرێن، پێویستە ئەنجام بدرێن.

٤- ژنەکە بۆی هەیە داوای پووچەڵکردنەوەی گرێبەندەکە بکات، ئەگەر مێردەکە مەرجەکانی ناو گرێبەندەکەی بەجێ نەهێنا.

١. ئەو مەرجانەی لەبڕگەکانی (أ، ب، ج)دا هاتوون بریتین لەمەرجەکانی بەستن‌و ئەوانەی (د، هـ) مەرجی دروستین لەبڕگە (٣)دا مەرجی پێویستبوون (جەعلیە)، پێویستبوو یاسادانەر ئاماژەی بەسروشتی ئەم مەرجانە بکرادایە بەڕوونی‌و ڕۆڵیان لەهاوسەرگیری‌و شوێنەوارەکانی بەدینەهاتنیان، مادەی حەوتەمیش مەرجێك لەمەرجەکانی پابەندی لەخۆگرتووە‌و دەقەکەی بەمجۆرەیە: (مەرجی تەواوی لێهاتویی، بۆ هاوسەرگیری، عەقڵ و، تەواوکردنی تەمەنی هەژدە ساڵییە.) ئەم شیاوێتیە مەرج نیە بۆ دروستی هاوسەرگیری، چونکە دادگای عێراقی تا ئێستاش دان

بەهاوسەرگیری کوڕو کچی بچوکدا دەنێت ئەگەر لەدەرەوەی دادگا ئەنجامدرا بەو مەرجانەی کەهەیە بۆی.

مادەی نۆیەمیش مەرجێك لەمەرجەکانی جێبەجێکرانی روونکردۆتەوە کەئەویش بەدوور بوونی رەزامەندیە لە زۆرلێکردنو نەکەوتنە ئەو هەڵانەی کەپێشتر باسمان کردو لەبەندی چوارەمیشدا هەردوو مادەی دەو یازدە مەرجی رێکخستنی پەیوەندار بەچۆنیەتی تۆمارکردنی هاوسەرگیری لەدادگاو شێوەی سەلماندنی لەخۆ گرتووە ئەگەر هاتوو لەدەرەوەی دادگا ئەنجام درابوو ئەمەش لەپێناوەی پاراستنی مافەکانی هاوسەرێتیدا.

هەموو هەڵسوکەوتێکی شەرعی (یاخود یاسایی) دروست شوێنەوار(اثـار)ی خـۆی هەیـە، ئـەم شـوێنەوارانەش بریتیـە لـەمافـو پابەندیـەکان بـۆ هەردوولایـەنی هەڵسوکەوتەکە.

ئەگەر هەڵسو کەوتەکە تاك لایەنە بوو واتە بەویستی تاك لایەنە دەکرا وەك دیاری (هبە)، لێرەدا ماف بۆ ئەو کەسە دێـتەدی کەدیاریەکـەی پێـدەدرێت (پێبەخشـراو)، پابەندیش دێتە دی بۆ ئەو کەسەی دیاریەکە دەبەخشێت (بەخشـەر)، لـەم حاڵەتـەدا تەنها یەکێکیان (بەخشەر) قەرزار دەبێتو ئەوی دیکەیان (پێبەخشراو) خاوەن قـەرز دەبێت.

بەڵام ئەگەر هەڵسوکەوتەکە بەیەکگەیشتنی دوو ویست بـوو (وەك هاوسـەرگیری) لێرەدا مافـو پابەندی بەرانبەری تێدا دێتەدیو هـەر لایـەك مـافی دەبێـت لەسـەر لای بەرانبەریو هەرلایەکیشیان پابەندی لەسەر دەبێت لەئاست ئـەوەی دیکەیانـدا، مـافی هەریەکەیان بەرانبەر پابەندیەکی بەرانبەرکەیان دیاریکراوە.

ماف (حق): پێگەیەکی شەرعیە بۆی هەیە خاوەنەکەی یاخود جگە لەخۆی ئەگەر ماددی بوو لێی سوودمەند بێت، ئەگەر مادیش نەبوو ئەوا تەنها خاوەنەکەی بۆی هەیە لێی سوودمەند بێت.

پابەندی (الالتزام): لەئەستۆگرتنی ئەنجامدانی کارێکە بەخۆبەخشی یاخود بەزۆر کەبەهۆیەوە لەئەستۆگرتنی مافی کەسی تر دەگرێتەوە تا تەواو دەبێت[1].

بـەم پێیـە هەریـەك لـەژنو مێـرد مافیـان لەسـەر یەکـدی هەیـەو هەریەکەشـیان پابەندیان بەرانبـە ر یـەك لەسـەرە، ئێمـە تـەنها مافـەکانی هاوسـەرێتی دەخەینـە روو

---

[1] بڕوانە ئەم کتێبەم: (الالتزامات في الشريعة الاسلامية والتشريعات المدنية العربية) ل١٧.

چونکە پابەندیەکان لەکاتی باسکردنی ئەو مافانەدا دەزانرێن، لەسەر ئەو بناغەیەی کەهەر مافێك لەبەرانبەر پابەندیەکی کەسی بەرانبەردا هەیەو پەیوەستبوون (تلازم) لەنێوانیاندا هەیە، هەر مافێك پێویستە پابەندیەك هەبێت بەرانبەری، هەر پابەندیەکیش دەبێت ئەنجامدانی مافێك هەبێت بەرانبەری، مافەکانی هاوسەرگیریش بەپێی سروشتەکەی هەیانە مادیە وەك مافە داراییەکان وەك مارەیی و بژێوی (المهر والنفقه)، هەیانە مەعنەویە ئەوانیش مافە نادارایيەکان دەگرێتەوە وەك چێژ وەرگرتن لەیەکدی، لەرووی پابەندبوون و پابەندکراو پێیەوە یان ئەوەتا تایبەتە بەژنەکە وەك مارەیی یان تایبەتە بەپیاوەکە وەك بەدەمەوەهاتنی شەرعی لەکاری هاوسەریدا، یان ئەوەتا هاوبەشن لەنێوان هەردوولادا وەك رێزو خۆشەویستی لەنێوانیاندا بەرانبەر یەك.

لەبەر ئەوە باسکردنی ئەم سێ جۆرە لەمافەکان دابەش دەکەین بۆ سێ دەروازە، یەکەمیان بۆ روونکردنەوەی مافەکانی ئافرەتەکە، دووەم بۆ مافەکانی پیاوەکە، سێیەمیش بۆ مافە هاوبەشەکان.

# دەروازەی یەکەم:
# مافەکانی ژن لەسەر مێرد
## (حقوق الزوجة على الزوج)

مافەکانی ژن لەسەر مێردەکەی هەیانە مادیەو هەیانە مەعنەویە، لێرەدا تەنها مافە مادیەکان باس دەکەین چونکە مافە مەعنەویەکان دەچێتە ناو خانەی مافە هاوبەشەکانەوە، لەبەر ئەوە تەنها بەم خستنە رووە کورتە بۆ ناو بابەتەکە واز دەهێنمو درێژەی نادەمێ.

مافە مادیەکان سێ جۆرن، ئەوانیش مارەیی و چێژو بژێوین.

### یەکەم: مارەیی:

دیاریەکی مادی رەمزیە لەلایەن مێردەوە پێشکەشی ژن دەکرێت لەشەوی گواستنەوەدا، وەك خاڵی دەستپێکی یەکترناسینی نێوان دوو کەس کەهەریەکەیان لەخێزانێکەوە بەمەبەستی پێکهێنانی خێزانێکی نوێ هاتوونو زۆربەی جار نامۆن بەخێزانی یەکتر، هەروەها پێدانی مارەیی لەلایەن مێردەوە بەهاوسەرەکەی بەدانانی بەردی بناغەی بونیاتنانی خێزانێکی نوێ دادەنرێت کە جودایە لەخێزانی پێشووی هەریەکەیان، گوزارشتیشە لەوەی کەمارەیی شەوی گواستنەوەو پێش چوونەلا پێشکەشی ژنەکە دەکرێت، پێغەمبەر (ﷺ) رێگەی نەدا بەعەلی کوڕی ئەبو تالیب کەبچێتە لای فاتیمەی خێزانی (خوا لێیان رازی بێت) کەکچی پێغەمبەر بوو تا ئەو کاتەی شتێك مارەیی پێشکەش دەکات، بەپێی ئەم راستیە مارەیی لەرووی پێگەوە لەهاوسەرگیریدا نەپایەیە نەمەرج، بەڵکو لەکاتی نەبوونی مارەیشدا هاوسەرگیری هەر دروستە، بەڵام لەکاتی بوونیدا راستەوخۆ بەستنی هاوسەرگیریەکە دەگەیەنێت، ئەم

بوونەش بەچوونەلا یاخود مردن لێی دڵنیا دەبن ئیدی لەکاتی پێکهێنانی هاوسەرگیریکەدا باسی کرابێت یان نا، ئەمەش لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: ( لَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ[1] أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً[2] وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ)[3] ئەم ئایەتە بەراشکاوی ئەوەی لێ دەخوێندرێتەوە کە تەڵاق لەهاوسەرگیریدا دروستە پێش چوونەلاو مارەییش تێیدا دیاری نەکرا بێتو دیاریکردنەکەی بۆ کاتی پێکهێنانی هاوسەرگیریە هێڵرابێتەوە، ئاشکرایە تەڵاق پاش هاوسەرگیریەکی دروست دەبێت، جا دروستی تەڵاق ئەوە دەخوازێت هاوسەرگیریەکە دروست بووبێت، چونکە تەڵاق کۆتاییپێهێنانی پەیوەندی هاوسەرییە.

ئافرەتی تەڵاقدراو پێش ئەوەی بکرێتە پەردەو بەر لەوەی مارەییەکەی بۆ دیاری بکرێت مافی بەخشش (متعە)ی هەیە وەك قەرەبووی ئەو زیانە ئەدەبیە (مەعنەویەی) هەیە کەبەهۆی تەڵاقدرانیەوە پێی دەگات، لەپاش روونکردنەوەی مارەیی باس لەبەخشش (متعە) دەکەین.

بەپێچەوانەی مردنی مێردەوە لەم حاڵەتەدا، ئەگەر مێردەکە پێش چوونەلا لەگەڵ ژنەکەی و بەر لەدیاریکردنی مارەییەکەی مرد، ئەوا مارەیی هاوشێوەی بۆ هەیە، چونکە مردن وەك چوونەلا وایە، هەموو چوونەلایەکیش پێش دیاریکردنی مارەیی پێدانی مارەیی هاوشێوە پێویست دەکات، بەڵگەش لەسەر ئەمە دەگێڕنەوە لەبارەی پیاوێکەوە پرسیار کرا لەعەبدوڵای کوڕی مەسعود کەژنێکی خواستبوو پێش چوونەلاو مارەیی پێنەدرا، پاش ماوەیەك وتی: (وای دەبینم مارەیی هاوشێوەی

[1] واتە پێش ئەوەی سەرجێیان لەگەڵ بکەن، لەخوێندنەوەیەکی دیکەدا (تماسّوهن) پێش ئەوەی دەستتان پێیان بگات واتە سەرجێییان لەگەڵ بکەن.

[2] دیاریکراوەکە مارەیی (المهر)ە ناوی دیکەشی هەیە لەعەرەبیدا وەك (الصداق، والنحلة، والأجر).

[3] سورة البقرة: ٢٣٦.

ئافرەتەکانی دیکەی بۆ ببێت بەبێ زیادو کەم)، هەروەها میراتیشی پێبدرێت و ماوەی چاوەڕوانی (عیدە)شی لەسەرە، مەعقەلی کوڕی سینانی ئەشجەعیش گێڕایەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەی بروعی کچی واشقی ئەشجەعیەوە هاوشێوەی ئەوەی ئیبن مەسعود داوەری پێکرد داوەری کردووە، کەسانێکی تری ئەشجەعی هەمان شایەتیان داو ئیبن مەسعود بەجۆرێك خۆشحاڵ بوو بەوە کەلەوەتی بوو بووە موسڵمان بەو جۆرە خۆشحاڵ نەبوبوو.[1]

**سەرچاوەی پێویستبوونی مارەیی ژن لەسەر مێردەکەی (مصدر وجوب المهر على الزوج لزوجته)،**

سەرچاوەی ئەم حوکمە قورئانەو، فەرموودەکانی پێغەمبەرو کۆدەنگی زانایانی شەریعەتیش جەختی لەسەر دەکاتەوە.

١- قورئانی پیرۆز:

لەقورئاندا چەندین ئایەت هاتووە فەرمان بەپێویستی پێدانی مارەیی لەلایەن مێرد یان لەلایەن ئەو کەسەی دەیبەخشێت لەبری مێردەکە بەژنەکەی پاش هاوسەرگیریەکی دروست یاخود چوونەلا لەهاوسەرگیری نادروست (الزواج الفاسد)دا، نمونەی ئەو ئایەتانەش:

خوای گەورە دەفەرموێت:(وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً)[2]

هەروەها دەفەرموێت: ( فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً )[3]

---

[1] ئەم بابەتە جێی ناکۆکیە بۆ زیاتر ئاگاداربوون لەهۆکاری ناکۆکیەکە بڕوانە کتێبی (بداية المجتهد ونهاية المقتصد لابن رشد ٢/٢٢ ) رای پەسەند ئەوەیە کەمارەیی هاوشێوەو میراتی دەدرێتێ.

[2] (وَآتُوا النِّسَاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِنْ طِبْنَ لَكُمْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ نَفْساً فَكُلُوهُ هَنِيئاً مَرِيئاً) (النساء:٤).

[3] (وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُمْ مَا وَرَاءَ ذَلِكُمْ أَنْ تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُمْ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُمْ بِهِ مِنْ بَعْدِ الْفَرِيضَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيماً حَكِيماً) (النساء:٢٤).

بەهەمان شێوە ئەم ئایەتە: (وَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ).[1]

ب ـ سوننەتی پێغەمبەر:

فەرموودەی زۆری کرداری‌و گوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) هەیە بەئاشکرا گوزارشت لەپێویستی مارەیی دەکات پاش هاوسەرگیری دروست، یەکێك لەو فەرموودانە ئەوەیە کە ئەبی سەلمە کوڕی عەبدوڕەحمان دەگێڕنەوە وتوویەتی: لەخاتوو عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) پرسیار کرا پێغەمبەر (ﷺ) چەند مارەیی پێدا؟ وتی: مارەییەکەی بۆ هەر دوازدە هاوسەرەکەی ئۆقیەیەك[2] وەنش بوو، وتی: ئایا دەزانیت وەنش چیە؟ دەڵێت: وتم نەخێر، وتی: نیو ئۆقیەیە، پێنج سەد درهەمە، ئەوە مارەیی پێغەمبەر (ﷺ) بووە بۆ هاوسەرەکانی.[3]

ج ـ کۆدەنگی:

لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان زانایانی شەریعەت کۆدەنگن لەسەر پێویستبوونی مارەیی یاخود مارەیی هاوشێوە لەسەر مێرد بۆ ژنەکەی پاش هاوسەرگیری دروست یان چوونەلا لەهاوسەرگیری پوچەڵ (زواج فاسد)دا.

---

(1) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُمْ مَا أَنْفَقُوا وَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنْفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنْفَقُوا ذَلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) (الممتحنة:١٠).

(2) ئۆقیە بریتی بووە لە چل درهەمی زیو.

(3) صحیح مسلم ١٠٤٢/٢ رقم الحدیث (١٤٢٦).

**مەرجەکانی دروستیی مارەیی (شروط صحة المهر):**

مەرجە کەمارەیی ماڵێکی گوێزراوەی بەهادار بێتو لەمامەڵە پێکردنـدا بەهایـەکی شەرعی هەبێتو بتوانرێت مامەڵەی پیّ بکرێتو دیاری کراوبێت یان توانای دیاریکرانی هەبێت، ئەو لایەنەی کەپێشکەشی ژنەکەی دەکات خـاوەنی بێـت، ئیـدی ئـەو لایەنـە مێردەکە بێت یان سەرپەرشتکارەکەی یاخود هەر کەسێکی دیکـە کەبـەڵێنی پێـدانی بدات.

**بڕی مارەیی (مقدار المهر):**

شەریعەتی ئیسلام کەمترین بڕو زۆرترین بڕی مارەیی دیاری نـەکردووە، بەهـەمان شێوە سروشتەکەشی دیاری نەکردووە، بەڵکو ئەوە لێگـەڕاوە بـۆ نـەریتی بـاو لەهـەر کاتو جێگەیەکدا، هەروەها بۆ توانای دارایی مێردەکـەو پێگـەی کۆمەڵایـەتی ژنەکـە، بەڵام شەریعەتی ئیسلامی داوا دەکـات زیـادەڕۆی نـەکرێت لەمارەییـدا، چـونکە ڕێـزو ڕەوشتو خۆشەویستیو سۆز گرەنتی بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتی دەکات نەك بڕی مارەیی، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (ان اعظم النكـاح بركـة أيسـره مؤنـة)[1] واتـە: مەزنترین بەرەکەت لەو هاوسەرگیرێتیەدایە کە کەمترین مارەیی تیا بووە، لە (صـحيح مسلم)دا هاتووە: (باب الصداق وجواز كونه تعليم القرآن وخـاتم حديـد وغـير ذلـك مـن قليل وكثير واسـتحباب كونـه خمسـمائة درهـم لمـن لا يجحـف بـه)،[2] واتـە: لەباسـی مارەیی و دروستی کەفێربوونی قورئان و ئەنگوستیلەیەکی ئاسـنو شـتی دیکـە بێـت زیاد یان کەم و باشترە کە پێنج سەد درهـەم بێـت بـۆ ئـەو کەسـەی کەلەتوانایدایـە، لەهـەمان باسـدا فـەرموودەی زۆر هەیـە لـەبارەی بـڕی مـارەییو شـێوەو سروشـتو پێویسـتبونیەوە، کـەلێرەدا بـواری خسـتنە ڕوویـان نیـە، دەرئەنجامەکـە ئەوەیـە

---

[1] مشكاة المصابيح ٣٠٣٣.

[2] صحيح مسلم/ ٢/١٠٤٠.

کەئیسلام کەمترین رادەو زۆرترین رادەی مارەیی دیاری نـەکردووە، بەهـەمان شـێوە سروشتەکەشی دیاری نەکردووە، دروستە شتێکی مادی بێتو دروستیشـە مەعنـەوی بێت وەك فێرکردن.[1]

**چەسپاندنی مارەیی (تأكد المهر):**

هەموو مارەیی بەهاوسەرگیری دروست پێویست دەبێت بدرێت، زانایانی شەریعەت بۆچوونیان لەوەدا جیـاواز نیـە کەهـەموو مـارەیی بەیـەکێك لـەم دوو کـارە پێویست دەبێت:

یەکـەمیان: چـونەلای تـەواو، بـەڵام بۆچـوونیان جیـاوازە لـەبارەی چـونەلای حوکمیەوە، کەبریتیە لەبەیەکەوە بوونی پەنهانی دروست (الخلوه الصحيحه)، ئەویش پێکەوە بوونی ژنو مێردە لەجێگایەکدا بەتەنها کەدڵنیان بێ رەزامەندی خۆیان کەس نایەت بەلایانەوەو هیچ رێگریەك نیـە لەبەردەمیانـدا لەئەنجامـدانی سـەرجێی، رێگـری وەك ئەوەی بچوك بن یان رێگری شـەرعی وەك بێنوێـژیو رۆژووی رەمـەزان، رێگـری دیکە وەك ئەوەی کەسی سێهەمیان لەگەڵ بێت باخەوتبێتیش یاخود کـوێر بێـت یـان منداڵێکی ناهەراش (صبي غير مميز) بێت، ئەگەر یـەکێك لـەم رێگریانـە بـوونی هـەبوو ئەوا پەنهان بوونەکە پوچەڵ (الخلوه الفاسده) دەبێتو بەهۆیـەوە مـارەیی سـەرجێی

---

[1] عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خوای لێبێت) ویستی رێگری مـارەیی زۆر لەخـەڵك بکـاتو فـەرمانی کـرد مارەیی زیـاتر نـەبێت لەچوارسـەد درهـەمو لـەکاتی قسـەکردنیدا بـۆ خـەڵکی وتـی: زیـادەڕۆی نەکـەن لەمارەیی ئافرەتاندا، ئەگەر ئەوە رێز بوایـە لـەدونیادا یـاخود پارێزکـاری بوایـە لای خـوای گـەورە ئـەوا لەئێوە لەپێشتر بۆ ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو، ئەو هیچ کام لەخێزانەکانی یاخود کچـەکانی زیـاتر لەدوازدە ئۆقیە نەبووە لەبەر ئەوە هەرکـەس لەچوارسـەدە زیـاتری کـرد ئـەوا زیادەکـە بـۆ گەنجینـەی دارایی (بيت المال) وەردەگیرێت) پاشان ئافرەتێکی قورەیشی وتی: ئەوەت بۆ نیە عومەر، عومەر وتی: بۆ؟ وتی: چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ أَرَدْتُمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنْطَاراً فَلا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئاً أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَاناً وَإِثْماً مُبِيناً) (النساء:٢٠)، عومەر وتی: خوایە لێم خۆش ببە هەموو لەخەڵك لەتۆ هۆشیار ترە عومەر، لەگێڕانەوەیەکی تردا وتی: ژنێك پێکای‌و عومەر هەڵەی کرد.

ناچەسپێت، بەڵام ئەگەر هەموو ئەوانە نەبوو ئەوا پەنهان بوونەکە دروست دەبێت، زانایان بۆچوونیان جیاوازە لەوەی ئایا بەسەرجێیکردنی حوکمی دادەنرێتو بەهۆیەوە مارەیی تەواو دەچەسپێت وەك ئەوەی چوونە لای تەواو رویدابێت[1]، ئەوانەی بۆچوونیان وایە چوونەلا(دخول)ە لەرووی چەسپاندنی مارەیی تەواوەوە پشتیان بەچەند بەڵگەیەکی شەرعی بەستووە، لەوانە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (من كشف خمار امرأته ونظر إليها وجب الصداق، دخل بها ام لم يدخل)[2]، واتە: هەرکەس تارای سەر خێزانەکەی لاداو سەیری کرد ئەوا مارەیی لەسەر پێویست دەبێت، ئیدی سەرجێی لەگەڵ ئەنجام دابێت یان نا.

هەروەها پشتیان بەبەڵگەی عەقڵی بەستووە بەوەی کەژنەکە بەهۆی پێکەوە بوونی پەنهانی دروستەوە خۆی داوە بەدەست مێردەکەیەوە لەحاڵەتێکدا هیچ رێگریەك نەبێت کەرێگە بەوە نەدا مافە شەرعیەکەی (سەرجێی کردن) ئەنجام بدات.

دووەمیشیان: بەمردن: هەر پیاوێك ئافرەتێکی خواستو پاش گرێبەندی هاوسەرگیریەکە با بەماوەیەکی کەمیش بێت یەکێکیان مردن، ئەوا مارەیی تەواو بۆ ژنەکە پێویست دەبێت ئەگەر مێردەکە مردبوو، ئەگەر ژنەکەش مردبوو ئەوا بۆ میراتگرانی ژنەکە دەبێت.

شایانی باسە کەمارەیی پاش پێویستبوونو چەسپاندنی قەرزێکە لەئەستۆی مێردداا، ئەگەر پێش ئەوەی ئەو قەرزە بداتەوە بەژنەکەی مرد پێویستە لە میراتیەکەی بدرێتەوە پێش دابەشکردنیو پێش جێبەجێکردنی راسپاردنی.

---

[1] هەندێك لەزانایانی شافیعیو زاهریو ئیمامی مالیك وتوویانە هەموو مارەیی بەچوونە پەنهانی دروست پێویست نابێتو ناچەسپێت.

[2] بدائع الصنائع ٢/٢٩٢.

مارەیی دیاریکراویش یاخود مارەیی هاوشێوە ئەگەر هەمووی یان هەندێکی دواخراو (مؤجل) بوو، ئەوا دەگۆڕدرێت بۆ پێشخراو (معجل) بەیەکێك لەم دوو هۆکارە، بەتەڵاقدانی لێکترازان (بائن) یاخود بەمردن.[1]

زیادکردنی مارەیی و لێکردنەوەی (زیادة المهر والحط منه):

بۆ مێردی باڵغی عاقڵی پێگەیشتووی سەرپشك (مختار) هەیە کە -پاش گرێبەندی هاوسەرگیری- چەندی حەز لێیە مارەیی زیاد بکات و ئەم زیادەیەش دەکەوێتە ئەستۆی و دەبێت پابەند بێت پێوەی، هەروەها دروستە بۆ ژن کەباڵغ و عاقڵ و پێگەیشتوو سەرپشك بێت بەرەزامەندی خۆی کەلەبەشێك لەمارەییەکەی یاخود لەهەموو دواخراوەکەی خۆش ببێت ئەوەش بەگەردن ئازاکردن، ئەگەر هاتوو مارەییەکە قەرزێك بوو لەئەستۆیدا، وەك ئەوەی بەهادار(مثلی) بێت وەك پارە، بەڵام ئەگەر مارەییەکە ماڵێنە (الاعیان) بوو وەك ئۆتۆمبێل و خانوویەرە، ئەوا لێخۆشبوونەکە بەپێشکەشکردنی وەك دیاری دەبێت چونکە گەردن ئازایی ماڵێنە (الاعیان) ناگرێتەوە.

سەرچاوەی دروستی زیادەی مارەیی و کەمکردنەوە قورئانی پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ).[2]

---

[1] یاسادانەری عێراقیش ئەمەی پەیرەو کردووەو لەمادەی بیستی یاسای باری کەسیی بەرکاردا هاتووە کە: (دروستە مارەیی هەمووی یان هەندێکی پێشبخرێت یان دوابخرێت. لەکاتی نەبوونی دەق لەوبارەیەوە ئەوا پەیرەی نەریت دەکرێت. ماوەی دیارکراو لە گرێبەندەکەدا، بۆ شایستەبوونی مارەیی، بەمردن، یاخود بە تەڵاقدان بەسەردەچێت (یسقط).

[2] (وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا بِأَمْوَالِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ فَمَا اسْتَمْتَعْتُم بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِ مِن بَعْدِ الْفَرِيضَةِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا) (النساء:٢٤).

هەموو هەڵس و کەوتێکی شەرعی یان یاسایی رێگەپێدراو بەمەرجی هەبوونی شیاوێتی (اهلیـة)ی لەو کەسەی دەستبەردار دەبێت لەمافی خۆی بەرەزامەندی تەواوی بەدەر لەهەر نەنگیەك لەنەنگیەکانی ویست (عیوب الارادة) وەك زۆرلێکردن، لەخشتەبردن، هەڵە، چەوسانەوە.

**پەرتبوونی مارەیی (تشطر المهر):**

هەر کاتێك پیاوێك بەشێوەیەکی دروست هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکدا ئەنجامداو پێش چوونەلای تەڵاقیدا، ئەوا مارەییەکەی دابەش دەبێت بۆ دوو بەش، نیوەی دەدرێتەوە بەمێردەکە چونکە چێژی لەهاوسەرەکەی نەبینیوەو چونەلای نەسەلمێنراوە، نیوەکەی دیکەش ئافرەتەکە دەبێتە خاوەنی ئیدی ئەو مارەییە پێشخراو یان دواخراو بێت، ئەمەش وەك قەرەبووی ئەو زیانە مەعنەوییەی کەبەهۆی تەڵاقدرانیەوە تووشی بووە، چونکە تەڵاقدران لەپلەی ئافرەت کەم دەکاتەوە یا بەهۆی کەمتەرخەمی مێردیشەوە بێت.

بەمەش ئیسلام لەدانپێدانانی زیانی مەعنەوی و پێویستی قەرەبووکردنەوەی پێش یاسا دانراوەکان کەوت، سەرچاوەی ئەم حوکمەش قورئانی پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ[1] وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَنْ يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلَا تَنْسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ).[2]

بەمجۆرە ژنەکە نیوەی مارەیی بۆ هەیە بەم مەرجانە:

١ـ دەبێت هاوسەرگیریەکە دروست بێت، ئەگەر پوچەڵبو پێش چوونە لای جیابوونەوە لەنێوانیاندا روویدا ئەوا ژنەکە هیچ مارەیی بەرناکەوێت، چونکە مارەیی

---

[1] واتە پێش ئەوەی بچنە لای.
[2] البقرة:٢٣٧.

هاوشێوە یان کەمترینی دیاریکراوو مارەیی هاوشێوە لەهاوسەرگیری نادروستدا بەهۆی چوونە لاوە پێویست دەبێتو هاوسەرگیری نادروستیش وەك بەتاڵ وایە پێویستە ژنو مێردەکە لێك جیا بکرێنەوە.

٢ـ مارەییەکە بەشێوەیەکی راست دیاری کرابێت.

٣ـ جیابوونەوەکە پێش چوونەلاو پەنهانی دروست روویدابێت[١].

٤ـ نابێت جیابوونەوەکە لەسەر داوای ژنەکە بێت یان هۆکاری جیابوونەوەکە ژنەکە بێت، چونکە ئەگەر وابێت ئەوا هیچ مارەیی ناکەوێت.

**کەی مارەیی هاوشێوە پێویست دەبێت ؟**

مارەیی هاوشێوە: بریتیە لەهاوشێوەی مارەیی خزمێکی باوکی وەك خوشکی یان پوری —خوشکی باوکی—، بەو مەرجەی هەمان ئەو مەرجانەی ئەوانی تێدا بێت وەك تەمەنو جوانیو، سامانو، ئاینداریو، ئاکارو، عەقڵو، زانستو، پاکیزەیی (بکارة)، بێوەژن، منداڵبوونو، نەزۆکیو، ئەو خەسڵەتانەی دیکە کەلەئافرەتدا دەخوازرێن هەبێت.

ئەگەر لەخزمانی باوکیدا نەبوو ئەوا وەك ئافرەتێك لەخێزانێکدا کەهاوشێوەی ماڵی باوکی بێت.

گرنگترین ئەو حاڵەتانەی مارەیی هاوشێوەی تێدا پێویست دەبێت لەبری مارەیی دیاریکراو:

١ـ ئەگەر مارەییەکە لەهاوسەرگیریەکەدا دیاری نەکرابوو، یاخود هەردوولا رێککەوتبوون لەسەر نەبوونی ئەم رێککەوتنە ئەگەر روویدا ئەوا بەتاڵە، چونکە پێچەوانەی پێڕەوی گشتی (نظام العام)ە.

---

(١) ئەوەش بەپێی بۆچوونی پەسەند وەك چوونەلا وایە بۆ مارەیی.

٢- ئەگەر دیاریکراوەکە بەهادار (متقوم) نەبوو ئەوا هیچ بەهایەکی شەرعی نیە وەك سەرخۆشکارەکان‌و بێهۆشکارەکان.

٣- ئەگەر ماڵەکە بەپێی شەرع‌و یاسا نەدەتوانرا هەڵس‌وکەوتی پێ بکرێت وەك ماڵی وەقف لەشەرعداو ماڵی شوێنەوار لەیاسادا.

٤- ئەگەر ناونراوەکە نادیاربوو بەشێوەیەکی خراپ نادیار (جهالة فاحشة) وەك ئەوەی بیخوازێت لەسەر هەندێك لەمەڕەکانی یاخود مانگاکانی یان حوشترەکانی یاخود هاوشێوەی ئەوانە.

٥- ئەگەر خاوەندارێتی مارەییە دیاریکراوەکە هی کەسێکی دیکە بوو نەك ئەو کەسەی لەسەریەتی بیدات بەژنەکە، وەك ئەوەی دزراو بێت یان دەست بەسەرداگیراو.

٦- ئەگەر هۆکارەکەی چوونەلا بێت لەهاوسەرگیری پوچەڵدا، هاوسەرگیری پوچەڵ ماف‌و پابەندییەکانی لێ ناکەوێتەوە چونکە لەگەڵ ئەوەی بەتاڵە یەکسانن بەڵام ئەگەر چوونەلا روویدا پاش ئەوە ئەوا ئەو چوونە لایە هەندێ شوێنەواری شەرعی دروست دەبێت هەروەك پێشتر باسمان کرد، لەوانە پێویستبوونی مارەیی هاوشێوە بۆ ئەو ئافرەتەی چوونەلای روویداوە وەك قەرەبوویەکی ئەدەبی (مەعنەوی) بەرانبەر ئەو زیانەی بەهۆی چوونەلایەوە دروست بووە.

**نەهێڵەرەکانی مارەیی (مُسقطات المهر):**

هەموو مارەیی نامێنێت لەحاڵەتەکانی جیابووەوە بەبێ تەڵاقدان پێش چوونەلای راستەقینە یاخود پەنهانی دروست هەروەك لەم شێوانەدا هەیە:

أ- ئەگەر کوڕ یان کچی ناپێگەیشتوو (قاصر) پاش باڵغبوون هەستان بەهەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیرییەکە کەپێش باڵغبوونیان ئەنجام درابوو.

ب ـ کوڕ یان کچ کەشێت بێت هەستێت بەهەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیری پاش چاکبوونەوەی ئەمە ئەگەر هاتوو هاوسەرگیریەکە لەکاتی شێتبوونەکەدا ئەنجام درابوو.

ج ـ هەڵوەشاندنەوە لەبەر هەر هۆکارێکی دیکە.

د ـ هەڵگەڕانەوەی ژنەکە پێش چوونەلاو پێکەوەبوونی پەنهان.

هـ ـ موسڵمانبوونی پیاوەکەو نکوڵی کردنی ژنەکە لەموسڵمانبوون لەکاتێکدا ژنەکە لەپەیڕەوانی ئاینی ئاسمانی نەبێت.

و ـ گەردن ئازاکردنی مێردەکە لەمارەییەکە ئەگەر هاتوو قەرز بوو لەئەستۆیداو ئافرەتەکە بالغو عاقڵو پێگەیشتوو سەرپشک بوو ئیدی لێخۆشبوونەکە بەخاوەنبوونیەوە بێت یان بەدەست لێهەلگرتنی بێت.

ز ـ ژنەکە هەموو مارەییەکەی بکاتە دیاری بۆ مێردەکەی پێش ئەوەی وەریبگرێت ئیدی قەرز بووبێت یان شتی دیاریکراو یاخود پاش ئەوە ئەگەر شتی دیاریکراو بوو بەو مەرجەی ئافرەتەکە شیاوێتی بەخشینی تێدا هەبێت.

بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە گەردنی مێردەکەی لەمارەییەکەی ئازا کرد یاخود بەدیاری پێی بەخشی بەمەبەستی پتەوکردنی پەیوەندی هاوسەرێتی نێوانیانو بەردەوامی هاوسەرگیریان پاش ئەوە پیاوەکە ژنەکەی تەڵاقدا ئەوا مارەییەکە ناکەوێت ئیدی ئەوە پێش چوونەلای بێت یان پاش چوونەلای چونکە ئەو مەبەستەی هۆکاربووە بۆ گەردن ئازاکردن یاخود پێشکەشکردنەکەی نەهاتۆتە دی.[1]

---

[1] لەبابەتی مارەییدا سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:

البدائع للكاساني (الفقه الحنفي) ١٤٢٢/٣ وما يليها.

تحفة المحتاج (الفقه الشافعي) شهاب الدين احمد بن حجر الهيتمي ٣٧٥/٧ ومما يليها.

شرح الخرشي على مختصر سيدي خليل (الفقه المالكي) ٢٥٣/٣ وما يليها.

بداية المجتهد (الفقه المقارن) لابن رشد ٢٢/٢ وما يليها.

**هەڵوێستی یاسا لەبارەی مارەییەوە:**

یاسای باری کەسیی عێراقیی بەرکار لە کەلێنەکانی مارەیی (شقوق المهر)و حوکمەکانی بەشێوەیەکی کورت دواوە، بەمجۆرە:

لەمادەی (١٩)دا هاتووە:

١. ژن مافی ئەو مارەییەی هەیە کە لە گرێبەندی هاوسەرێتی دیارکراوە، بەڵام ئەگەر دیاری نەکرابوو، یان لە بنەڕەتەوە نکوڵی لێکرا، ئەوە مارەیی هاوشێوەی دەدرێتێ.

٢. ئەگەر خوازبێنیکار پێش بەستنی گرێبەندەکە بڕێك پارە یان (شتومەك)ی بەناوی مارەییەوە بەدەزگیرانەکەی دابێت، پاشان لایەنێکی گرێبەندەکە لە بەستنی گرێبەندەکە پاشگەز بووەوە، یان مرد، ئەوا دەتوانرێ ئەو شتومەکە وەربگیرێتەوە، ئەگەر بەکاریش برابوو، لە جیاتییەکەی وەردەگیرێتەوە.

٣. حوکمەکانی خەڵات(الهبة) بەسەر دیارییەکان (الهدایا)دا پەیڕەو دەکرێت.

لە(م٢٠) دا هاتووە:

١-دروستە مارەیی هەمووی یان هەندێکی پێشبخرێت یان دوابخرێت. لەکاتی نەبوونی دەق لەوبارەیەوە ئەوا پەیڕەوی نەریت دەکرێت.

٢-ماوەی دیارکراو لە گرێبەندەکەدا، بۆ شایستەبوونی مارەیی، بەمردن، یاخود بە تەڵاقدان بەسەردەچێت (یسقط).

هەروەها لە(م٢١)دا هاتووە کە: (ژن بە چونەلای یاخود بەمردنی ژن و مێرد یەکێکیان شایستەی هەموو مارەیی دیاری کراوە و شایستەی نیوەی مارەیی

---

المحلى (الفقه الظاهري) لابن حزم ٤٨١/٩ وما يليها.

المغني (الفقه الحنبلي) لابن قدامة ٦٧٩/٦ وما يليها.

دیاریکراویشه بەتەڵاقدانی پێش چوونەلای).
لە (م٢٢)دا هاتووە:
(ئەگەر، دوای چوونەلا، لێکجیابوونەوە لە گرێبەندێکی پوچەڵ(فاسد)دا رووی دا، مارەییەکەش دیارکرابوو، ئەوا لە هەردوو مارەیی دیارکراوو مارەیی هاوشێوە، کامیان کەمتر بوو، ئەوەیان وەردەگیرێ، بەڵام ئەگەر مارەییەکە دیارنەکرابوو، ئەوە لەو بارەدا، مارەیی هاوشێوەی پێ دەدرێت).

## دووەم بەخشش (المتعە):

بەخشش (متعە) لەمافە ماڵییەکانی ئافرەتە، لەرووی زمانەوانییەوە مەبەست لێی هەموو ئەو شتانەیە مرۆڤ لێی سوودمەند دەبێت لەماڵو شتی دیکە.
لەرووی زاراوەی شەرعیشەوە بریتیە لەو ماڵەی مێرد بەیداتە ژنە تەڵاقدراوەکەی کە پێش چوونەلاو بەر لەدیاریکردنی مارەیی بۆی بەهۆی ئەمەوە لێك جودا بوونەتەوە نەك بەهۆی ئافرەتەکەوە.
لەبەر رۆشنایی ئەم پێناسەیەدا بۆ پێویستبوونی بەخشش بۆ ئافرەتە تەڵاقدراوەکە لەسەر مێردەکەی دەبێت ئەم مەرجانە بێتە دی:
١-دەبێت هاوسەرگیریەکە دروست بێت چونکە جیابوونەوە لەهاوسەرگیری پوچەڵ یان بەتاڵدا پێش چوونەلاو بەر لە دیاریکردنی مارەیی هیچ شتێك لەسەر مێردەکە پێویست ناکات.
٢-باس نەکردنی مارەیی دروست لەپێکهێنانی هاوسەرگیریدا، بەڵام ئەگەر هاتوو باس کرابوو ئەوا هەمووی بەچوونەلا دەسەلمێتو بۆ دووبەشیش دابەش دەبێت ئەگەر پێش چوونەلا تەڵاقدرابوو نیوەی بۆ ژنەکەو نیوەکەی تری بۆ مێردەکە دەبێت.

٣- دەبێت جیابوونەوەکە پێش چوونەلا بێت، ئەم مەرجە بۆ پێویستبوونی بەخشش دەبێت، بەڵام وەك بەباشزانین (استحباب) هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان ئەوەی جیابوونەوەکە پێش چوونەلا بێت یان پاش چوونەلا، لەهەردوو حاڵەتەکەدا شایستەی بەخششەکەیە بەپێی بۆچوونی پەسەند لەفیقهی ئیسلامیدا.

٤-نابێت جیابوونەوەکە بەهۆی ئافرەتەکەوە بوبێت، وەك هەڵگەڕانەوەی لەئاینی ئیسلام، یاخود داواکردنی جیابوونەوە لەڕێگەی دادگاوە لەکاتێکدا کەم و کورتی لەپیاوەکەیدا نەبێت[١].

٥-نابێت جیابوونەوەکە بەهۆی مردنەوە بێت، ئەگەر وابوو ئەوا مارەیی هاوشێوەی بۆ هەیە وەك پێوانە لەگەڵ چوونەلا، وەك ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ)و ئیبن مەسعود بەوە داوەریان کردو لەباسی حوکمەکانی مارەیدا لەم بابەتە دواین.

**سەرچاوەی شەرعی پێویستبوونی بەخشش (المصدر الشرعي لوجوب المتعه):**

سەرچاوەی سەرەکی بەخشش (متعە)ی ئافرەت بەشێوەیەکی تایبەت وەك ئەوەی لەحاڵەتی تەڵاقدا هەیە پێش چوونەلاو دیاریکردنی مارەیی، بەشێوەیەکی گشتی هەروەك ئەوەی لەتەڵاقدا هەیە بەرەهایی بریتیە لەقورئانی پیرۆز، خوای گەورە لەچەندین ئایەتدا فەرمانی کردووە بەبەخشش (متعە)، لەوانە:

خوای گەورە دەفەرموێت: (لاجُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِنْ طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ[٢] أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ[٣] قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ[١] قَدَرُهُ مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً[٢] عَلَى الْمُحْسِنِينَ)[٣].

---

[١] لەکتێبی (الانوار)ی عەلامە اردبیلی ٢/١٤٠: (هەموو جیابوونەوەیەك لە ئافرەتەکەوە بێت یان ئەو هۆکاری بێت بەخششی نابڕێتێ).

[٢] لەخوێندنەوەی (حمزة والكسائي)دا: (وشەی (تماسوهن) بەواتای (جامعوهن) چوونەلا هاتووە. مجمع البيان في تفسير البيان للطبري (ابي علي الفضل بن الحسن) ١/٣٣٩.

[٣] ئەوەی توانای زۆرە بەهۆی دەوڵەمەندیەوە.

هەروەها فەرموویەتی: ( وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ )[4]

لەئایەتێکی دیکە دەفەرمووێت: ( يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ[5] وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً [6]* وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْراً عَظِيماً ).

لەئایەتێکی دیکە دەفەرمووێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ[7] وَسَرِّحُوهُنَّ[8] سَرَاحاً جَمِيلاً ).[9]

**بڕی بەخشش (مقدار المتعه):**

ئاشکرایە کەبەخشش (المتعه) بریتیە لەبری مارەیی و مارەیی هاوشێوە لەحاڵەتی باس نەکردنی مارەیی راستداو نەچوونەلاو پاشان تەڵاقدان، هەر لەجیاتی دانانێك حوکمی لەجیاتی دانراوەکەی هەیە، پێشتر بەدرێژی حوکمی لەجیاتی دانراو (المبدل –کەمارەییە– باسمان کرد، لەبەر رۆشنایی ئەمەدا دیاریکردنی بەخشش بڕەکەی (رادەکەی)و چۆنیەتیەکەی (جۆرەکەی) وازلێهێنراوە بۆ نەریتی باوی شوێنی ژن و مێردەکە، لەگەڵ رەچاوکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و هاوشێوەکانی و توانای ماڵی مێردەکەو رەوشی ئابووری وڵاتەکەیان، ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانیان

---

[1] ئەوەی توانای کەمەوە بەهۆی هەژاریەوە.

[2] جەختکردنە لەپێویستبوون.

[3] سورة البقرة:٢٣٦

[4] سورة البقرة:٢٤١

[5] واتە بەخشش(متعة)ی تەڵاق.

[6] واتە بەبێ زیانگەیاندن.

[7] واتە ئەگەر مارەیی (صداق)یان بۆ دیاری نەکرابوو، چونکە ئەگەر دیاری کرابا ئەوا نیوەیان پێدەدرا.

[8] واتە بەبێ زیانگەیاندن دەستبەرداریان بن.

[9] سورة الاحزاب: ٤٩.

لەسەر دیاریکردنی رادەو چۆنیەتی ئەوا دادوەر یەکلای دەکاتەوەو دیاری دەکات.[1]

**فەلسەفەی بەخشش (حکمە المتعە):**

بەهرەمەندکردن قەرەبووە لەمێردەوە بۆ ژنە تەڵاقدراوەکەی لەبەرانبەر ئەو زیانە ئەدەبی (مەعنەوی)ە پێی گەیشتووە بەهۆی تەڵاقدرانیەوە، چونکە تەڵاق جگە لەوەی زیان بەئافرەتە تەڵاقدراوەکە دەگەیەنێت لەرووی دەروونیەوە لەهەمان کاتدا لەپایەی کەم دەکاتەوەو کەمتر خەڵك ویستی خواستنیانی دەبێت لەبەر ئەوەی تەڵاقدراوە با ئەو ئافرەتە هیچ کەمتەرخەمیکی نەبووبێت کەبەهۆیەوە تەڵاق درابێت.

**حوکمی بەخشش (حکم المتعە):**

هیچ را جیاییەك نیە لەوەدا کە بەخشش بۆ ئەو ئافرەتەی پێش چونەلا تەڵاقدراوەو مارەییەکەی دیاری نەکراوە، هەروەك ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆز لەسورەتی (البقرة)دا[2] باسی دەکات، بەڵام لەئایەتەکانی دیکە ئەوە دەخوێندرێتەوە کەدروستە کۆکردنەوە لەنێوان هەموو مارەیی یاخود هەندێکی لەگەڵ بەخشش، لەمەشدا زانایانی شەریعەت بۆچوونیان جیاواز بووە، هەیانە وتوویەتی: بەخشش بۆ هەموو تەڵاقدراوێکە جگە لەو تەڵاقدراوەی کە مارەییەکەی دیاری کراوە، ئەگەر پێش چوونەلا تەڵاقدرا ئەوا نیوەی مارەییەکەی بۆ هەیەو بەخشش نایگرێتەوە[3]، هەیاشیانە وتوویەتی: بەخشش باشترە (مستحب)ە بۆ هەموو ئافرەتێکی تەڵاقدراو باهەموو مارەیەکەشی پێ بدرێت یان هەندێکی وەك کارکردن بە گشتگیری فەرمایشتەکەی خوای گەورە: (وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ).[4]

---

[1] تحفة المحتاج سەرچاوەی پێشوو ٤١٧/٧.

[2] الآية (٢٣٦).

[3] مجمع البيان. سەرچاوەی پێشوو ٣٣٩/١.

[4] سورة البقرة: ٢٤١.

وایدەبینم کەبۆچوونی پەسەند ئەوەیە بەخشش پێویستە لەحاڵەتی تەڵاق پێش روودانی چوونەلاو باس نەکردنی مارەیی راستو، جگە لەوحاڵەتە بەباشزانراوە (مستحبە) بۆ هەموو ئافرەتێکی تەڵاقدراو لەبەر ئەو فەلسەفەیەی خستمانە روو.

**نەهێڵەرەکانی بەخشش (مسقطات المتعة):**

هەموو ئەو شتانەی مارەیی پێ نامێنێت بەهەمان شێوە بەخششی پێ نامێنێت چونکە لەبری ئەوەو لەبر دانراو هەمان حوکمی لەبردانەری هەیە.[1]

**هەڵوێستی یاسا لەبەخشش (موقف القانون من المتعه):**

یاسای باری کەسیی عێراقی بەرکار بەروونی باسی بابەتی بەخششی نەکردووە بەو دەربڕینە، بەڵام لەبەرانبەر ئەوەدا دەقی هەندێك حوکمی تێدا هاتووە کەنزیکە لەحوکمەکانی بەخشش لەرووی مەبەستەوە، لە(ب٣)ی مادە (٣٩)دا هاتووە کە: (ئەگەر مێرد، ژنەکەی تەڵاقدا، دادگا بۆی ساغ بووەوە کە پیاوەکە خەتابارە لە تەڵاقدانی (واتە تەڵاقەکە بیانوویەکی شەرعی نەبوو) ژنەکە بەو هۆیەوە تووشی زیان بووە، دادگا لەسەر ئەو داوایەی ژنەکە پێشکەشی دەکات، بەوەی کە پیاوەکەی تەڵاقی داوە حوکم دەدات بەقەرەبوویەك کە گونجاو بێت لەگەڵ باری دارایی و پلەی خەتاباری توندوتیژییەکەی وهەمووی مەزەندە دەکرێت بەمەرجێك کەمتر نەبێ لە بژێوی دوو ساڵ و، ئەمە جگە لە مافە سەلمێنراوەکانی دیکەی.

---

[1] سەبارەت بەبابەتی بەخشش بڕوانە ئەم سەرچاوانە: الجامع لاحكام القران للقرطبي (ابي عبدالله محمد بن أحمد) ٣/١٩٧ وما يليها. مجمع البيان للطبري (ابي علي الفضل بن الحسن) ١/٣٣٩ وما يليها.
تحفة المحتاج. المرجع السابق ٧/٤١٥ وما يليها. الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية المرجع السابق ٢/٢١١ وما يليها. المغني لابن قدامة المرجع السابق ٦/٧١٥ وما يليها. المحلى لابن حزم المرجع السابق ٩/٤٨١ وما يليها.

## سێیەم: بژێوی ژن (نفقه الزوجه):

یەکێك لەپابەندیە داراییەکانی سەر شانی مێرد لەهاوسەرگیری دروستدا کەهیچ ڕێگریەکی شەرعی نەبێت بریتیە لە دابیننکردنی بژێوی.

بژێوی (النفقه) لەرووی زمانەوانیەوە: بنچینەی وشەکە یان ئەوەتا لە (النفوق)ەوە وەرگیراوە کەبەمانای تیاچوون(الهلاك) دێت هەروەك وتراوە (نفق المال اذا هلك)، یاخود لە (النفاق)ەوە هاتووە کەئەویش رەواج پێدانە هەروەك وتراوە (نُفقت السلعة) واتە رەواجی پێدا.[1]

لەرووی زاراوەی شەرعی (ویاسایی)ەوە: ناوی ئەوەیە کەمێرد بۆ هاوسەرەکەیو منداڵەکانیو باوانی یاخود جگە لەوان کەئەرکی بژێوی لەسەر ئەم بێت خەرجی دەکات.

ئاشکرایە پەیوەندیەك هەیە لەنێوان ئەو دوو واتایەدا (زمانەوانیو شەرعی) لەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤی دیکەی خەرج دەکات بەتیاچوونی ماڵی بژێوی دەرو رەواجدانی حاڵی بژێوی دراو لەبژێوی هاوسەردا، هیچ بیانویەك نیە بۆ ئەژمارکردنی ئەو پێداویستیانەی کەبژێوی دەیانگرێتەوە، چونکە بریتیە لەپێداویستیەکانی ژیانی هاوسەریو ئەوەی زۆر پێویستە بۆ هاوسەرەکەو مێردەکەو منداڵەکانیان، ئەم پێداویستیانەی ژیانی هاوسەریش لەبەر رۆشنایی نەریتی باوی هەر وڵاتێكو لەهەر کاتو جێگایەکدا بەپێی رەوشی ئابووری ئەو وڵاتەو توانای دارایی پیاوەکەو پێگەی کۆمەڵایەتی ژنەکە دیاری دەکرێت.

---

[1] لسان العرب لابن منظور فصل النون حرف القاف.

**مەرجەکانی پێویستبوونی بژێوی هاوسەر (شروگ وجوب نفقە الزوجە):**

بۆ پێویستبوونی بژێوی هاوسەر چەند مەرجێك هەیە کەگرنگترینیان ئەمانەیە:

١ـ دەبێت هاوسەرگیریەکە دروست بێت، چونکە بژێوی‌و شوێنی نیشتەجێ بوون لەهاوسەرگیری پوچەڵدا نیەو لەماوەی چاوەڕوانی هاوسەرگیری پوچەڵدا نیە.

٢ـ نابێت هاوسەرەکە لاسار (ناشز) بێت بە لاساریەکی سەلمێنراو.

٣ـ توانای دارایی مێردەکە، ئەگەر مێردەکە هەژار بوو، توانای نەبوو کار بکات ئەوا بژێوی هاوسەرەکەی لەسەر نابێت، بەڵکو لەم حاڵەتەدا مافی داوای جیابوونەوە لەدادگا دەدرێتە ژنەکە ئەگەر ویستی.

شایانی باسە کەهەندێك لەزانایان[1] بۆ ئەوەچوون کەبژێوی مێرد لەو حاڵەتەدا لەسەر ژنەکە پێویستە، چونکە خوای گەورە بژێوی پەیوەست کردووە بەمیراتەوە، لەبەر ئەوە هەروەك چۆن ژنەکە ئەگەر مێردەکەی مردو ماڵی هەبوو دەبێتە میراتگری، بەهەمان شێوە بژێوی ئەو پیاوەی دەکەوێتە ئەستۆ ئەگەر لەرووی داراییەوە توانای هەبوو، ئەمەش وەك کارکردن بەبنەمای (الغُومُ بالغُنم) قورئانی پیرۆزیش بەشێوەیەکی روون ئاماژەی بۆ ئەم حوکمە کردووە: (وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ)[2] فەرزبوونی بژێوی لەدایکبوو لەسەر ئەو کەسەی دەبێتە میراتگری ئەگەر باوکی مرد یاخود توانای بژێویدانی نەبوو.

پرۆژە یاسای عەرەبی یەکگرتووی باری کەسیش ئەم بۆچوونەی وەرگرتووەو تێیدا هاتووە(٥٢/ج): (ئەو ژنەی توانای هەیە لەسەری پێویست دەکرێت بژێوی

---

[1] وەك (ابن حزم الظاهري) لەکتێبەکەیدا المحلى (٩٢/١٠): دەڵێت: (ئەگەر مێردەکە توانای بژێویدانی خۆی نەبوو ژنەکەشی دەوڵەمەند بوو ئەوا بژێویەکەی لەسەر دەبێت‌و هیچ لەوەشی بۆ ناگێڕێتەوە ئەگەر دواتر هەیبوو). بەڵگەشی بەم ئایەتە هێناوەتەوە (وعلى الوارث مثل ذلك).

[2] سورة البقرة:٢٣٣.

خێـزان ئەگـەر سـامانی هـەبوو)[1]، ئاشـکرایە کـەخێزان ژن‌و مێـردو منداڵـەکانیان دەگرێتەوە.

**سەرچاوەی شەرعی بژێوی هاوسەر (المصدر الشرعی لنفقه الزوجه):**

سەرچاوەی سەرەکی شـەرعی پێویسـتبوونی بـژێوی هاوسـەر بریتیـە لـەقورئانی پیرۆز پاشان سوونەتی پێغەمبەر و کۆدەنگی‌و عاقڵمەندی (المعقول) جەختی لەسـەر دەکەنەوە.

أ- قورئانی پیرۆز:

چەندین ئایەت لەقورئاندا هاتووە کەفەرمان بەمێرد دەکـات بـژێوی هاوسـەرەکەی دابین بکات کەلەگەڵیدا دەژی یـاخود تـەڵاقی داوەو مـاوەی چـاوەڕوانیەکەی کۆتـایی نەهاتووە، لەو ئایەتانەش:

خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ)[2].

لەئایەتێکی دیکەدا دەفەرمووێت:(أَسْكِنُوهُنَّ[3] مِنْ حَيْثُ سَكَنْتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ[4] وَلا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِنْ كُنَّ أُولاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ )[5].

جێی ئامـاژەیـە ئـەو مەرجـەی لـەکۆتایی ئـەم ئایەتـەدا هـاتووە بـەپێی بۆچـوونی پەسەند واتای پێچەوانە ناگەیەنێت، بەڵکو بژێوی ئەو ئافرەتە پێویست دەکات لەسەر

---

[1] بڕوانە: المجلة العربية للفقه والقضاء. العدد الثاني السنة الثانية تشرين الاول ١٩٨٥.
[2] سورة البقرة /٢٣٣.
[3] واتە ئافرەتە تەڵاقدراوەکان لەماوەی چاوەڕوانیدا.
[4] واتە دەسەڵاتو توانای ماڵیتان.
[5] سورة الطلاق/٦.

مێردەکەی ئیدی دووگیان بێت یان دووگیان نەبێت تا ئەو کاتەی ماوەی چاوەڕوانیەکەی تەواو دەبێت.

خوای گەورە دەفەرمووێت: (لِيُنْفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنْفِقْ[1] مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا مَا آتَاهَا).[2]

ئاشکرایە بژێوی ئافرەتی تەڵاقدارو ئیدی تەڵاقدانەکە لێکترازان (بائن) بێت یاخود گەڕانەوەیی (رجعی) لەو ماوەیەدا کەلەچاوەڕوانی (عیدە)دایە لەسەر مێردەکەی پێویستە، لەبەر ئەوە لەپێشترە کەئەو کاتەی لەگەڵیدا دەژیو هاوسەرێتیان بەردەوامە بژێوی بکێشێت.

ب - سونەتی پێغەمبەر:

فەرموودەی زۆر هەیە فەرمان بەمێرد دەکات بژێوی هاوسەرەکەی دابین بکات، لەوانە:

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (اتقوا الله في النساء فأنكم اخذتموهن بأمانة الله واستحللتم فروجهن ولهن رزقهن وكسوتهن بالمعروف)[3]. واتە: سەبارەت ئافرەتان لەخوا بترسن ئێوە بەسپاردەی خودا ئەوانتان بردووەو داوێنیانتان بۆ حەڵاڵ بووەو لەسەرتانە بژێویانو جلو بەرگیان بەچاکە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (عن عَائِشَةَ أَنَّ هِنْدَ بِنْتَ عُتْبَةَ قالت: يا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ، وَلَيْسَ يُعْطِينِي ما يَكْفِينِي وَوَلَدِي إلا ما أَخَذْتُ منه وهو لا يَعْلَمُ، فقال: خُذِي ما يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ).[4] واتە: لەعائیشەوە دەگێڕنەوە هیندی کچی عوتبە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە، هێندەمان پێنادات

[1] واتە لەسەر شیردەرو تەڵاقدراوەکان تا ئەو کاتەی چاوەڕوانیەکەیان تەواو دەبێت.
[2] سورة الطلاق/٧.
[3] تهذيب الآثار للطبري ٦٢٧.
[4] صحيح البخاري، برقم (٥٠٤٩)، ٥/ ٢٠٥٢.

بەشی خۆم‌و منالّەکەم بکات مەگەر بەبێ ئاگاداری خۆی بیبەم، فەرمووی: ئەوەندەی بەشی خۆت‌و منالّەکەت دەکات ببە بەچاکی.

ج ـ کۆدەنگی:

زانایـانی شـەریعەت لەسـەرەتای ئیسـلامەوە کـۆدەنگن لەسـەر پێویسـتبوونی کارکردن بەوە قورئانی پیرۆز فەرمانی پێکردووەو سوننەتی پێغەمبەر جەختی لەسەر کردۆتەوە لەبژێوی ئافرەت لەسەر مێردەکەی.

د ـ عاقڵمەندی (المعقول):

عـەقڵی سـاغ فـەرمان بەپابەنـدبوونی مێـرد بـەدابینکردنی بـژێوی هاوسـەرەکەی دەکـات کەپەیوەنـدیان بەیەکـەوە هەیـەو بەگرێبەنـدی هاوسـەرێتی بەیەکـەوە بەستراوەنەتەوەو بەهۆی ئەوەوە وەك بەندکراوی ئەوی لێهاتووە.

**حوکمی بژێوی هاوسەر (حكم نفقة الزوجة):**

لەو بەلّگانەی خرانە روو ئەوە دەخوێندرێتەوە کەحوکمی بـژێوی هاوسـەر لەسـەر مێردەکەی پێویست (وجوب)ە کەهاوتای فەرزە ئەگەر هاتوو مەرجەکانی هاتنـە دیو رێگریەکانی بوونیان نەبوو، دەبێتە قەرز لەئەستۆی مێردەکەدا لەرۆژانی بژێوی نەداندا کەلّەکە دەبێت‌و، ئەم بژێویە کەلّەکە بووە بەسەرناچێت مەگەر بەدانەوەی یان گەردن ئازا کردنی، ئافرەتەکە مافی بەرزکردنەوەی داوای لەدادگا هەیە لەدژی مێردەکەی کە لەرووی داراییەوە هەبوو بێت‌و بژێویان نەکێشێت تا لـەرێگای دادگـاوە ناچـاری بکـات بژێویان بکێشێت یاخود لـەرێی دادگـاوە لێـك جیـا ببنـەوە ئەگـەر هـاتوو ئافرەتەکـە جیابوونـەوەی هەڵبـژارد، ئافرەتەکـە مـافی ناپەزایـەتی دەربڕینـی هەیـە لـەدژی مێردەکەی لەحاڵەتی دیار نەبوون‌و نەبوونی داهاتێکی لەبەر دەستدا کە بژێوی خۆی‌و منالّەکانی لێ بدات ئەگەر هاتوو رێگریـەك نـەبوو لەرێگریـەکانی پێویسـتبوونی بـژێوی وەك لاساریی.

### چ کاتێک بژێوی هاوسەر لەسەر مێردەکەی پێویست دەبێت (متى تجب نفقە الزوجە على زوجها)؟؛

بۆچوونی زانایان لەهەمبەر دیاریکردنی وادەی پێویستبوونی جیاوازە، هەیانە بۆ ئەوە چووە کەبەبەستنی گرێبەندی هاوسەرگیری دروست پێویست دەبێت، ئیدی ژنەکە موسڵمان بێت یان ئەهلی کتاب، یاخود منداڵ بێت یان گەورە، یان لەشساغ بێت یاخود نەخۆش- بچێتە ماڵی مێردەکەیەوە یان نا، ئەگەر داوای لێنەکرابوو بگوازرێتەوە بۆ ماڵی مێردەکەیو ئەو بەهۆی بیانوویەکی نارەواوە رێگر بوو، ئیدی مێردەکە تەواو (صحیح) بێت یاخود پەککەوتە(عنین) (نەتوانێت بچێتە لای ژنەکەی)، یان بێ ئەندامی نێرینە(مجبوب)ی نەبێت ئەندامەکەی بچوك بێت کەتوانای سەرجێی هاوسەری (المعاشرە الزوجیە) نەبێت،[1] چونکە خوای گەورە بژێوی پەیوەست کردووە بەخودی هاوسەرگیریەوە نەك بەپەیوەندی سێکسی (جنسی) یاخود (الاحتباس)ەوە، هەروەك ئەو گشتگیریو رەهاییە لەسەرچاوەکانی پێویستبوونی بژێویدا هاتووە، یاسای باری کەسیی عەرەبی یەکگرتوو ئەم ئاراستەیەی گرتووەو لە (م٥٢/١)دا هاتووە کە: (بژێوی هاوسەر لەسەر مێردەکەی پێویست دەبێت لەکاتی گرێبەندی راستەوە) بەهەمان شێوە یاسادانەری عێراقیش لە (م٢٣)ی یاسای باری کەسیدا هاتووە: (بژێوی هاوسەر لەسەر مێردەکەی پێویست دەبێت لەکاتی گرێبەندی راستەقینەوە بالەماڵی کەسو کاریشدا بێت، مەگەر مێردەکەی داوای لێبکات بگوازرێتەوە بۆ ماڵەکەیو ئەویش بەبێ مافێکی رەوا رێگر بێت).

---

[1] لە المحلى (١٠/٨٨)هاتووە: پیاو بژێوی ژنەکەی دەدات هەر لەکاتی گرێبەندی مارە برینەوە، جا بیگوازرێتەوە یان نا، ئەگەریش لەلانی خۆیدا بێت لاسار بێت یان نالاسار، دەوڵەمەند بێت یان هەژار، باوکی مابێت یان هەتیوو بێت، بەڵگەی ئەمەش ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ دەفەرمووێت: (ولهن علیکم رزقهن وکسوتهن بالمعروف) واتە: رۆزیو دلپۆشینیان بەچاکە لەسەرتانە.

هەشیانە بۆ ئەوە چووە کەهۆکاری شایستەبوونی ژنەکە بۆ بژێوی بریتیە لە گلدانەوەی لە لای خۆی بۆ ماف و سوودی خۆی، بەپێی ئەم ئاراستەیە بژێوی ئافرەتێك پێویست نابێت کە بۆ سەرجێی (للمعاشرة الزوجیة) دەست نەدات لەبەر رێگرێکی سروشتی وەك منداڵ بێت یاخود رێگرییەك وەك نەخۆشی، بۆچوونی یەکەم بریتیە لەبۆچوونی پەسەند لەبەر بەهێزی بەڵگەکانی.

**بڕی بژێوی (مقدار النفقه):**

شەریعەتی ئیسلام بڕی بژێوی و جۆرەکەی دیاری نەکردووە، چونکە بژێوی لەرووی ئەندازەو چۆنیەتیەوە بەپێی شوێن و کات و باری ئابووری ئەو وڵاتەی ژن و مێردەکەی تێدا نیشتەجێن دەگۆڕێت، لەگەڵ رەچاوکردنی توانای پیاوەکەو پێگەی کۆمەڵایەتی ژنەکە.

بەم پێیە پێوەر بۆ دیاریکردنی بڕو چۆنیەتی بژێوی بریتیە لەنەریت و توانای ماڵی مێردەکەو پێگەی کۆمەڵایەتی ژنەکە، هەروەك لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: (لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنْفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا مَا آتَاهَا) چونکە مەبەست لە (معروف) ئەوە لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: (وعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وكِسْوَتُهُنَّ بالمعروف).[1]

---

[1] – سورة البقرة/٢٣٣.

# دەروازەی دووەم:

# مافەکانی مێرد لەسەر هاوسەرەکەی

## ( حقوق الزوج على زوجته )

هەروەك چۆن ژن مافی دارایی و نا دارایی هەبوو، بەهەمان شێوە مێردیش مافی هەیە، بەزۆری مافەکانی مەعنەوین، دەکرێت مادی بێت کاتێك کە مێرد توانای مادی نەبێتو هاوسەرەکەی توانای دارایی هەبێت.

گرنگترینی ئەو مافانە:

١–مافی گوێڕایەڵی (حق الطاعة): مافی مێردە لەسەر هاوسەرەکەی کە گوێڕایەڵی بێت لەهەموو ئەو شتانەی شوێنەواری هاوسەرگیرین، لەسەری نیە گوێڕایەڵبوون لەو شتانەدا کەبەهۆی هاوسەرگیریەوە نین، هەروەها لەو شتانەدا کەسەرپێچی و پیچەوانەی فەرمانی خوداو و رێگریەکانیەتیو پێچەوانەشە لەگەڵ پەیڕەوی گشتیو ئادابی گشتی، وەك خواردنەوەی سەرخۆشکەرەکانو یاری قومارو خستنە رووی جەستە لەبەردەم نامەحرەمداو چوونەدەرەوە بەشێوەیەکی نەشیاو، بۆ هاوسەر نیە گوێڕایەڵی فەرمانی مێردەکەی بێت لەو جۆرە کارانەو هاوشێوەیاندا لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)کەدەفەرمووێت: (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق).[1] واتە: گوێڕایەڵبوون بۆ هیچ دروستکراوێك نیە لەکارێکدا کەسەرپێچی دروستکاری تێدا بێت. بەلاّم لەکاروبارە شەرعیەکاندا کەپەیوەندارن بەهاوسەرگیریەوە ئەوا تا ئەو کاتەی مێردەکە پەیوەست دەبێت بەمافەکانی سەرشانیەوە کەلەدەروازەی یەکەمدا خرانە

---

[1] – صحيح، مشكاة المصابيح، الألباني ٣٦٢٤.

روو، لەسەر هاوسەرەکەیەتی لەسنووری ئەوەی پەیماننامەی هاوسەرگیری پێویستی دەکات گوێڕایەڵی بێت.

٢- لەسەر هاوسەر پێویستە ئەو داواکاریانەی مێردەکەی جێبەجێ بکات کەلەسنووری بەرپرسیارێتی هاوسەرێتیو خێزاندانو لەپێناوی خێزاندایە، بەوپێیەی سەرۆکی خێزانە بەپێی توانا دارایيو هێزەی جەستەیيو لەبەدەستهێنانی پێویستی هاوسەرەکەیو منداڵەکانیانو بەرگری لەوو لەمنداڵەکان دەکات هەرکاتێك خێزان رووبەڕووی مەترسی دەستدرێژی کردنە سەر ببێتەوە، ئەم بەرپرسیارێتی دابینکردنی خەرجيو بەرگریکردنە ئەوەیە کەقورئانی پیرۆز ناوی لێناوە (قوامة)خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ﴾، چاکەمەندی پیاو لەو پایەیەدا بەهۆی کەمو کورتیەك لە پێگەی ئافرەت یان کەرامەتی کەسیدا نیە، بەڵکو لەبەر ئەو هێزەیە کەپیاو هەیەتی لەدابینکردنی بژێویو بەرگری لەخێزان، مەبەستیش باڵادەستی نیە بەسەر ناتەواو (ناقص)ێکدا وەك باوە، هاوسەر کەم عەقڵ نیەو شیاوێتی (اهلیە)ی ناتەواو نیە تا مێردەکەی لەرووی یاساییو شەرعیەوە بەسەریدا باڵادەست بێت، ئەویش لەئەستۆگری دارایی سەربەخۆی خۆی هەیە کەجیاوازە لەهی مێردەکەی، بۆی هەیە بەسەربەستی تەواوەوە و بەبێ پێویستبوونی رەزامەندی مێردەکەی هەڵسو کەوتی پێوە بکات، ئافرەتیش وەك پیاو بۆی هەیە هەموو پلەو پایەیەك لەحکومەتدا وەربگرێت بەبێ جیاوازی، هەروەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿الْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ﴾، مەبەست سەرپەرشتیارێتی گشتی (الولاية العامة)یە بەنزیکایەتی، فەرمانکردن بەچاکە واتە ئەوەی خێروسوودی کۆمەڵگاو تاکی تێدایە، رێگریش لەخراپە واتە هەموو خراپەو زیانێك دوور بخرێتەوە لەکۆمەڵگاو تاك، بۆی هەیە لەپۆستی سەرۆکی وڵاتەوە

تا بچوکترین پۆست بەڕێوە ببات کەکاری ئەوانیش فەرمانکردنە بەچاکەو ڕێگریە لەخراپە.

٣- مافی مێرد لەتەمبێکردنی هاوسەرکەیدا ئەگەر تاوانێکی ئەخلاقی ئەنجامدا، هەروەك لەقورئانی پیرۆزدا باسی ئەم تەمبێکردن و سزا روشکێنە (عقوبة تعزيرية) کراوەو خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾[1].

خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرمانی کردووە بەسزا رووشکێنە یەك لەدوای یەکەکان بەریزبەندی ئەگەر ژنەکە کارێکی ئەنجامدا کەشایستەی ئەو سزایانە بێت، ئەمەش وەك پەرۆشی بۆ بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەرێتی و وێران نەکردنی دامەزراوەی خێزان بەسەر ئەوانەی تێیدان بەگەورەو بچوکەوە کەئەوان گوناهیان نیە تێیدا، ئەم کارەش بەم هەنگاوانە دەبێت:

**هەنگاوی یەکەم:** قورئانی پیرۆز فەرمانی کردووە مێرد لەحاڵەتی لاساری (نشوز)ی هاوسەرەکەیدا دەستپێشخەری بکات بەرەو ڕێگەی ئامۆژگاری و ڕێنمونی و ئاراستەکردن و ئاگادارکردنەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿واللاتي تخافون نشوزهن فعظوهن﴾ ئەم ڕێگەیە بریتیە لەیەکەم ئەرکەکانی گەورەی خێزان بۆ چاکسازی هەموو ئەوەی رووبەرووی خراپبوون دەبێت.

**هەنگاوی دووەم:** خوای گەورە فەرمانی کردووە بەمێرد شوێنی خەوتنی لەگەڵ هاوسەرەکی جێبهێڵێت: دەفەرمووێت: ﴿واهجروهن في المضاجع﴾ ئاشکرایە شوێنی نووستن جێگای سەرنج راکێشان (اغراء)ەو بەجێهێشتنی سزایەکی دەروونی

[1] - سورة النساء/٣٤.

رووشکێنە کەمێرد لەپێناوی بەئاگاهێنانەوەی هاوسـەرەکەی پـەنای بـۆ دەبـات، کـە دووچاری بێبەشبوون لەنوستن لەگەڵی دەبێتەوە کە ترۆپکی پەیوەندی هاوسـەرێتیە لەسۆزو پەرۆشیو ئارامیەوە، لەهەمان کاتدا پەروەردەی ئەخلاقی ئیسـلامی فـەرمان بەمێردەکە دەکات پابەند بێت بەمانەوە:

أ– بەجێهێشتنەکە تەنها شوێنی پێکەوە نووستنی ژنو مێردەکە بگرێتەوە.

ب– بەبەرچـاوی منداڵەکانیـەوە بـەجێی نـەهێڵێت تـا کاریگـەری نـەبێت لەسـەر ئاکاریانو خراپەو بەدکاری لەدەروونیاندا نەچێنێت.

جـ – بەجێهێشـتنەکە لەبـەردەم کەسـانی بێگانـەدا نـەبێت کەبەهۆیـەوە ژنەکـە سەرشۆڕ بکاتو لەپایەی کەم بکاتەوەو ئەویش زیاتر بەرەو لاساری بـڕوات، چـونکە مەبەسـت چارەسـەرکردنی لاسـاریەکەیە نـەك سەرشـۆڕکردنی ژنەکـەو خراپبـوونی منداڵەکان.

**لە هەنگاوی سێیەمدا:** قورئان فەرمان بەمێردەکە دەکات لەژنەکەی بدات لێـدانێك ئێسك نەشکێنێتو پێست بریندار نەکات، ئەگـەر هـاتوو تاوانـە ئەخلاقیەکـەی ژنەکـە ئەنجامیدابوو ئەوەی دەخواست، چونکە مێرد لەم حاڵەتەدا لەبەردەم سێ بژاردەدایە:

أ– یان ئەوەتا خۆی ژنەکەی سزا بدات وەك باسمان کرد.

ب– یان داوایەك لەدادگا بەرزبکاتەوەو لەم بژاردەیەدا زیـان بـە ناوبـانگی خێزانـی ژنو مێردەکە دەگاتو ئایندەی ژنەکەش دەفەوتێنێت.

جـ – یـاخود ژنەکـەی تـەڵاق بـداتو مـاڵی هاوسـەری بشـێوێنێتو منداڵـەکانیان دەربەدەر بکاتو ئەو جۆرە زیانانەی تری لێ بکەوێتـەوە کەلەشـوێنەوارە خراپـەکانی تەڵاقدانە، هەندێك دەڵێن هەڵبژاردنی ڕێگای لێدان کارێکی دانایانـە نیـە، وەڵامـی ئـەم قسـەیەش ئەوەیـە لێـدان جـەنگێك نیـە لـەنێوان ژنو مێـردا بـەپێی دابو نەریتـە خراپـەکان، بـەڵکو تـەنها هەڕەشـەیە بـۆ ناچـارکردن (زجـر) و دووبارەنەکردنـەوەی هەڵەکەی، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) بەڵگەیـە لەسـەر ئـەم راسـتیە: (لایجلـد

احدكم امرأته جلد عبد ثم يُجامعها في آخر اليوم)[1] واتە: هیچ کام لەئێوە قامچی لەهاوسەرەکەی نەدات وەك قامچی لێدانی بەندەو پاشان بچێتە لای لەکۆتایی ڕۆژەکەدا. هەروەها دەفەرمووێت: (لايضرب الا اشراركم)[2] واتە: تەنها خراپەکارانتان لێدان بەکار دەهێنێت.

٤- مافی مێردە لەسەر ژنەکەی لەوەی کە ژنەکە بژێوی بکێشێت، ئەگەر هاتوو مێردەکە هەژار بووو توانای کارکردنی نەبوو، ژنەکەش لەڕووی داراییەوە توانای هەبوو، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾[3].

لەم ئایەتەدا خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەر باوکی منداڵ کەبژێوی شیردەرەکەی و پۆشاکی دابین بکات بەشێوەیەکی تەواو ئەمە سەرەڕای هەستانی بەشیرپێدانو بەخێوکردنی مناڵەکە، لەحاڵەتی نەبوونی باوك بەهۆی مردن یان بەهۆی هەژاریەوە، ئەوا میراتگری ئەو مناڵە بەرپرس دەبێت لەدابینکردنی خەرجی مناڵەکە، بژێوی و میراتی پێکەوە پەیوەست کردووەو دەفەرمووێت: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾ ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەرپرسیارێتی مرۆڤ لەبژێویدانی کەسانی تر لەسەر ئەو بنەمایەیە کەئەم میراتگری ئەوانە، بەو پێیەش کەژن میراتگری مێردەکەیەتی ئەگەر پێش ئەم مرد لەبەر ئەوە لەسەری پێویست دەبێت بژێوی مێردەکەی بکێشێت ئەگەر ئەم هەبوو بوو مێردەکەشی هەژار بوو.[4]

---

[1] - ينظر صحيح البخاري في فتح الباري/٢٦/٩/٣٠٢.

[2] - الشوكاني في نيل الاوطار ٦/٢٣٨.

[3] -سورة البقرة /٢٢٣.

[4] - المحلى لابن حزم الظاهري ١٠/٩٢.

٥- نابێت بەدەمیەوە نەیەت ژنەکە ئەگەر پیاوەکەی داوای چوونەلای لێکرد، مەگەر پاساوێکی شەرعی هەبێت، وەك ئەوەی لەخوێنی مانگانەدا بێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەهیکردووە لەو بەدەمەوە نەچوونە لەچەندین فەرموودەدا، لەوانە: (ما من رجل يدعو امرأته الى فراشها فتأبى عليه الا كان الذي في السماء (أي الله ساخطا عليها حتى يرضى عنها).[1] ) واتە: هەر پیاوێك داوا لەژنەکەی بکات بۆ چوونەلای و ئەویش رازی نەبێت ئەوا ئەوەی لەئاسمانەکانە (واتە خوای گەورە) لێی تورەیە تا ئەو کاتەی دڵی مێردەکەی رازی دەکات.

---

[1] - صحيح مسلم ٢/١٠٦٠.

# دەروازەی سێیەم:
# مافە هاوبەشەکانی ژن و مێرد
# (الحقوق الزوجية المشتركة)

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[1] واتە ئافرەتان مافیان هەیەو لەبەرانبەر ئەوەدا پابەندیان لەسەرە، بابەتی ئەوەی پابەندبوونی مێردە مافەکانی هاوسەرە، بەهەمان شێوە ئەوەی پابەندییە بۆ هاوسەرەکە مافەکانی مێردە، لەدەروازەی یەکەمدا مافە تایبەتەکانی هاوسەرمان لەسەر مێردەکەی باس کرد، لەدەروازەی دووەمیشدا باسمان لە مافە تایبەتەکانی مێرد لەسەر هاوسەرەکەیمان کرد، لەم دەروازەیەشدا باس لەو مافانە دەکەین کە بۆ هەردوولایە لەهەمان کاتدا، لەبەر ئەوە ناونراوە مافە هاوبەشەکان، زۆرینەی ئەم مافانەش مەعنەوین -مادی نین- گرنگترینیشیان بریتیە لەمانە:

مافی چێژ وەرگرتنی هەرلایەك لەبەرانبەرەکەی، ئەوەش ئەم مافانە دەگرێتەوە:

١- سەرجێی **(المعاشرة الجنسية)** کە ژنو مێرد هەردوولایان چێژ لەبەرانبەرەکەی دەبینێت، چونکە هەریەکەیان ئارەزووی سێکسی سروشتی خۆی هەیە، لەبەر ئەوە قورئان حەرامی کردووە لەسەر مێرد کەزیاتر لەچوار مانگ دووربێت لەهاوسەرەکەی، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ، وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾.[2]

هەروەها شەریعەتی ئیسلامی فەرزی کردووە لەسەر ژن گوێرایەڵی مێردەکەی بێت هەرکاتێ ئارەزووی پەیوەندی سێکسی هەبوو لەگەڵیدا، ئەمە ئەگەر پاساوێکی

---

[1] - سورة البقرة/٢٢٨.

[2] - سورة البقرة /٢٢٧.

شەرعی نەبوو کەببێتە رێگر وەك خوێنی مانگانە، قورئانی پیرۆز حەرامی کردووە پەیوەندی سێکسی لەکاتی بوونی سوڕی مانگانە (بێنوێژی)دا، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنْ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمْ اللَّهُ﴾.[1]

٢- **خۆشەویستی و رێزی بەرانبەرو سۆزو بەزەیی و ئارامی**: ئەمانە هەموویان لەشوێنەوارەکانی پەیوەندی هاوسەرێتین، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾.[2]

٣- **مافی میراتگرتن ( حق التوارث )**: : پەیوەندی هاوسەرێتی هۆکارێکە لەهۆکارەکانی میراتگرتن، هەر یەکێکیان مافی میراتگرتنی هەیە لەمیراتیەکەی ئەگەر بەرانبەرەکەی پێش ئەم مرد با چوونەلاش لەنێوانیاندا روونەدابێت، لەقورئانی پیرۆزدا ئەمە باسکراوە، خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمْ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكُمْ وَلَدٌ فَإِنْ كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُمْ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾[3]. شایانی باسە ئەو ژنەی بەشدار دەبێت لەپێکهێنانی لێجێماو (ترکە)ی مێردەکەیدا وەك ئەوەی فەرمانبەرە یاخود کاری بازرگانی یان پیشەسازی یان کشتوکاڵی یان هاوشێوەیان دەکات لەگەڵ مێردەکەیدا، پێویستە پێش دابەشکردنی لێجێماوەکە ئەوەی تایبەتە بەژنەکە بچەسپێت و بڕی ئەوەی شایستەیەتی دیاری بکرێت، ئەمەش لەرێگەی ئەو هاوبەشییەوە بەپێی بەڵگە یان نەریت یاخود بەپێی مەزەندەی کەسانی بەئەزموون، چونکە ئەوەی تایبەتە بەژنەکە

---

1 -سورة البقرة/٢٢٢

2 - سورة الروم/٢١

3 -سورة النساء/١٢.

لەلێجێماوەکە دەخرێتە پێش دانەوەی قەرزەکانو دابەشکردنی میراتیەکە، (ولـد)یش نێرو مێ دەگرێتەوە.

**٤ –مافی دایکو باوك هەردووکیان لە پێدانی بژێوی منداڵەکانیان بەیەکسانی ئەگەر هەردووکیان هەژار بوون هەروەك لەدەروازەی پاشتردا بەدرێژی باس لەمە دەکەین.**

**٥- مافی سەرپەرشتی ( حق الولایـة ):** پێویستە دایك سەرپەرشتیارێتی منداڵی پێنەگەیشتوو (قاصر) بکات پاش مردنـی بـاوك یـاخود دووربـوونی یـان لەدەسـتدانی شیاوێتیەکەی، چونکە ئەو لەپێشترە لەباپیرەو داپیرەو براکانو هەموو خزمانی پشت بەپێچەوانەی بۆچوونی زۆرینەی زانایان لەفیقهی ئیسلامیدا، چونکە بۆ دادگای عێراقی سەلماوە کەدایك لەهەمووان لەپێشترە لەپاش نـەمانی بـاوك، چـونکە خزمـانی پشـت ستەم لە منداڵی پێنەگەیشتوو دەکەنو بەناڕەوا مافیان دەخۆن.

٦– هەریەك لەژنو مێرد مـافی پـەروەردەکردنو تـەمبێکردنو هۆشـیارکردنەوەو فێرکردنی منداڵەکانیان بەشێوەیەکی یەکسان هەیە.

**٧– مافی ژنو ژنخوازی(حق المصـاهرة ):** یـەکێکی دیکـە لەمافـە هاوبەشـەکانی نێوان ژنو مێرد مافی پەیوەندی خزمایـەتی (حـق صـلة المصـاهرة)ە کەگرنگیەکـەی لەخزمایەتی کەمتر نیە لەرووی بـەهێزکردنی پەیوەندیـە کۆمەڵایەتیـەکانو یارمـەتیو دەستبارگرتنو هاوکاریو هاوخەمی.

لەبەر ئەوە حەرامە مێرد هاوسەرگیری بکـات لەگـەڵ بنەچـە (اصـول)ی ژنەکەیـدا بابەرەوسەرتریش بێتو لەگەڵ لقەکانیششیدا بابـەرەو خـوارتر بێـت، لـەو ئایەتانـەی گوزارشت لەم حەرامکردنە دەکات: (وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ [1] وَرَبَـائِبُكُمُ اللاَّتِـي فِـي حُجُـورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمْ اللاَّتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَإِنْ لَـمْ تَكُونُـوا دَخَلْـتُمْ بِهِـنَّ فَـلاَ جُنَـاحَ عَلَـيْكُمْ وَحَلاَئِـلُ أَبْنَائِكُمْ الَّذِينَ مِنْ أَصْلاَبِكُمْ وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُـورًا

[1] – واتە دایکانی ژنەکانتان بۆ حەرام بووە تا کۆتاییەکەی.

رَحِیمًا)[1]. شایانی باسە کە هەر کوڕێك کچێکی خواست بەئەنجامدانی گرێبەستی هاوسەرگیریەکە دایکی کچەکەی بۆ حەرام دەبێت، بەڵام هەر کەس هاوسەرگیری لەگەڵ دایکی کچەکەدا کرد ئەوا کچەکەی بەتەواوەتی بۆ حەرام نابێت ئەگەر هاتوو پێش چوونەلای لێك جیابوونەوە، حیکمەتی ئەمەش لەوەدایە کە کچ پێویستی بەیارمەتی دایکی هەیە لەکاروباری هاوسەرگیریداو خوای گەورە ویستویەتی کە مێرد تەنها بەگرێبەندی هاوسەرگیریەتی وەك کوڕیانی لێبێت، بەپێچەوانەی ئەوەوە دایك بەهۆی ئەزموونی رابوردوویەوە پێویستی بەکچەکەی نیە.

---

[1] – سورة النساء /٢٣.

# بەندی شەشەم

# بژێوی ڕەچەڵەك

# (النفقة النَسَبية)

مەبەست لەبژێوی ڕەچەڵەکی بژێوی بنەچە (اصول) و لقەکان (فروع) و خوێشـان (حواشـي) کەهۆکاری شـەرعی و یاسـاییان بـوونی ڕەچـەڵەکی شەرعیە لەنێوانیاندا .

توێژینەوەی ئەم بابەتە بۆ دوو دەروازە دابەش دەکەین، یەکەمیان تەرخان دەکەین بۆ ڕەچەڵەك، دووەمیشیان بۆ بژێوی ڕەچەڵەك .

## دەروازەی یەکەم:
## رەچەڵەک و هۆکارەکانی سەلماندنی
## (النسب وسُبل إثباته)

بنچینەی رەچەڵەك دووگیانیو منالبوونە، هیچ راجیایەك نیە لەنێو زانایانی شەریعەتو پسپۆرانی پزیشکی هاوچەرخ کەکەمترین ماوەی سکپڕی شەش مانگە، هەرمنالێك بەکەمتر لەو ماوەیە لەدایکبوو ئەوا رەچەڵەکەکەی بۆ ئەو کەسە ناچەسپێت کەبانگەشەی ئەوە دەکات بەپێی هاوسەرگیریی ئەو منالەیان بووە.

سەرچاوەی دیاریکردنی ئەم ماوەیەش دوو ئایەتە کەلەقورئانی پیرۆزدا هاتووە، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلاثُونَ شَهْرًا﴾[1].

لەئایەتەکەی دیکەشدا دەفەرمووێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنْ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾[2].

ئایەتی یەکەم ماوەی دووگیانیو شیرەخۆرەیی (فصال)ی بە سی مانگ دیاری کردووە، ئایەتی دووەمیش ماوەی شیرەخۆرەیی (فطام) بەدوو ساڵ دیاری کردووە، بەدەرکردنی ماوەی دوو ساڵەکە لە سی مانگەکە ئەوا شەش مانگ بۆ ماوەی دووگیانی دەمێنێتەوە، ئەم ماوەیەش لەبەرواری هاوسەرگیریانو توانای بەیەك گەیشتنیانو چوونەلا دەست پێدەکات، زانایانی شەریعەت لەمەدا بۆچوونی جیاوازیان نەبووەو زانستی هاوچەرخیش راستی ئەمەی سەلماندووە، بەڵام ماوەی هەرە زۆری

---

[1]- سورة الاحقاف / ٤٦.

[2]- سورة لقمان/ ١٤.

مانەوەی کۆرپەلە لەسکی دایکیدا پاش دروستبوونیو پێش لەدایکبوونی زانایانی شەریعەت بۆچوونی جیاوازیان هەبووە تێیدا[1].

## ڕێگاکانی سەلماندنی ڕەچەڵەک (طرق إثبات النسب):

بۆ سەلماندنی ڕەچەڵەك سێ ڕێگا هەیە، ئەوانیش: سەرجێی (الفراش) (هەبوونی هاوسەرگیریتی)، دانپێدانان (الاقرار)، بەڵگە (البینة).

**یەکەم: سەرجێ (هەبوونی هاوسەریتی) (الفراش (قیام الزوجیه)): مەبەست لێی لەم بابەتەدا ئەوەیە هاوسەریتی دروست هەبێت لەنێوان ژن و مێردەکەدا لەسەرەتای دووگیانبوونی بەمناڵەکەوە.**

**مەرجەکانی سەلماندنی ڕەچەڵەك بەسەرجێ (شروط ثبوت النسب بالفراش):-**

١- جێگەی سکپڕی ژن لەمێردەکەی لەوانە بێت کە توانای دووگیانبوونیان هەبێت، بەوەی مێردەکە باڵغو بێت، یاخود بەلانی کەمەوە هەرزەکار (مراهق) بێت، ئەگەر تەمەنی لەوە کەمتر بوو ئەوا ئەو ڕێگایە بوونی نابێت، چونکە چاوەڕوان ناکرێت ژنەکە لەو مێردە سکپڕ ببێت.

٢- ژنو مێردەکە پاش گرێبەندەکە توانای پێکەوە بوونیان هەبێت، چونکە گرێبەند بناغەی پەیوەندی نێوان ژنو مێردەو هۆکاری ڕاستەقینەی دووگیان بوون، ئەگەر نەدەتوانرا ئەو بەیەك گەیشتنە ڕوویداتو پاش تێپەڕبوونی شەش مانگ لەبەرواری هاوسەرگیریەکەوە ئەوا ڕەچەڵەکی لەو ناسەلمێت.

---

1- زاهریەکان وتوویانە درێژترین ماوەی دووگیانی نۆ مانگە بەپێی ڕۆژینە (المحلی/١٠/٣١٦)، هەندێك لەزانایانی مالکی وتوویانە درێژترین ماوەی ساڵێکی مانگیە (سنة قمرية) و پزیشکی هاوچەرخ بڕیاری لەمە داوەو لەگەڵ بۆچوونی هەندێك لەزانایانی شیعەی ئیمامیدا یەکدەگرێتەوە.(اللمعة الدمشقية ٥/٤٣٢)، حەنەفیەکان وتوویانە درێژترین ماوە دووساڵەو شافعیەکان وتوویانە درێژترین ماوە چوار ساڵە.

٣-توانای چوونەلا (دخول)ی هەبێت بەوەی ژن و مێردەکە یەکێکیان ڕێگرێك لەڕێگریەکانی چوونەلا لەئارادا نەبێت، وەك ئەوەی مێردەکە دوور بێت بۆ ماوەیەك پاش هاوسەرگیری و پێش چوونەلا یاخود منداڵ بێت و هاوشێوەی ئەوە.

٤-دەبێت ژنەکە پاش تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر مێژووی گرێبەندی هاوسەرگیریەکەدا منداڵەکەی ببێت، ئەگەر بەکەمتر لەو ماوەیە لەدایکبوو ئەوا ڕەچەڵەکەکەی ناسەلمێت، مەگەر بانگەشەی ئەوەی کردو نەسەلمێنرا کەبەهۆی پەیوەندی ناشەرعی (زینا)ەوە نەبووە و سەلماندنی ڕەچەڵەکەکە لەم حاڵەتەدا بە دانپێدانان (اقرار) دەبێت نەك بەسەرجێ (فراش).

٥-لەماوەیەکدا لەدایك ببێت کەزیاتر نەبێت لەزۆرترین ماوەی دووگیانی کەزانست و پزیشکی هاوچەرخ دیاریان کردووە و هەندێك لەزانایانی شەریعەت هەروەك باسمان کرد بڕیاریان لەسەر داوە، ئەگەر پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر هاوسەرگیری و توانای بەیەکگەیشتن (تلاقی)و چوونەلا (دخول) منداڵەکە لەدایکبوو ئەوا ڕەچەڵەکی ناسەلمێت.

ئەگەر مەرجێك لەم مەرجانەی باسکران نەهاتەدی ئەوا ڕەچەڵەکی ناسەلمێت.

**سەلماندنی ڕەچەڵەك بەچوونەلا نەهاوسەرگیری پوچەڵ** (ثبوت النسب بالدخول في الزواج الفاسد):-

ڕەچەڵەك بەچوونەلا (نەك بەهاوسەرگیری) دەسەلمێت، ئەگەر سەلمێنرا کەهاوسەرگیریەکە پوچەڵە، وەك ئەوەی دووشایەت تێیدا ئامادە نەبن، هەروەك لە بۆچوونی پەسەندی فیقهی ئیسلامیدا هاتووە، یاخود هاوسەرگیرییەکە پێش کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانی ئافرەتێکی شووکردوو بێت لەتەڵاقی مێردە پێشووەکەی ئەمەش بەهۆی بوونی گومان لەگرێبەندەکەدا.

**دووەم: سەلماندنی رەچەڵەك بەدانپێدانان (ثبوت النسب بالاقرار):**

مەبەست لەدانپێدانان بەرەچەڵەكدا هەواڵدانی كەسێكە بەوەی نزیكایەتی هەبێت لەنێوان ئەوو كەسێكی دیكەدا، ئەویش دوو جۆرە:

یەكێكیان: نزیكایەتی راستەوخۆ (قرابة مباشرة): بریتیە لە پەیوەندی نێوان بنەچە (اصول)و لقەكان (فروع) بەیەك رادە وەك كوڕایەتی و باوكایەتیو دایكایەتی.

دووەمیان: نزیكایەتی ناڕاستەوخۆ (قرابة غیر مباشرة): بریتیە لە خزمایەتی خوێشان (قرابة الحواشي) كە بنەچەیەكی هاوبەش كۆیان دەكاتەوە بەبێ ئەوەی یەكێكیان لقی ئەوی دیكەیان بێت وەك برایەتی و مامەیەتی.

بەهەمان شێوە خزمایەتی بنەچەو لقەكان بەخزمایەتی ناڕاستەوخۆ دادەنرێت ئەگەر لەپلەی یەكەم نەبوون وەك باپیرەكانو نەوەكان.

**مەرجەكانی سەلماندنی رەچەڵەك بەدانپێدانان (شروط ثبوت النسب بالاقرار):**

١-دەبێت ئەو كەسەی رەچەڵەكەكەی بۆ بڕیار دەدرێت رەچەڵەك نادیار بێت، بەوەی لەباوكێكی نادیار بێت، ئەگەر زانرا كێ باوكیەتی ئەوا بڕیاردان بۆی بەتاڵ دەبێت.

٢-ئەو كەسەی بڕیاری رەچەڵەك دانە پاڵەكەی بۆ دەدرێت توانای ئەوەی هەبێت هاوشێوەی ئەوەی بڕیاری بۆ دەدەن بخاتەوە، وەك ئەوەی جیاوازی تەمەن لەنێوانیاندا بەو رادە بێت كە ئەگەری ئەوە هەبێت.

٣-دەبێت ئەو كەسەی بڕیارەكەی بۆ دەدرێت پشتڕاستی ئەو بڕیاردانە بكاتەوە ئەگەر هەراش (ممین)بوو، چونكە بڕیاردان (اقرار) تەنها بۆ بڕیاردەر (مقر) بەڵگەیەو كەسی تر ناگرێتەوە بەبەڵگە یاخود پشتڕاستكردنەوە نەبێت لەلایەن ئەو كەسەی ترەوە.

٤–بڕیاردەر ئـەوە رانەگەیـەنێت کەئـەو منالـەی بڕیاریـان بـۆداوە هـی منـاڵی پەیوەندی ناشەرعیە.

## دانپێدانان بە باوکایەتی یاخود دایکایەتی (الاقرار بالابوة والامومة)

دروستە کەسێك کەباڵغو عاقڵ بێت دان بەباوکایـەتی کەسـێکی دیـاریکراودا بنێـت وەك ئەوەی بڵێت ئەوە باوکمە، یاخود بەدایکایەتی کەسێکی دیاریکراودا وەك ئـەوەی بڵێت ئەوە دایکمە، ئەگەر هاتوو ئەم مەرجانەی تێدا هاتە دی:

١–ئەو کەسەی بڕیار لەبارەی باوکایەتیەوە دەدرێـت لـەکاتی بڕیاردانەکـەدا بـاوك نادیار بێت، دایك نادیاریش بێت ئەگەر دانپێدانانەکە لەبارەی دایکایەتیەوە بوو.

٢–بڕیار بۆدەر توانای لەدایکبوونی هاوشێوەی بڕیار لەبارە دراویەوە هەبێت.

٣–بەرەهایی بڕیار بۆدراو دانی پێدا بنێـت، چـونکە وا پێویسـتە کـە هەریەکـەیان گەیشتبێتە ئەو تەمەنەی بگونجێت ببێتە باوك یاخود دایك، لەبەر ئەوە دانپێـدانانیان پێویستە بۆ سەلماندنی ئەو رەچەڵەکە.

## جیاوازی نێوان دانپێدانان و بەمناڵی خۆکردن (الفرق بین الاقرار بالبنوة والتبني)

دانپێدانانی کوڕێتی بریتیە لەدانان بەرەچەڵەکی راستەقینەی کەسـێکی رەچـەڵەك نادیارداو ئەویش دان بەو منداڵبوونەدا دەنێت کەبەهۆی بەیەکگەیشتنی تۆوی خـۆیو هێلکۆکەی ئافرەتەوە دروست بووە.

بـەمناڵی خـۆکردن بـەخۆوە بەسـتنەوەی کەسـێکە (نێـر بێـت یـان مـێ) کەرەچەڵەکەکەی دیارە، یاخود رەچەڵەکەکەی نادیارە وەك هەڵگیراوە (لقیط) لەگەڵ راگەیاندنی ئەوەی کەدەیکات بەمناڵی خـۆی، لەکاتێکـدا کەلەراسـتیو واقیعـدا منـاڵی خۆی نیە.

ئەم رێگایە پێش هاتنی ئیسلامو تائێستاش لەهەندێك وڵاتی نـا ئیسـلامیدا بـوونی هەیە وەك فەرەنسا.

کەئیسلام هات بەهۆی ئەو خراپەو مەترسیانەی هەیەتی قەدەغەی کرد، لەمبارەیەوە خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُمْ بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ، ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ بِهِ وَلَكِنْ مَا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾.[1]

فەلسەفەی حەرامکردنی بەمناڵی خۆکردن بەمەبەستی دوورخستنەوەی ئەم خراپانەیە:

١- درۆو هەڵبەستنە بەناوی خوداوە.

٢- هێنانی کەسێکی نامەحرەمە بۆ ناو خێزان وەك یەکێك بێت لەخۆیان.

٣- تێکەڵبوونی ئەو لەگەڵ تاکەکانی دیکەی خێزانەکە لەنێرو مێیان حەرامە، بێگومان گرتنەخۆی کوڕ یان کچی بێ باوکو دایك کارێکی پەسەندەو پاداشتی زۆری بۆ هەیە لای خوای گەورە بۆ ئەو کەسەی هەڵدەستێت بەگرتنە خۆی بژێوی ئەو مناڵە بێ دایکو باوکە، بەڵام پاش ئەوەی دەگاتە تەمەنی باڵغبوون پێویستە جیا بکرێتەوە یاخود لەرێگەی ژنخوازیەوە بکرێتە مەحرەم، ئەگەر ئەو کەسەی بەمناڵی خۆکرابوو کچ بوو ئەوا بۆ یەکێك لەکورەکانی خۆی مارە بکات، ئەگەر کوڕیش بوو یەکێك لەکچەکانی لێ مارە بکات، یاخود ئەگەر تەمەنی لەدووساڵ کەمتر بوو ئەوا با دایکەکە شیری پێ بدات، ئەگەر نەتوانرا ئەو کارانە ئەنجام بدرێت ئەوا دەبێت جیا بکرێتەوە.

جێگای داخە کەدادگای عێراقی دەیکاتە میراتگر ئەگەر هاتوو وەك یەکێك لەمناڵەکانی کەسە مردووەکە لەفەرمانگەی باری کەسی تۆمار کرابوو، ئەم کارەش لەوانەیە ببێتە هۆی بێبەریکردنی میراتگرە شەرعیەکان بەهۆی ئەم میراتگرە ناشەرعیەوە.

---

[1]- سورة الاحزاب/٥،٤.

**سێیەم: سەلماندنی راچەڵەک بەبەڵگە(ثبوت النسب بالبینە):**

هـەروەك رەچـەڵەك لـەرووی شـەرعیو یاسـاوە بەهاوسـەرگیرێتیو دانپێـدانان دەسـەلمێندرێت، بەهـەمان شـێوە بەبەڵگـەش دەسـەلمێندرێت، بەڵگـەش بـەهێزترە لەدانپێـدانان، چـونکە بەڵگـە کاریگەریەکـەی هـەردوولا دەگرێتـەوە، لەکاتێکـدا کەدانپێدانان تەنها بۆ لایەنی بڕیاردەر بەڵگەیە، لەسەر ئەم بنەمایە ئەگەر دانپێدانانو بەڵگە دژیەك بوون ئەوا بەڵگە پێش دەخرێت.

بەڵگەش بەشایەتیدانی دوو پیـاو یـاخود پیاوێـكو دوو ئـافرەت بـەپێی بۆچـوونی پەسەند دێتە دی، شایانی باسـە ئـەم سـێ رێگەیـە لـەرووی بـەهێزیو شـوێنەوارەوە لەیەك ئاسـتدا نـین، چـونکە سـەرجێ (فـراش)- هـەبوونی هاوسـەرێتی- هۆکـارێکی راستەقینەیە بۆ سەلماندنی رەچەڵەكو دروستکاریەتی، بـەڵام دانپێـدانانو بەڵگـە دوو هۆکاری رووکارین هەریەکەیان گوزارشتە لەبوونی هۆکاری راستەقینە (سەرجێ)[1].

هەڵویستی یاسادانەر لە سەلماندنی رەچەڵەك (موقف القانون من إثبات النسب):

له مـادە (٥١)ی یاسـای بـاری کەسـی عێراقـی بـەرکاردا سـەبارەت بەسـەلماندنی رەچەڵەك بەهاوسەرێتی هاتووە کە: (رەچەڵەکی منداڵی هـەموو ژنێـك، دەدرێتـە پـاڵ مێردەکەی، بەم دوو مەرجەی خوارەوە:-

١- کەمترین ماوەی دووگیانی بەسـەر گرێبەنـدی هاوسـەرگیرییەکەیدا تێپـەڕ بـوو بێت[2].

٢-بەیەکگەیشتنی ژن و مێردەکە لە تواناادا بێت.

پێویستبوو یاسادانەر دوو مەرجی دیکەی زیادبکردایە بۆیان، ئەوانیش:

١-چوونەلا (دخول) لەتواناادا بێت.

---

[1]- بڕوانە: أحكام الأسرة في الاسلام دراسة مقارنة للاستاذ محمد مصطفى شلبي /ص٦٧٧ ومابليها.

[2]- واتە شەش مانگ.

٢-ماوەی دووگیانیەکە زیاتر لەساڵێك نەبێت.

لەمادە (٥٢)شدا سەبارەت بەسەلماندنی رەچەڵەك هاتووە کە:

١-داننان بەکوڕایەتی (البنوة) کەسێکی باوك نەزانراودا ئەگەر لە نەخۆشی سەرەمەرگیشدا بێت - رەچەڵەکی دانپێدانراوەکەی پێ دەچەسپێت، ئەگەر کەسێکی وەك ئەم، لەو بکەوێتەوە (یولد مثله لمثله).

٢- ئەگەر دانپێدانەرەکە ژنێکی مێرد دار بوو، یان لە بێ نوێژیدابوو (معتدە)، ئەوا رەچەڵەکی ئەو منداڵە ناسەلمێت کە لەمێردەکەی بێت مەگەر مێردەکەی پشتڕاستی بکاتەوە یان بە بەڵگە.

سەبارەت بەدانپێدانانی کوڕ بەباوکایەتی پیاوێك یان دایکایەتی ئافرەتێك، لە مادە (٥٣)دا هاتووە کە: (دانپێدانانی رەچەڵەك نەزانراو، بە باوکایەتی[1] یان دایکایەتیدا[2]، رەچەڵەکەکەی پێدەسەلمێنێت، ئەگەر دانپێدانراوەکە بڕوایی پێداو، کەسی وەك ئەمیش، کەسی وەك ئەوی لێ بکەوێتەوە).

واتە جیاوازی تەمەن لەنێوان دانپێدانەرو دانپێنراوەکە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو دانپێدانانە، مەرجی پەسەندکردن (تصدیق) لەسەر ئەو بنەمایە وەستاوە کەدانپێدانراو بالغو عاقل بێت، لەبەر ئەوە تەنها دانپێدانان بەس نیە ئەگەر پەسەندکردنی لەگەڵ نەبێت.

سەبارەت بەدانپێدانانی ئەوانەی لەبنەچەو لقەکان نین واتە دانپێدانانی خوێش (حواشی) وەك برایەتی یاخود مامەیەتی، لەمادە (٥٤)دا هاتووە کە: (دانپێدانان بە رەچەڵەکدا، کە جگە لەکوڕایەتی و باوکایەتی و دایکایەتی بێت، لەسەر غەیری دانپێدانەر پەیڕەو ناکرێت. مەگەر پەسەندی بکات).

---

[1]-وەك ئەوەی بڵێت بەپیاوێك کە باوکی نەزانراوە ئەمە باوکمە.

[2]- وەك ئەوەی بەئافرەتێك کەدایکی نەزانراوە بڵێت ئەمە دایکمە.

دەبوو یاسادانەر جگە لەو پەسەندکردنە ئەوانەشی کە لەسەر حسابی ئەوانە لە پەسەندکردنەکە بیان گرێتەوە، ئەو کەسەی داندەنێت بەبرایەتی کەسێکدا نێر بێت یان مێ ئەگەر خوشکو برای بەهاوسەرێتی هەبێت، پاش مردنی میراتلێگراو تەنها لەبەشی دانپێدانەری بەردەکەوێت، ئەمە ئەگەر هەموو میراتگرەکانی دیکە پەسەندیان نەکردبوو یاخود بەبەڵگە نەسەلمێندرا، بەهەمان شێوە ئەو کەسەی دان بەهاوسەرێتی ئافرەتێکدا دەنێت بۆ باوکە مردووەکەی ئەوا تەنها لەبەشی دانپێدانەر میراتی دەکەوێت، ئەگەر هاتوو میراتگرەکان پەسەندیان نەکردبوو یاخود بەبەڵگە پشتڕاست نەکرابووەوە.

# دەروازەی دووەم :
# بژێوی بنەچە و لق و خوێشەکان
# ( نفقة الاصول والفروع والحواشي )

پێویستبوونی ئەو سێ پێرە هۆکارەکەی رەچەڵەکە (خزمایەتی بەرەچەڵەك)، زانایانی شەریعەت لەدرێژەی باسکردنی میراتی ئەم پێرانەدا بۆچوونیان جیاوازە، هەوڵدەدەم خۆم لەو راجیایە بەدوور بگرمو ئەو بۆچوونەیان کەنزیکترە لەدادگەری‌و قبوڵکردن وەربگرم، ئەوەیان کە رووکاری قورئان بەپێی کارکردن بەگشتیەکەی دەیگرێتەوەو زانایانی زاهری‌و حەنبەلی وەك کارکردن بەگشتگیری قورئان کاریان پێ کردووە کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾ ، قورئان بژێوی پەیوەستکردوە بەمیراتی‌و میراتلێگیراوەوەو (اسم فاعل)ەکە (محلی بالاستغراق)، هەروەها بنەمایەکی گشتی پێداوین کەبریتیە لە هەرکەسێك میراتی لە لێجێماوی کەسێکی دیکە بگرێت لەسەری پێویستە بژێوی ئەو میراتی لێگیراوە بکێشێت ئەگەر هەژار بووو توانای کارکردنی نەبوو ئەو میراتگرەش توانای دارایی هەبوو یاخود توانای کارکردنی هەبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لاَ تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا لاَ تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلاَ مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ﴾.[1]

قورئان لەم ئایەتەدا جیاوازی نەکردووە لەپەیوەستبوونی بژێوی لەسەر میراتی لەنێوان نێرینەو مێینەدا، لەنێوان خزمی نزیك کەمەحرەمە لەگەڵ خزمی دوور

---

[1] سورة البقرة /٢٣٣.

کەنامەحرەمە، لەبەر ڕۆشنایی ئەم گشتگیریەدا بنەما شەرعیە گشتیەکە دەڵێت(الغرم بالغنم) یاخود (الغنم بالغرم)، بۆیە بژێویدانی نزیك بۆ کەسی نزیکی (غرم)ەو میراتی بژێویدەر لەسامانی بژێوی دەرەکە (غنم)ە.

## ئەو بنەمایانەی پێویستە لەبژێویدانی ڕەچەڵەکدا ڕەچاو بکرێن (القواعد التی تجب رعایتها فی النفقه النسبیه):

١–لەبنەڕەتدا بژێوی هەر کەسێك لەسەر خۆیەتی جگە لەبژێوی ژن کەلەسەر مێردەکەیەتی.

٢–بژێوی هیچکام لە بنەچەو لقەکانو خزمانی دیکە لەکاتی پێویستبووندا نەبێت پێویست نیە.

٣–بژێوی ڕەچەڵەك لەکاتی جیاوازی ئاینی بژێویدەرو بژێویدراودا پێویست نابێت تەنها بۆ بنەچەو لقەکانو ژنەکان نەبێت.

٤–باوك بەتەنها بژێوی مناڵەکەی دەداتو کەس لەگەڵیدا بەشدار نابێت، بەهەمان شێوە مناڵیش ئیدی یەك دانە بێت یان زیاتر بەتەنها بژێوی دایكو باوکی دەداتو کەس لەگەڵی بەشدار نابێت، بەهەمان شێوەی بژێویدانی مێرد لەلایەن ژنەکەیەوە.

٥–بژێوی خزمان بەپێی ڕادەی پێویستبوون دەخەملێندرێت، چونکە تەنها لەکاتی ئاتاجیدا پێویست دەبێت، لەبەر ئەوە تەنها بەبڕی پێویستیەکە بەسە، هەروەك بژێویدانی مناڵەکان لەکاتێکدا باوکەکە نەدار بێت، لەحاڵەتی هەبوونیدا دادوەر بڕەکە دەخەملێنێتو دەبێت حاڵی بژێویدەرەکەو بژێوی پێدراوەکە لەبەرچاو بگرێت.

٦– بژێوی بنەچەو لقەکان پێویستی بەجێهێنانی لەسەر فەرمانی دادگا یاخود ڕێککەوتنی ڕەزامەندانە(اتفاق رضائي)ڕاناوەستێت، چونکە ئەوە ڕاستەوخۆ پێویستە بەهەمان شێوەی بژێوی ژن بەپێچەوانەی بژێوی کەسانی دیکەوە، کەبەجێهێنانی پێویست (واجب) نیە مەگەر پاش ڕێککەوتنی ڕەزامەندی یاخود

فەرمانی دادگا، لەهەموو بارەکاندا ئەگەر بژێوی پێویستبوو ئەوکەسەشی لەسەری پێویستکراوە بەجێی نەهێنا ئەوا وەك هەر قەرزێکی دیکەی ئاسایی لەسەری کەڵەکە دەبێتو نافەوتێت مەگەر بەدانەوەی یان بەگەردن ئازا کردنی.

٧- نابێت لەماڵی کەسێکی دیار نەبوو یان ونبوو بژێوی جگە لەژنو بنەچەو لقەکان بدرێت.[1]

## مەرجەکانی پێویستبوونی بژێوی وەچە لەسەر بنەچە (شروط وجوب نفقة الفرع على الأصل):-

١-نابێت وەچەکە (الفرع) ئیدی منالّ بێت یان گەورە، نێر بێت یان مێ، سامانی تایبەت بەخۆی هەبێت.

٢-دەبێت وەچەکە توانای کاسپی کردنی نەبێت یاخود خوێندکار بێت، یان کچێکی شوو نەکردوو بێت، چونکە کچی شوونەکردوو ئەرکی کارکردنی لەسەر نیە هەرچەندە لە توواناشیدا هەبێت کار بکات، ئەگەر فەرمانبەر نەبوو موچەی تایبەت بەخۆی هەبێت.

٣-دەبێت بنەچەکە توانای کارکردنی هەبێت یادەوڵەمەندیش نەبێت، چونکە منالێکی نەدار بێت لەسەر باوكو باپیری پێویستە بژێوی بدرێت.

بەڵام ئەگەر باوکەکە نەداربوو توانای کارکردنیشی نەبوو، دایکەکە هەبوو بوو ئەوا لەسەری پێویستە بژێوی منالەکەی بکێشێتو ئەوەش قەرز دەبێت لەسەر باوکەکە ئەگەر دواتر دەوڵەمەند بوو بۆی بگەرێنێتەوە، بەهەمان شێوە بژێوی لەسەر دایك پێویست دەبێت کەتوانای دارایی باش بوو باوکەکەش لەوێ نەبوو لەتواناشدا نەبوو لەسامانە بەردەستەکەی یان نادیارەکەی بژێوی بکێشرێت.

---

[1]- بڕوانە: الاحوال الشخصية في التشريع الاسلامي للدكتور أحمد الغندور/ص٦١٥ ومايليها.

ئەگەر باوكو دایك هەردووكیان نەدار بوونو توانای كاركردنیان نەبوو ئەوا بژێوییان لەسەر میراتگرانیان پێویست دەبێت، هەروەك قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ كردووە: (وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ)، ئەو بژێویە وەك قەرز لەئەستۆی ئەو كەسەی لەسەری پێویست بووە بژێویان بدات كەڵەكە دەبێت، ئەگەر ئامادەنەبوو بیداتەوە دروستە لەرێی دادگاوە ناچار بكرێت بەدانەوەی بژێویەكە.

بەهۆی ئەوەی میراتی بناغەیە بۆ پێویستبوونی بژێوی، رێژەی بژێویەكەش بەهەمان رادەی میراتی دەبێت، بۆ نمونە كەسێك برایەكو خوشكێكی هەیە لێرەدا یەك لەسەر سێی بژێویەكە لەسەر خوشكەكەیەو دوو لەسەر سێی لەسەر براكەیە، چونكە میراتیەكەی بەو گریمانەیەی بەر لەوان بمرێتو ماڵێكی لەپاش بەجێ بمێنێت بەو جۆرەیە كە بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە هەیە، ئەگەر میراتگرەكانیشی لەخزمانی سك (ذوی الارحام) بوون كەئەمانە جیان لەخاوەن پشكە دیاریكراوەكان (أصحاب الفروض)و خزمانی پشت (عصبات)، ئەوا بژێویەكە لەسەر نزیكترینیان پێویست دەبێت چونكە دەبێتە هۆی بەشبرانی ئەوانەی دیكە لەمیراتی بەركەوتندا، ئەگەر لەپلەی خزمایەتیشدا وەك یەك بوون ئەوا بژێوی بەیەكسانی لەسەریان پێویست دەبێت هەروەك چۆن لەمیراتی بەرمەوتندا یەكسان دەبن.،

مەرجەكانی بژێوی بنەچە لەسەر وەچە (شروط نفقه الاصول على الفروع):-

١- دەبێت بنەچەكە هەژار بێتو مەرج نیە توانای كاركردنی نەبێت، ئەمەش وەك رێزێك لێی، چونكە ناچاركردنی بەوەی كار بكات لەكاتێكدا وەچەی هەبووی هەبێت لەگەڵ پایەو رێزی دایكو باوك گونجاو نیە بەهۆی ئەو ئازار پێگەیشتنەی كەتێیدایە، قورئان بەدەقی ئایەت حەرامی كردووە: (وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا

قَوْلاً كَرِيماً)[1]، پاشان ئیسلام لەسەر زاری پێغەمبەرەوە (ﷺ) ماڵو سامانی منداڵی بەماڵو سامانی باوکی داناوە، لەمبارەیەوە بەمنداڵی یەکێك لەهاوەڵانی فەرموو: (أنت ومالك لابيك)[2]، واتە: تۆو سامانەکەت هی باوکتن، دایکیش بەهەمان شێوەی باوکە لەمەدا،

٢–وەچەکە توانای بژێوی پەیدا کردنی هەبێتو مەرج نیە دەوڵەمەند بێت، هەر کاتێ وەچەکە زیاتر لەپێویستی خۆی هەبوو ئەوا بژێوی بنەچەکەی لەرووی ئاینیو دادگاشەوە لەسەر پێویست دەبێت وەك رێزو چاکەیەك لەگەڵی، لەسەر منداڵی هەبوو نێر بێت یان مێ پێویستە بژێوی دایكو باوكو داپیرەو باپیرەی ئەگەر نەدار بوون با ئاینیشیان جیاواز بێت یاخود توانای کارکردنیشیان هەبوو.

لەکاتی هەبوونی چەند منداڵێکیدا ئەوا بژێوی لەسەر هەموویانە بەپێی رادەی هەبوونیان، ئەگەر کەسابەتی کوڕەکە لەبژێوی ژنو منداڵەکەی خۆی زیاتر نەبوو ئەوا بنەچەکەش دەهێنرێتە ریزی منداڵەکانی تا لەگەڵ ئەواندا بژیو ئەم حوکمانە بۆ دایکیش بەهەمان شێوەیە.

## پوختەی بژێوی سەبارەت بەبنەچە و وەچەکان (خلاصه النفقه بالنسبه للاصول والفروع):

١–ئەگەر بنەچەکە تەنها یەك وەچەی هەبوو ئەوا بژێویەکەی لەسەر ئەوە.

٢–ئەگەر وەچەکانی زۆر بوونو پلەی خزمایەتیان وەك یەك نەبوو، ئەوا بژێویەکە لەسەر نزیکترینیان نێر بێت یان مێ پێویست دەبێت، هەر کەسێك کچێكو کوڕی کوڕێکی هەبوو لێرەدا بژێویەکە لەسەر کچەکەیە هەرچەندە نابێتە بەشبری کوڕی

---

[1]–سورة الاسراء /٢٣.

[2]–سنن ابي داود /٢٨٩/٣ كتاب الايمان والنذور باب من يأكل مال ولده رقم الحديث ٣٥٣٠. السنن الكبرى للبيهقي ٤٨٢/٧ كتاب جماع ابواب النفقة على الاقارب باب نفقة الابوين رقم الحديث ١٥٥٣٢.

کوڕەکە، بەپێی بۆچوونی ئەوانەشی دەڵێن ڕێژەی بژێوی بەهەمان شێوەی ڕێژەی میراتیە ئەوا وەك یەك لەنێوان کچەکەو کوڕی کوڕەکەدا بەش دەکرێت، ئێمەش ئەمەمان بەلاوە پەسەندە، چونکە قورئان بژێوی لەسەر بنەمای میراتی داناوە، ئەمەش وادەخوازێت ڕێژەی بژێوی وەك ڕێژەی میراتی بێت.

٣-ئەگەر وەچەکان تەنها کچ بوون یاخود تەنها کوڕ بوونو لەیەك پلەی خزمایەتیدا بوون ئەوا بژێویەکە وەك یەك لەسەر هەموویان بەیەکسانی پێویست دەبێت، ئەگەر کوڕو کچ بوونو لەیەك پلەی خزمایەتیدا بوون، وەك کوڕو کچی بن ئەوا بژێویەکە دەکرێتە سێ بەش دوو بەشی لەسەر کوڕەکان دەبێت یەك لەسەر سێی لەسەر کچەکان دەبێت، بەپێی بۆچوونی پەسەند کە ڕای وایە ڕێژەی بژێوی بەهەمان ڕێژەی میراتیە، بەڵام بەپێی ڕای ئەوانەی پێچەوانەی ئەم بۆچوونەن ئەوا بەیەکسانی بژێویەکە لەسەر هەموویان پێویست دەبێت بەبێ ڕەچاوکردنی نێرو مێ، ئاراستەی یەکەم بۆچوونەکەیان پەسەندە هەروەك پێشتر باسمان کرد.

## هەڵوێستی یاسا لەبژێوی ڕەچەڵەك (موقف القانون(١) من النفقه النسبیه):-

ئەم مادانە حوکمەکانی بژێوی ڕەچەڵەکیان لەخۆ گرتووە:

مادە (٥٩):

١- ئەگەر منداڵ نەدار بوو، بژێویەکەی لەسەر باوکیەتی، مەگەر باوکی هەژار بێ و نەتوانێ کاسبی بکات و بژێوکەی بدات.

٢- بژێوی منداڵ بەردەوام دەبێت، تا مێینە شوو دەکات و، نێرینەش تا دەگاتە ئەو رادەیەی کە هاوشێوەکانی کاسبی تێدا دەکەن ئەگەر خوێندکار نەبێت.

---

١- مەبەستمان یاسای باری کەسی عێراقی بەرکارە ژمارە ١٨٨ ساڵی ١٩٥٩.

٤–کوڕی گەورەی کەتوانای کاسبی نەبێت، هەمان حوکمی کوڕی بچووکی هەیە.

مادە (٦٠):

١–ئەگەر باوك نەتوانێ بژێو بدات، بژێوی منـاڵ دەخرێتـە ئەسـتۆی ئـەو کەسـەی کەلەسەری پێویستە لەکاتی نەبوونی باوکەکەدا بیدات.

٢–ئەم بژێویەش قەرزە لەسەر باوکەکەو، بـژێو دەرەکـە دەتوانێـت کـاتێ بـووی لێی وەربگرێتەوە.

مادە(٦١):

پێویستە لەسەر منداڵی هەبوو (الموسر) چ گەورە، چ بچووك، بژێوی دایـك وباوکـە هەژارەکەی بدات تا ئەگەر بشتوانن کاسبی بکەن، مەگـەر بـاوکی مکوڕ بێـت لەسـەر بێکاری.

مادە(٦٢):

بـژێوی هـەر هـەژارێك کـە نـەتوانێت کاسـبی بکـات، دەکەوێتـە سـەر ئـەو خزمـە دارایانـەی کـە هەژارەکـە میراتگریـان بێـت، بەقـەدەر ئـەو میراتـەی کـە لـەو خزمـە دەوڵەمەندە بۆی دەمێنێتەوە.

مادە (٦٣):

بژێوی خزمان، لە بەرواری داواکەوە بڕیاری لەسەر دەدرێت.

ئەوەی لەم مادانەدا هاتووە لەحوکمەکانی بـژێوی رەچـەڵەك هاوشـێوی بۆچـوونی پەسەندە لەشەریعەتی ئیسلامیدا.

بـەڵام لەسـەر مـادەی کۆتاییـان تێبینـی دەکرێـت کەسـەلماندنی بـژێوی خزمـان لەبەرواری بەرزکردنەوەی داواکاریەوەیە، بەبۆچوونی ئێمـە ئەمـە پێچـەوانەی رۆحـی شـەریعەتی ئیسـلامو دادپەروەریـە، چـونکە هۆکـاری پێویسـتبوونی بـژێوی پـێش بەرزکردنەوەی داواکاریش لـەدادگا هـەبووە، وا پێویسـتە هۆکـاربوو بێتـە دی هەرکـە

**هۆكارەكەی هاتەدی، لەبەر رۆشنای ئەوەدا پێشنیار دەكەم بەهەموار كردنەوەی ئـەو مادەیە بەم شێوەیە:**

**( فەرمان بەپێویستبوونی بژێوی دەكرێـت لەبـەرواری سـەلماندنی هۆكارەكەیـەوە هەروەك لەبژێوی هاوسەرێتیدا هەیە).**

# بەشی دووەم

## حوکمەکانی تەڵاق لەفیقهی بەراوردکاری ئیسلامیدا

## أحكام الطلاق في الفقه الإسلام المقارن

(توێژینەوەیەکی بەراورد کراوە بەیاسا)

# پێشەکی

بەپێویستی دەزانم وەك بەدەمەوەچوونی ئەم فەرمانەی خوای گەورە: (وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَى تَنفَعُ الْمُؤْمِنِينَ) [1] لەم پێشەکیەدا ئەم خاڵە وەبیرخەرەوانەوە بخەمە روو:

١- ئافرەت نیوەی کۆمەڵە، دایكو کچو خوشكو هاوسەرە.

٢- ئافرەت کالآیەك نیە کڕینو فرۆشتنی پێبکرێتو بەهاکەی مارەییەکەی بێت هەروەك هەندێك لەناحەزان بانگەشەی بۆ دەکەن، بەڵکو ئافرەت بەنرخترە لەوەی بەنرخ مەزەندە بکرێت.

٣- هاوسەرگیری گرێبەندێك نیە ئافرەتەکە بابەتەکەی بێتو مارەییەکەش لەبری بێت، بەڵکو پەیمانێکی پتەوو بەهێزە (میثاق غلیظ) [2] و هاوبەشایەتیەکی رۆحییە، سەرمایەکەی خۆشەویستیو رێزی بەرانبەر یەکەو قازانجەکەشی لەدایکبوونی نەوەیەکی نوێی چاکەکارە.

٤- هاوسەر لەژێر رەحمەتی مێرددا نیە هەرکاتێ ویستی لەسەر بوو لای خۆی گلی بداتەوەو هەرکاتێ نەیویست تەلآقی بدات، تەلآق بێزراوترین حەلآڵە لای خوای گەورە، دانانی تەلآق لەبەر پێویستی بووەو پێویستیەکانیش بەپێی رادەیان مەزەندە دەکرێن.

٥- ئیسلام رازی نابێت ئەو بونیاتەی چەندین ساڵی پێچووەو بەهایەکی زۆری تێچووە لەچرکەساتێکدا بەسەر ژنو مێردەکەو منالآکانیاندا وێران بکرێت.

---

[1] سورة الذاريات / ٥٥.

[2] خوای گەورە دەفەرموێت: (واخذن منكم ميثاقا غليظا) سورة النساء / ٢١.

٦- لەسەر دادوەرو موفتی پێویستە جیاوازی بکات لەنێوان شەریعەتی ئیسلامیو فیقهی ئیسلامیدا، شەریعەتی ئیسلامی بریتیە لەقورئانو سوننەتی سەلمێنراوی پێغەمبەر، بۆیە لەسەر هەموو مرۆڤێك پێویستە لەرووی بیروباوەڕو کارەوە پێوەی پابەند بێت، بەڵام فیقهی ئیسلامی بریتیە لە راڤەی دەقەکانی شەریعەتو ئیجتیهادەکان لەو بوارانەی کەدەقیان لەبارەوە نەهاتووەو هەموو موجتەهیدێکیش هەروەك چۆن دەکرێت لەئیجتیهادەکەیدا بیپێکێت بەهەمان شێوە دەکرێت هەڵەش بێت[1].

٧- لەسەر دادوەرو موفتی پێویستە خۆی نەبەستێتەوە بەمەزهەبێکی دیاری کراوەوە، بەڵکو لەسەریەتی بۆچوونی ئەو مەزهەبە کار بکات کە بۆ خێزانو مانەوەی گونجاوە، ئەمەش لەروانگەی ئەم ئایەتەوەیە: (يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ)[2].

٨- خۆ بەستنەوە بەمەزهەبێکی دیاریکراوەوە پێچەوانەی قورئانی پیرۆزە، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ)[3]، نەیفەرمووە پرسیار لە ئەبو حەنیفە یاخود شافیعی یان پێشەوایانی مەزهەبەکانی تر بکەن، خۆبەستنەوە بەمەزهەبێکی دیاریکراوەوە لەهەموو گەورەو بچوکێکدا بەدرێژایی ژیان هەڵەیەکە لێخۆشبوونی بۆ نیە، پیرۆزکردنی هەر موجتەهیدێك ئیسلام پێی رازی نیە، چونکە هاوبەش بڕیاردانە، پیرۆزی تەنها بۆ خوای گەورەیە، هەروەك ئەم تایبەتمەند کردنە لەقورئاندا هاتووە: (هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ)[4].

---

[1] بگەڕێرەوە بۆ دانراومان: مجموعة الابحاث العلمية / الصفحات ٧٣-٧٥، ٩٨-١٠١، ١٦١-١٦٣.
[2] سورة البقرة / ١٨٥.
[3] سورة النمل / الاية ٤٣.
[4] سورة الحشر / الاية ٢٣.

٩- مەزهەبی بوون بیروباوەڕ (عقیده) نیە موسڵمان بەدرێژایی ژیانی پێوەی پابەند بێتو لەنەوەیەكەوە بۆ نەوەیەكی دیكە بگوازرێتەوە، ئیسلام بەسەدەی زێڕینیدا تێپەڕیو زیاتر لە سەد ساڵ هیچ مەزهەبێك لەئارادا نەبوو موسڵمان پێوەی پەیوەست بێت.

١٠- بنەمای ئوصولی ئەوە دەخوازێت كە خەڵكی رەشۆكی (عامی) هیچ مەزهەبێكی نیە، واتە هەر كەس موجتەهید نەبێت بەمەزهەبێكی دیاریكراویشەوە پابەند نابێت.

١١- لەو بنەما ئوصولیانەی هاودەنگیان لەسەرە دادوەر ئەگەر بەبۆچونێك لەبۆچوونەكانی زانایان لەبابەتێكدا كەبیرو رای جیاوازی لەسەر بوو حوكمی كرد دەبێت كار بەو بۆچوونە بكرێت كە حوكمی پێكردووە، چونكە دادوەر جیاوازیەكان هەڵدەگرێت، بەهەمان شێوە ئەگەر یاسا بۆچوونێك لەبۆچوونەكانی زانایانی وەرگرت ئەوا پێویستە كار بەوە بكرێت كەیاسا وەریگرتووە.

١٢- لەسەر دادوەرو موفتی پێویستە بۆ زانینی حوكمی بابەت یەكەمجار بۆ قورئان بگەڕێتەوە، ئەگەر لەوێدا نەیدۆزیەوە ئەوا لەسەری پێویستە بگەڕێتەوە بۆ فەرموودەكانی پێغەمبەر، ئەگەر لەوێش نەیبینیەوە ئەوا لەسەری پێویستە ئیجتیهاد بكات ئەگەر شیاوبوو بۆ ئەو كارە، ئەگەر واش نەبوو لەسەری پێویستە لەكەسانی پسپۆڕی هاوسەردەمی وڵاتەكەی پرسیار بكات بۆ زانینی ئەو حوكمە.

١٣- پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ مەعازی كوڕی جەبەلی هەڵبژارد بینێرێت بۆ یەمەن وەك ئەوەی پێی بڵێت ئەگەر بابەتێك هێنرایە لات چۆن حوكمی لەسەر دەدەیت؟ وتی: بەقورئانی پیرۆز. پێی فەرموو: ئەگەر لەقورئاندا حوكمەكەت نەدۆزیەوە؟ وتی: بەپێی سوننەتی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەگەر لەقورئانی پیرۆزو

سونەتی پێغەمبەرکەیدا حوکمەکەت نەدۆزیەوە؟ وتی: ئیجتیهاد دەکەمو دەستەوسان (کەمتەرخەم) نابم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: سوپاس بۆ خودا کەنوێنەری پێغەمبەری خوای موەفەق کردووە بۆ ئەو کارەی خوای گەورە پێی رازی دەبێت[1].

١٤- زانایانی شەریعەت کۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەموو گرێبەندو هەڵسوکەوتێکی شەرعی یاخود یاسایی ئەگەر لەسەر مەرجێك وەستابوو ئەوا بەتاڵە، ئیدی چۆن فەتوا دەدرێت بەتەڵاقی راگیراو (معلق)و خستنی ئەگەر هاتوو مەرجە لەسەر راگیراوەکە هاتە دی، لەکاتێکدا کەتەڵاق مەترسیدارترین هەڵسو کەوتی مرۆڤو بێزراوترین حەڵاڵە لای خوای گەورە.

١٥- زانایانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگن لەسەر ئەوەی سوێند بەجگە لەخواو سیفاتەکانی بەتاڵە، بەتاڵیش وەك نەبووەو هیچی لەسەر بونیاد نانرێت، ئیتر چۆن فەتوا دەدرێت بەراستی سوێند بەتەڵاقو دروستبوونی شوێنەوار بەهۆیەوە؟

١٦- قورئان لەباسکردنی تەڵاقدا وشەی جار (المرة)ی بەکارهێناوەو باسی ژمارەی نەکردووە، لەنێوان ئەو دووانەشدا جیاوازیەکی ئاشکرا هەیە کە زەمەن هەیە لەنێوان جارو جارێکی تردا بەپێچەوانەی ژمارەوە.

**پلانی لێکۆڵینەوەکە:**

لێکۆڵینەوە لەتەڵاقو حوکمەکانی بۆ چوار بەند دابەش دەکەین:

بەندی یەکەم تایبەت دەکەین بەپێناسەی تەڵاق، دووەمیشیان بۆ پێداویستیەکانی تەڵاق، سێیەمیش بۆ جیاکردنەوە لەدادگا، چوارەمیش بۆ شوێنەوارەکانی جیابوونەوە بەهۆی تەڵاق یاخود بەمردن.

---

[1] سنن أبي داود، كتاب الأقضية، باب اجتهاد الرأي في القضاء ٣٥٩٢.

# بەندی یەکەم

## پێناسەی تەڵاق

## (التعریف بالطلاق)

پێناسەی تەڵاق پێویست بەلێکۆڵینەوە لەسێ خاڵ دەکات:

یەکەمیان: ناوەرۆکی تەڵاق و جۆرەکانی.

دووەمیشیان: دەسەڵاتی تەڵاقدان بەدەست کێیە.

سێیەمیش: چۆنیەتی کۆتایهاتنی پەیوەندی هاوسەریتی هەروەك قورئان فەرمانی کردووە.

# دەروازەی یەکەم :
# تەلاق و جۆرەکانی
## ( الطلاق وانواعه )

تەلاق: بریتیە لە کۆتاپێهێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی بەدەربڕینێکی راشکاوو زانراو لەلایەن مێردەوە یاخود ژنەوە یان لەلایەن هەردووکیانەوە یاخود لەرێی دادگاوە.

تەلاقدان: بەزۆری لەلایەن مێردەوە دەبێت بەویستی یەکلایەنەو لەوانەیە لەلایەن ژنیشەوە بێت ئەگەر ئەو دەسەلاتەی پێ درابوو لەلایەن مێردەوە لەکاتی بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتیدا یاخود دوای ئەوە، هەروەها دەکرێت بەرێککەوتنی نێوان هەردوولا بێتو ئەمەش پێی دەوترێت (خلع)، دەشکرێت لەلایەن دادوەرەوە بێت هەروەك لەجیاکردنەوە (تفریق)ی دادگادا هەیە لەبەر هۆکارێك کەوا دەخوازێت، درێژەی ئەوە لەشوێنی خۆیدا باس دەکەین.

### جۆرەکانی تەلاق:

تەلاق لەرووی سروشتیەوە دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر: گەڕانەوەیی و لێکترازان(رجعي وبائن).

#### جۆری یەکەم: تەلاقی گەڕانەوەیی (الطلاق الرجعي):

هەموو تەلاقێکی بێ بەرانبەر دەگرێتەوە کەپاش چوونەلا و بۆ یەکجار یاخود دووجار بێت.

حوكمی تەڵاقی گەڕانەوەیی (حکم الطلاق الرجعي):

ئـەو هاوسـەرەی تـەڵاقێكی گەڕانـەوەیی دراوە پـێش كۆتایهـاتنی مـاوەی چاوەڕوانیەكەی لەرووی حوكمیەوە هێشتا بـەژنی مێردەكـەی دادەنرێتو دەتوانێت بەبێ گرێبەندێكی نوێ بچێتەوە بۆلایو ئـەم شـوێنەوارانە لەسـەر ئـەو كـارە دروسـت دەبێت:

١- پـێش كۆتایهـاتنی مـاوەی چـاوەڕوانیەكەی بچێتەلای بـەتاوانی زینـا ئـەژمار ناكرێت، ئەو منداڵەشی بەهۆی ئەو چوونەلاوە ببێت رەچەڵەكی شەرعیە.

٢- هەموو بژێویەكی بۆ هەیە لەكاتی ماوەی چاوەڕوانیدا.

٣- ئەگـەر یـەكێكیان پـێش كۆتایهـاتنی مـاوەی چـاوەڕوانیەكە مـرد ئـەوا ئـەوی دیكەیان میراتی لێدەگرێت هەروەك چۆن لەحاڵەتی هاوسەرگیری راستەقینەدا دەیگرێت.

٤- لەسـەر ژنەكـە پێویسـتە لـەماڵی هاوسـەرەكەیدا بمێنێتـەوە تـا مـاوەی چـاوەڕوانیەكەی كۆتـایی دێـت، وەك هانـدانێك بـۆ دەسـتپێكردنەوەی ژیـانی هاوسەری.

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لاَ تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا)[١].

قورئانی پیرۆز لەكۆتایی ئەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ ئەوە كردووە كـە: (لاَ تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا)، مەبەسـت فەلسـەفەی مانـەوەی ژنەكـە لـەماڵی

---

[١] سورة الطلاق / ١.

هاوسەرێتیداو ئەو کارە چاوەڕوانکراوەش بریتیە لەدەستپێکردنەوەی ژیانی هاوسەرێتی بەگەڕانەوەیی.

٥- ئەگەر لەکاتی ماوەی چاوەڕوانیدا جارێکی دیکەش تەڵاقیدا ئەوا تەڵاقەکەی دەکەوێت چونکە هێشتا لەڕووی حوکمیەوە هاوسەریەتی، لەفەتوادانـدا پەیڕەوی لەم بۆچوونە کراوە، بەڵام ئەمە پێچەوانەی قورئانو لۆژیکە، خوای گەورە دەفەرموویێت: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ) [1]، تەڵاقدراو تەڵاق نادرێتەوەو ئەوەی لەماوەی چاوەڕوانی تەڵاقێکی پێشتردا بێت ماوەی چاوەڕوانی نابێتەوە، لۆژیکیش دەڵێت: دەستپێکردنی ماوەی چاوەڕوانی ژنی چاوەڕوان بەدەستهاتنی بەدەستهاتووە (تحصيل حاصل)، بەدەستهاتنی بەدەستهاتووش بەهاودەنگی زانایانو عاقڵمەندان مەحاڵە.

٦- مێرد بۆی هەیە پێش کۆتاییهاتنی ماوەی چاوەڕوانی بچێتە لای ژنەکەی بەوتنی (تۆم گەڕاندەوە ژێر عیصمەتی خۆم)، یاخود هاوشێوەی ئەوە، ئیدی ژنەکە بەوە رازی بێت یان نا، چونکە رەزامەندی ژن مەرج نیە چونکە لەڕووی حوکمیەوە ژنیەتی، بەڵام وابەباشزانراوەو لای هەندێك لەزانایان پێویستە کەگەڕانەوەکە بەئامادەبوونی دوو شایەت بێت، وایدەبینین کەرەزامەندی ژنەکەش مەرج بێت بۆ دروستی گەڕانەوەکە بەهەمان شێوە ئامادەبوونی دوو شایەتەکە، ئەمەش لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾ [2] ژنەکەش پێی رازیە لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا) [3]، بەپێی رووکاری ئایەتەکە ئەمە بەپەسەندتر دەزانین، وایدەبینین کە کۆتەکە بۆ

---

[1] سورة الطلاق / ١.

[2] سورة الطلاق / ٢.

[3] سورة البقرة / ٢٣١.

هەریەك لە (معطوف)و(والمعطوف علیە) دەگەڕێتەوە و، (معطوف)ەكەش لەپێشترە، بەپێی ئەم بنەما گشتیە: (إذا دار القید بین القریب والبعید یرجع الی القریب) واتە: ئەگەر كۆت لەنێوان نزیكو دووردا بوو ئەوا بۆ نزیكەكە دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوە ئەو تەلاقەی بەئامادەبوونی دووشایەتی دادپەروەر یاخود بەدانپێدانان لەبەردەمیاندا یان لەبەردەم دادوەردا نەبێت كاری پێناكرێت، لەئایەتی یەكەمدا فەرمانی كردووە بەشایەتگرتن لەتەلاقی گەڕانەوەیدا، هەموو فەرمانێكیش بۆ پێویستبوونە، لەئایەتی دووەمیشدا نەهیكردووە لەزیانگەیاندنی پابەند (الإضرار اللازم) بۆ گەڕانەوەكەو چوونەلای بەبێ ڕەزامەندی ژنەكە.

هەندێك لەزانیان وایدەبینن كەمێرد ئەگەر چووە لای لەكاتی ماوەی چاوەڕوانیدا یاخود پێش ئەوە ئەوا بەگەڕانەوە دادەنرێت، بەڵام پەسەندتر ئەوەیە بەگوتن (قول) یاخود بەئامادەبوونی دوو شایەت بێت لەبەر رووكاری ئەو ئایەتەی خستمانە روو.

**جۆری دووەم: تەلاقی لێكترازان (الطلاق البائن):**

هەموو تەلاقێك دەگرێتەوە كەپێش چوونەلا یاخود بەبەرانبەر بێت یان بۆ جاری دووەم بێت، هەروەها هەموو تەلاقێكی گەڕانەوەیش دەگرێتەوە پاش كۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانی.

تەلاق پێش چوونەلا لێكترازان (بائن)ە چونكە ژنە تەلاقدراوەكە پێویستی بەماوەی چاوەڕوانی نیە پێش چونە لا، خوای گەورە دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمْ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ[1] فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً).[2]

---

[1] واتە پێش ئەوەی بچنە لایان.

[2] سورة الاحزاب/٤٩.

تەڵاقی بەبەرانبەریش لێکترازانەو بە(خولع)یش ناو دەبرێت، ئـەمیش بریتیـە لـەو تەڵاقەی کەبەرێککەوتنی نێوان ژنو مێـرد هـەردووکیان دەبێـت لەسـەر قەرەبوویـەك کەژنەکە یان هەرکەس کەلەجیاتی ئەو بیدات بەمێردەکەی بەرانبـەر بـەوەی تـەڵاقی بدات، مەرجە کەلەو کاتەدا ژنەکە شیاوێتی بەخشین (اهلیـة التـبرع)ی هـەبێت ئەگـەر هاتوو ئەو پابەنـد بـوو بەدانـەوەی قـەرەبوو لەسـامانەکەی خـۆی، چـونکەی ئـەوەی بەرانبەر ئەو سامان دانە دەستی دەکەوێت سامان نیە بـەڵکو تـەڵاق وەرگرتنـە لەبـەر ئەوەماڵدانەکەی وەك بەخشین (تبرع) وایە.

بەهەمان شێوە نابێت قەرەبووەکە زیاتر بێت لەسـێ یـەکی لێجێماوەکـەی ئەگـەر هاتوو رێککەوتنەکە لەکاتێکدا بوو کەلەنەخۆشـینی سـەرەمەرگدا بـوو، بەپێچـەوانەی ئەمەوە ئەگەر زیاتر بوو ئەوا زیادەکە بەتاڵ دەبێت.

بەشەکانی تەڵاقی لێکترازان (اقسام الطلاق البائن).

تەڵاقی لێکترازان دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر: لێکترازانی بچوكو لێکترازانی گـەورە (بائن بينونه صغری وبائن بينونه كبری).

١- لێکترازانی بچوك ئەو تەڵاقەیە کە بۆ جاری یەکەم بێت یان دووەمجار.

حوکمەکەی: بۆ مێرد هەیە پێش تەواو بوونی ماوەی چاوەڕوانی یـاخود پـاش کۆتاییهاتنی بەگرێبەندێکی نوێو رەزامەندی ژنەکەو مارەییەکی نـوێو مۆڵـەتی سەرپـەرشـت (ولی) لای ئەوانـەی ئـەوە بەهـەمان شـێوەی پێکهێنـانی ژیـانی هاوسەری بۆ یەکەمجار بە پێویست دەزانن ژیانی هاوسـەرێتی لەگـەڵ دەسـت پێ بکاتەوە.

٢- لێکترازانی گەورە: بریتیە لەهەموو تەڵاقێك بۆ جاری سێیەم ئیـدی بەبەرانبـەر بێت یاخود بێ بەرانبـەر، ئەگـەر هـەر سـێ تەڵاقەکەیـدا ئـەوا ئـەم حوکمانـەی لەسەر دێتە جێ:

أ- نەمانەوەی ژن لەماڵی مێردەکەی چونکە بۆتە لێکترازاوو حەرامە بۆ ئەو مێردە.

ب- دروست نیە گێڕانەوەی ئەو ژنە نەبەگەڕانەوەیی نەبەهاوسەرگیریەکی نوێ تا شوو بەپیاوێکی تر نەکاتەوە.

ت- بۆ ژنەکە هەیە پاش کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانی مێردێکی تازە هەڵبژێرێت بۆ هاوبەشێتی ژیانی هاوسەریی.

ث- دروستە بۆ ژنەکە بگەڕێتەوە بۆلای مێردی یەکەمی بەم مەرجانە:

یەکەم: شوو بەمێردێکی تر بکات بەشێوەیەکی شەرعیو سروشتیو دوور لەتەڵەکەی مارەبەجاش، مێردی دووەمیشی بچێتەلای بەچوونەلایەکی شەرعی.

دووەم: جیابوونەوە رووبدات لەنێوانیاندا بەتەڵاقدان یاخود بەجیاکردنەوە لەدادگا یان بەمردنی مێردەکەی.

سێیەم: ماوەی چاوەڕوانی لەو جیابوونەوەیە تەواو بووبێت.[1]

---

[1] یاسادانەری عێراقی سەرکەوتوو نەبووە لەپێناسەکردنی تەلاقی گەڕانەوەییو لێکترازاندا، لەمادە (٣٢)ی یاسای باری کەسی ژمارە(١٨٨)ی ساڵی (١٩٥٨)دا هەریەکەیانی بەپێی حوکمەکەی پێناسەکردووەو دەڵێت، تەلاق دوو بەشە:

١- گەڕانەوەیی: ئەوەیە کەمێردەکە مۆڵەتی هەیە دووبارە بچێتەوە لای ژنەکەی لەکاتی ماوەی چاوەڕوانیدا بەبێ گرێبەندو چوونەلاکەی دەسەلمێت بەوەی کەتەلاقی پێدەسەلمێت. ٢- لێکترازانەو ئەویش دوو بەشە: أ- لێکترازانی بچووك، لەمەدا بۆ مێرد هەیە بەگرێبەندێکی نوێ هاوسەرگیری لەگەڵ ژنەکەیدا بکاتەوە. ب- لێکترازانی گەورە: لەمەیاندا حەرامە بۆ پیاوەکە هاوسەرگیری بکاتەوە لەگەڵ ژنەکەیدا کەتەلاقی داوە بەسێ تەلاقەی جیا جیاو ماوەی چاوەڕوانیەکەی کۆتایی هاتووە.

پێناسەی حوکمەکەی ناڕاستە چونکە زانینی حوکمی شتێك لەسەر زانینی ئەو شتە رادەوەستێت پێش حوکمدانەکە، دلوەر ئەگەر پێشتر نەیزانی تەلاقەکە گەڕانەوەییە چۆن حوکم دەدات بەدروستی گەڕانەوەی بەبێ گرێبەندێکی نوێ، هەروەها ئەگەر پێشتر نەیزانی تەلاقەکە لێکترازانی بچوکە چۆن حوکم دەدات بەدروستی گەڕانەوەی ژنەکە بەگرێبەندێکی نوێ.

ئەگەر ئەم مەرجانە هاتەدی ئەوا دروستە بۆ مێردی یەکەم ئەگەر ویستیان لەسەر ئەوە بوو هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە، چونکە هەریەکەیان بەئەزموونێکدا تێپەڕیو ئەو هەڵانە دووبارە ناکەنەوە کەبوونە هۆی سێ جار تەڵاقدان.

فەلسەفەی ئەم ڕێکارە: حکمە هڐا الاجراء:

گرتنەبەری ئەم ڕێکارە بۆ دەستپێکردنەوەی ژیانی هاوسەرێتی پاش سێ جار تەڵاقدان حیکمەتی زۆری هەیە، لەوانە:

١- تەڵاقدان بۆ جاری سێیەم بێگومان دەرئەنجامێکی ناکۆکی زۆری نێوان ژن‌ومێردەو کردنەوەی دەروازەی لەوە زیاتر لەبەردەمیاندا لەلایەن خوای گەورەوە (تەڵاقی بداتو بیهێنێتەوەو جیاببنەوەو بیهێنێتەوەو دووبارە جیابوونەوە) دان نانە بەژیانێکی بێماناو بەردەوامی نەهامەتیەکی بێکۆتایی.

٢- بەستنەوەی دووبارە گەڕانەوە پاش تەڵاقی سێیەم بەشووکردن بەپیاوێکی دیکە کۆتێکی دیکەیە خوای گەورە زیادی کردووە بۆ کۆتەکانی تری ویستی تەڵاقدان بەمەبەستی بچووککردنەوەی بازنەکەی.

٣- ئەزموونی ژیان لەگەڵ مێردێکی نوێدا هەموو ڕاستیەکانی بۆ ڕووندەکاتەوەو هەڵەو ڕاستی خۆی بەبەراوردکردنی هەردوو ژیانی هاوسەرگیرێتیەکەی بۆ دەردەکەوێت، هەمان شتیش سەبارەت بەمێردەکە ئەگەر هەڵە لەوەوە بوو.

٤- گاڵتەجاڕێتی چاککردنەوەو مارەبەجاش: ئەوانەی سێ تەڵاقە بەیەکجار دەخەن پەنایان بۆ هەندێ فێڵی ناشەرعی بردووە بۆ قەرەبووکردنەوەی ژن‌و مێردو منداڵەکانیان بەروخانی ماڵی هاوسەرێتی بەیەکجار و لەیەك چرکەساتدا بەسەریاندا، لەو فێڵانەش چاککردنەوەو مارەبەجاش:

یەکەم: چاککردنەوە (التحکیم):

گاڵتەجارێتی چاککردنەوە بەبڕیاردانی بەتاڵێتی هاوسەرگیری بەپێی مەزهەبی شافیعی کەتەڵاقەکەیان بەهۆی ئەو مەزهەبەوە کەوتووە، لەسەر ئەو بنەمایەی کەشایەتەکانی ئەو هاوسەرگیرییە دادپەروەر نەبوونو دادپەروەریەکەشیان لای شافیعی مەرجە بۆ دروستی هاوسەرگیری، پاش ئەوە هەڵدەستن بەمارەکردنەوەی ژنە تەڵاقدراوەکە لەمێردەکەی بۆ جاری دووەم بەپێی مەزهەبی ئەبو حەنیفە، چونکە دادپەروەری دووشایەتەکە لای ئەو مەرج نیە بۆ دروستی هاوسەرگیری.

بەوانە دەڵێم:

١–ئایا شەریعەتی ئیسلامی لەلایەن شافیعیو ئەبو حەنیفەوە دروستکراوە یاخود لەلایەن خوای گەورەو خوای گەورە دەفەرموێت: (ان الحکم الا لله) [1]؟!

٢–ئیسلام زیاتر لەسەدەیەك بەسەردەمی زێڕینیدا تێپەڕی پێش ئەوەی شافیعیو ئەبو حەنیفە لەدایك بن، حاڵی موسڵمانان لەهاوسەرگیریو تەڵاقدا چۆن بوو پێش دروستبوونی ئەبو حەنیفەو شافیعی؟

دووەم: فێڵی مارەبەجاش:

مارەبەجاش بریتیە لە شووکردنەوەی تەڵاقدراوی سێ تەڵاقە بەپیاوێکی دیکە پاش کۆتاییهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەی بەچوونەلای بەمسۆگەری: پاش ئەوەی چووەلای تەڵاقی بدات تا حەڵاڵ بێت بۆ مێردی یەکەمی بەگرێبەندێکی نوێو ئەم فێڵەش لەبەر ئەم هۆکارانە بەتاڵە:

١– مارەبەجاش نەریتێکی سەردەمی نەفامیەو ئیسلام لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی نەفرەتی لێکردووەو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لعن الله

---

[1] سورة یوسف / الایة ٤٠.

المحلل والمحلل لـه)[1]، واتـه: خـواى گـەورە نـەفرەتى كـردووە لەحـەلاَلكارو حەلاَلكراو.

٢–مارەبەجاش پێچەوانەى رووكارى قورئانى پیرۆزە لەچەندين رووەوە:

أ– سـووربوونى لەسـەر هاوسـەرگيرى تێدايـە پـێش كۆتايهـاتنى مـاوەى چاوەڕوانى بەچوونەلا، خواى گەورە دەفەرمووێت: (وَلاَ تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّى يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ)[2].

ب– گرێبەندێكى كاتيەو خەريكە تێيدا تەلاَقدران كـارێكى مسۆگەر بێت، لەكاتێكدا لـەقورئانى پـيرۆزدا گرێبەنـدێكى هەميشـەييەو تـەلاَق لەوانەيـە رووبدات، خـواى گـەورە دەفـەرمووێت: (فَـإِنْ طَلَّقَهَـا فَـلاَ جُنَـاحَ عَلَيْهِمَـا أَنْ يَتَرَاجَعَا إِنْ ظَنَّا أَنْ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ)[3].

ئەگەر مارەبەجاش راست بووايە ئەوا قورئانى پـيرۆز دەيفـەرموو: (واذا طلقهـا) چونكە وشەى (إن) بۆ كارێك بـەكاردەهێنرێت كـە گومـانى روودانـى هـەبێت‌و وشەى (اذا) بۆ كارێك بەكاردەهێنرێت كەدڵنيابن لەروودانى.

٣–ياساى هاوسەرگيرى لەپێناوى بەرژەوەنديەكى زانراوو مەبەستێكى بەرزدايە هەربۆيە بـەكارهێنانى بـۆ حەلاَلكردنـەوە بەكارهێنانێكـە لـەجێى راسـتەقينەى شەرعى خۆيدا نيەو خواى گەورە دەفەرمووێت: (وَلاَ تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا)[4].

٤–مارەبەجاش پێچەوانەى سوننەتى پێغەمبەرى خوايە (ﷺ) لەبەر ئەم هۆكارانە:

لە تورمزى‌و مەسنەددا ئەم فەرموودەيەى ئـيبن مەسـعود (ﷺ) هـاتووە، دەڵێـت: پێغەمبـەرى خـوا (ﷺ) نـەفرەتى كـردووە لەحـەلاَلكارو حـەلاَلكراو، وتويـەتى

---

[1] بروانه: (ابن ماجة) رقم الحديث ١٩٢٤ .

[2] سورة البقرة / ٢٣٥.

[3] سورة البقرة/٢٣٠.

[4] سورة البقرة / اية ٢٣١.

سەنەدەکەی حەسەنە[١]، لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا لەفەرموودەکەی عوقبەی کوڕی عامر هاتووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمووێت: (الا اخبركم بالتيس المستعار؟ قالوا بلى يا رسول الله، قال: (هو المحلل لعن الله المحلل والمحلل له) [٢]، واتە: ئایا هەواڵتان بدەمێ لەبارەی تەگەی بەکرێگیراوەوە؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بریتیە لەحەلاڵکار، خوای گەورە نەفرینی کردووە لەحەلاڵکارو حەلاڵکراو.

ئیبن قەیم دەڵێت: (ئەوانەی گێڕایانەوە لەهاوەڵە بەرزەکانو گوێبیستی نەفرینکردن لەحەلاڵکردن بوون کەبریتین لەحەلاڵکارو حەلاڵکراوو بۆیە ئەو هەواڵەی لەبارەی خوای گەورەیە هەواڵێکی دروستە[٣].

٥- پێچەوانەی هەڵسوکەوتی هاوەڵانە:

أ- عومەری کوڕی خەتتاب (ﷺ) دەڵێت: (هەر حەلاڵکارو حەلاڵکراو- مارەبەجاش-یکیان هێنابێت بەردبارانم کردوون) [٤].

ب- عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ﷺ) وتوویەتی: (ناگەڕێتەوە بۆلای مێردەکەی پێشوو بەمارەکردنێکی ویستمەندانەی نەبێتو کە دوور بێت لەفرتو فێڵو گاڵتەجاڕی بەقورئانی پیرۆز) [٥].

٦- پێچەوانەی هەڵسوکەوتی شوێنکەوتووانە:

عەبدولڕەزاق دەڵێت: ئیبن جورەیج هەواڵی پێدام: وتم بەعەتا حەلاڵکراو تەلاقدراو گەڕایەوە بۆ لای مێردەکەی پێشتری، وتی لێك جیا دەکرێنەوە،

---

[١] ابن ماجة رقم ٩٢٤.

[٢] ابن ماجة رقم ١٩٣٦.

[٣] اغاثة اللهفان لابن قيم الجوزية ١/٢٨٥.

[٤] سەرچاوەی پێشوو ١/٢٨٧.

[٥] اعلام الموقعين لابن قيم ٣/٤٥.

ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڵای مەزنی وتوویەتی: ئەوانە لەسەردەمی نەفامیدا پێیان دەوترا تەگەی بەکرێگیراو[1].

٧- پێچەوانەی بۆچوونی شوێنکەوتوانی شوێنکەوتانە: ئیسحاق وتوویەتی: حەڵاڵ نیە دەستی بۆ ببات چونکە حەڵاڵکراو گرێبەندی مارەبڕینەکەی تەواو نەکردووە[2].

٨- نەهاتنەدی ئەو دانایەتیەی لەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا مەبەستە: (حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)، ئەویش بریتیە لەوەرگرتنی چێژ لەمێردە نوێیەکە تا مافی مێردەکەی پێشتری بزانێت ئەگەر ئافرەتەکە لاسار بوو، تا ببینێت لەسایەی کەسێکی تردایەو وەك مێرد دەچێتەلای‌و ئەمەش دەبێتە هۆی ورووژاندنی هۆکاری پەشیمانی ئەگەرهاتوو بەتەڵاقدانەکە ستەمی لێکردبوو، دەستپێکردنەوەی هاوسەرگیریەکی نوێ پاش ئەوە ئەوا هەریەکەیان ڕەچاوی مافی بەرانبەرەکەی دەکات‌و نیعمەتی خوای گەورە ئاشنا دەبێت‌و خۆشەویستی نێوانیان بەردەوا دەبێت، ئاشکرایە کەئەم دانایەتیە نایەتەدی ئەگەر هاتوو هاوسەرگیری دووەم هاوسەرگیرێتیەکی ویستمەندانەی بەدەر دروستکردن تێیدا نەبوو[3].

٩- هاوسەرگیری کاتیە چونکە لەسەر ئەو بنەمایە ئەنجام دەدرێت کەحەڵاڵبوو پاش چوونەلای دەستبەجێ تەڵاقی بدات‌و تەڵاقی کاتیش بەکۆدەنگی زانایان بەتاڵە.

١٠- هاوسەرگیری بەمەرجە چونکە مەرجە بۆ حەڵاڵکار کەپاش چوونەلای یەکسەر تەڵاقی بدات‌و ئەوەش بەتاڵە.

---

[1] اغاثة اللهفان، سەرچاوەی پێشوو ٢٩٢/١.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

[3] بڕوانە (الاستاذ الشيخ زكي الدين شعبان الزواج والطلاق في الاسلام) ص ١٠٧.

١١- هاوسەرگیریەکە پایەی رەزامەندی تێدا نایەتە دی، چونکە ژنەکە رازی نابێت حەڵاڵکار بەشێوەیەکی هەمیشەیی مێردی بێت.

١٢- گوتەی شافیعی و جەعفەری و زاهری بەدروستی مارەبەجاش لەسەر بنەمای باس نەکردنی مەرج بەئاشکرایی لەگرێبەندی هاوسەرێتیدا پێچەوانەی فەرمایشتی خوای گەورەیە: (وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ)[1]، هەروەها پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ): (انما الاعمال بالنيات وانما لكل امرء ما نوى)، واتە: کارەکان بەپێی نیەتەو بۆ هەرکەس ئەوە هەیە کەنیەتی بووە[2].

ئیبن قەیم وتوویەتی: (هیچ جیاوازیەك نیە لەلای ئەهلی مەدینەو ئەهلی فەرموودەو زانایانیان لەنێوان بەمەرجگرتنی ئەوە بەقسە یاخود مەبەست چونکە مەبەستەکان کاریان پێدەکرێت و کارەکان بەگوێرەی نیەتەکانەو دەربڕینەکان بۆ سەرچاوەکەیان ناگەڕێنرێنەوە بەڵکو بۆ ئەو گوزارشتەی لەماناکەیان دەیکەن و بەوەش حوکمەکەی لەسەر دەچەسپێت)[3].

ئەگەر واتاکان و مەبەستەکان دەرکەوتن، هیچ سوودێك لە دەربڕیندا نامێنێت چونکە هۆکارەو مەبەستەکەی هاتۆتە دی.

---

[1] سورة البقرة / ٢٨٤.

[2] صحيح البخاري.

[3] بڕوانە: زاد المعاد لابن قيم ٦/٤.

# دەروازەی دووەم :

# فەلسەفەی دانانی یاسای تەڵاق و ئەوەی خاوەنیەتی

# ( حكمة تشريع الطلاق ومن يملكه )

## یەکەم: فەلسەفەی دانانی یاسای تەڵاق (حکمە تشریع الگلاق):

هاوســەرگیری پەیماننامەیەکــە لــەرووی سروشــتیەوە بابەتەکــەیو مــافو پابەندییەکانی کەدەیهێنێتە ئارا لە رووی مەبەستی ئەنجامدانیەوە لەهیچ گرێبەندێکی دیکە ناچێت.

بابەتی پەیماننامەی هاوسەرگیری مافێکی دارایی یاخود مـادی نیـە بـەڵکو بریتیـە لەحەڵاڵکردنی چێژ وەرگرتنی هەریەك لەژن ومێرد لەوی دیکەیان.

ئەو شوێنەوارانەشی لێی دەکەوێتەوە مافێکی مـادی نیـە بـەڵکو سـۆزو بـەزەییو پێکـەوەژیانو بەیەکـەوە گونجـانو خۆشەویسـتی یەکـدیو هاویەشـێتی یـەکترە لەخۆشیو ناخۆشیدا.

مەبەستی بەدیهێنراویشی بەدەستهێنانی قازانجی دارایی یاخود دوورکەوتنەوە نیە لـە زیـانی مـادی، بـەڵکو بریتیـە لـە وەچـە خسـتنەوەو منـاڵبوونو بەشـداربوون لەبەردەوامی ژیانی مرۆڤدا بـەجۆرێك کەلەگـەڵ رێـزو سـەروەریدا لەسـەر ئـەم کەونـە بگونجێت.

بەڵام سەرەڕای ئـەم گرنگیـە زۆرو مەترسـیدارەی هاوسـەرگیری لەگـەڵ ئەوەشـدا دەکرێت سەرکەوتن بەشی نەبێتو، لەکۆنو ئێستاشدا وتراوە:

لیس كل ما يتمنى المرء يُدركه  تجري الرياح بما لا تشتهي السفن

هەموو ئەوەی مرۆڤ دەیەوێ پێی ناگات  رەشەبا بەویستی کەشتی هەڵناکات

لەوانەیە بینین راست دەرنەچێتو هەست فریو بخوات لەهەڵبژاردنی هاوبەش (ژن یان مێرد)ی ژیاندا، لەوانەیە دەستنیشانکردن لەسەر بنەمایەکی هەڵە دابنرێت، یاخود مەزەندەکردنێکی نادروست، لەکاتی ژیانی رۆژانەی هاوسەرگیرێتیدا هەریەکەیان شتانێکی لەوی دیکەدا بۆ دەریکەوێت لەچۆنیەتی مامەڵەو هەڵسو کەوت کەپێی رازی نیەو لەدەرفەتەکاندا راستی بەرانبەرەکەی بەتەواوی بۆ دەریکەوێت دوور لەهەموو نواندنو هەڵەخەڵەتاندنێك، یاخود پاش پێکهێنانی ژیانی هاوسەرێتی کارێك روودەدات کەبەدەرە لەویستی ئەوانو پیکەوەگونجانی ژیانی هاوسەرێتیان تێکدەدات، یان ناکۆکیو دەمەقاڵە بەهۆی دەستێوەردانی خزمانو ناسیاوانو دۆستان بەناوی بەرژەوەندیان یاخود ئامۆژگاریکردن لەنێوانیاندا روودەداتو، بەوەش بنچینەی خێزانیان وێران دەبێتو، دڵەکان دەگۆڕێنو خۆشەویستی نێوانیان دەگۆڕێت بۆ رقو کینەو، پێکەوەگونجانو هاوسۆزیو ئارامییان بۆ ئاژاوە، یاخود گومان لەشتانێکی جۆراوجۆر دروست دەبێت، متمانەی نێوانیان ناهێڵێتو گیرۆدەی وەهمیان دەکاتو رووکاری راستیەکانیان بەدرۆو بوختان رووپۆش دەبێتو هەمووشتێك لەمێشکیاندا پێچەوانە دەبێتەوەو لەشتی گەورەو بچوکدا راستی لەدەست دەدەن.

پاش روودانی ئەمەو ئەوە هیچ دانایەکی تێدا نیە لایەکیان ناچار بکرێت قبولکردنی بەردەوام بوونی پێکهاتەی هاوسەرێتیان بەو شێوە بێزێنەرە بێمانایە کە تابێت رۆژ لەدوای رۆژ تاریکترو خراپتر دەبێتو کارەکە لەوانەیە بەوەیان بگەیەنێت یاخود لایەکیان بەوە بگەیەنێت کە کارێکی تاوانکارانە یان لادانی رەوشتی یان دیاردەیەکی تەندروستیو یان کۆمەڵایەتی دیکە ئەنجامبدات کە ژیانیان بخاتە مەترسیەوە.

لەبەر ئەمەو زیاتر لەمانەش تەڵاق بۆتە کارێکی پێویستو نەتەوەکان لەکۆنو نوێدا پەنایان بۆ بردووەو ئاینە ئاسمانیەکانیش بڕیاریان لەسەر داوەو یاسا دانراوەکانیش پەیڕەویان کردووە مەگەر ئەوانەیان کە زۆر توندن.

ئیسلامیش بەو پێیەی ئاینی فیترەتە سروشتیە بڕیار لەم سیستەمە بداتو یاسایەکی بۆ دابنێت کە بەرژەوەندی خێزانو ئوممەت بەشێوەیەك لەخۆ بگرێت کە دوور بێت لە نەهامەتی، لەئیسلامدا ڕێگە بەپیاو نەدراوە کەئافرەت بەکاڵا دابنێت کەکڕینو فرۆشتنی پێدەکرێت، بەڵکو پایەی بەرز کردۆتەوەو ئەو مافە سروشتیانەی کە پێش هاتنی ئیسلام لەزۆربەیان بێبەش بوو بوو بڕیاری لێداوە، بۆ تەڵاقیش پایەو مەرجی داناوەو سنوورێکی بۆ داناوەو کۆتی وەهای خستۆتە سەر ویستی پیاو بەجۆرێك کەنەتوانێت بەکارێکی خۆویستی دابنێتو هەرکاتێ ویستیو بۆ هەر هۆکارێك بوو پەنای بۆ ببات، بەمەش ڕێگایەکی میانگیری لەنێوان زیادەڕەویو کورتڕەویدا کەخۆی لەسیستەمی تەڵاق لای کاسۆلیكو پرۆتستانتی مەسیحیەکانو سیستەمی تەڵاق لای ڕەبانیەکان لەموسەوییەکان دەبینێتەوە.

بەڵکو بەدەرمانێکی سەختی داناوە کەلەهەندێك کاتدا بەنەخۆش دەدرێت، ئەگەر بەچاکی بەکاریان هێنا ئەوا ئەنجامەکەی باش دەبێت، ئەگەر خراپیش بەکاریان هێنا –وەك ئەوەی بەداخەوە ئێستا باوە لەجیهانی ئیسلامیدا– ئەوا ئاشوبو نەهامەتیو ناڕەحەتی بۆ تاكو کۆمەڵ دەهێنێت.

## دووەم: کێ دەسەڵاتی تەڵاقدانی هەیە (من يملك سلطة التطليق)؟:

هەندێك کەس وای دەبینێت کەمافی تەڵاقدان بەتەنها لای پیاو وایکردووەو زۆرجار خراپ بەکار بهێنرێت، ئەگەر ژنیش بۆچوونی تێیدا هەبوایە یاخود ئەگەر بەچاودێری دادگا بووایە ئەوا دوور دەبوو لەبوارەکانی خراپ بەکارهێنان.

لێرەدا مرۆڤ ئەو پرسیارەی بۆ دێت: باشە ئەگەر ئەم کارە ئاوەهایە بۆچی ئیسلام لەکاتێکدا سەرکۆنەی هەرکارێك دەکات کەزیان‌و خراپ بەکارهێنانی تێدا بێت ئەم مافەی تایبەتمەند کردووە بەپیاو؟

روونکردنەوەی ئەم راستیە پێویستی بەگفتوگۆکردنە لەسەر ئەگەرە پێشبینی کراوەکانی ئەم بابەتەو ئەم پێنج گریمانە عەقڵیە:

١-یان ئەوەتا تەنها بەدەستی ژن بێت.

٢-یاخود تەنها بەدەستی پیاو بێت.

٣-یاخود بەپێکهاتنی هەردوولایان.

٤-یاخود لەرێگەی دادگاوە بێت.

٥-یان ئەوەتا بەدەستی پیاوەو هەندێ دەرفەتی تەلاقدان دەدرێتە دەست ئافرەت.

١/ تەلاق تەنها بەدەستی ژن بێت،

لەبەر ئەم هۆیانە سەقامگیر نابێت:

١- تەلاق‌و هاوسەرگیری دوو سیستەمن لەکۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا لەسەر نەریتی فیترەت بونیات نراون: کوڕ دەچێتە خوازبێنی کچ، نەك کچ بێتە خوازبێنی کوڕ، پیاو ژن خوازبێنی دەکات نەك ژن خوازبێنی پیاو بکات، بۆ وازهێنانیش بۆچوونەکە لەرووی فیتریەوە بەو جۆرەیە بدرێتە ئەوەیان کە چووەتە داوای هاوسەرگیری، ئیسلامیش لەسەر ئەم نەریتە فیترەیە رۆشتوەو مافەکەی تەنها نەداوەتە دەست ئافرەت.

٢- تەلاقدان هەڵس‌و کەوتێکە لێکەوتەی دارایی لێدەکەوێتەوەو، مێردەکە هەموو مارەییەکە دەداتە ژنەکەو هەموو بژێویەکانی ماوەی چاوەڕوانی‌و منداڵەکان‌و خەرجی لەخۆگرتن‌و سەرەڕای خەرجیەکانی هاوسەرگیری نوێ ئەگەر ئەوەی ویست لەسەر پیاوەکەیە.

هیچ دادوەری‌و ویژدانێکی تێدا نیە کەسێك پابەنـد بکرێـت بەقـەرەبووی زیـانی هەڵسوکەوتی کەسێکی دیکەو ئـەو پابەندییانـەش مـافی کەسـەکەی تـر بن، پاشان ئەم لێکەوتە داراییانە وا لەپیاو دەکات خۆگریێت‌و هۆشیارانە هـەڵس‌و کەوت بکات بەرلەوەی پـەنا بـۆ تەڵاقـدان ببـات‌و وای لێـدەکات پێویسـتیەکی ناچاری نەبێت سوور دەبێت لەسەر مانەوەی هاوسەرێتیان.

٣- ئافرەت بەحوکمی سروشـتی دروسـتبوونی لـەو رەوش‌و کێشـانەی لەژیانیـدا بەرەوروویان دەبێتەوە لەپیاو زیاتر هەڵدەچێت‌و تـوڕە دەبێـت، بۆیـە ئەگـەر مافی تەڵاقدان تەنها بەدەستی ئەو بێت خراپ بـەکاری دەهێنێـت چـونکە ئـەو کاتەی لەحاڵەتی توڕەبووندایە گوێ بەدەرئەنجامەکانی نادات.

ئەزموونی هەندێك لە نەتـەوە دێرینـەکان کەتێیانـدا مـافی تەڵاقـدان بەدەسـت ئافرەت بـووە ئـەوەی سـەلماندووە کـەهۆکارێك بـووە بـۆ زۆری رووداوەکـانی تەڵاقـدان، وەك ئـەوەی لای رۆمانـەکان هـەبوو لەسـەردەمی کلاسـیکی‌و لای هەندێك لەهۆزە عەرەبەکانیش پێش هاتنی ئیسلام.

٢/ تەنها بەدەستی پیاو بێت:

هەنـدێکجار ژیـانی هاوسـەرێتی بـەرەو رووی رووداوی لـەناکاو یـاخود ئیختیـاری دەبێتـەوە کـەزیان بەبەرژەوەنـدی ژنەکـە دەگەیـەنێت ئەگـەر حاڵەتەکـە بـەوجۆرە بەردەوام بـوو، وەك رۆشـتنی پیاوەکـە یـاخود بـەهۆی تاوانێکـەوە کەئـەنجامی داوە فەرمانی بەندکردنی بدرێت، یان تووشبوونی بەنەخۆشیەکی درێژخایەن کەچاوەڕوانی چاکبوونەوەی نەکرێت یاخود وەك ئامادەنەبوونی بۆ خەرجکردنی بژێویان، یان خراپ هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ ژنەکەی... ئەگەر تەنها مافی تەڵاقدان بەدەسـت پیـاو بـوو هیچ بەدەستی ژنەکە نەبوو ئەوا لەو حاڵەتانەدا ژنەکە دەبێتە قوربانی رووداوەکان.

لەبەر ئەوە ئیسلام لەم حاڵەتانەدا لـەپێناوی پاراسـتنی بەرژەوەندیـەکانی خـۆی دەسەڵاتی داواکردنی تەڵاقی لەدادگا داوەتە ئافرەت بەمەبەستی تەڵاق وەرگـرتن، بـۆ

بەرژەوەندی مێردەکەی دادگا دەستێوەردان دەکات.

٣/ بەدەستی هەردووکیان بێت پێکەوە:

ئیسلام دانی ناوە بە هاودەنگی پیاوو ئافرەت هەروەك لە شێوەی(خولع)دا هەیە ئەمە ئەگەر دوور بوو لە خراپ بەکارهێنان، لەگەڵ ئەوەشدا هاودەنگی هەردوولا لەسەر تەڵاقدان لەهەموو حاڵەتەکاندا لەوانەیە چاوەڕوان نەکراو بێت، زۆرجار لایەکیان لەپێناوی زیان گەیاندن بەبەرانبەرەکەی رازی نەبێت.

٤/ تەڵاقدان لەدادگا:

ئەم ڕێگایە لەهەردوو شەریعەتی (موسەوی و مەسیحی)و زۆرێك لەیاسا دانراوەکانیشدا ماندووکارە، لەبەر ئەوەی دروست نیە تەڵاقدان لەو حاڵەتەدا لەبەردەم دادگای تایبەتمەندو بەسەرپەرشتی ئەو نەبێت.

بەڵام ئیسلام لەبەر هەندێك خراپە بڕیاری لەسەر ئەوە نەداوە، لەوانە: ئاشکراکردنی نهێنیەکانی هاوسەرگیری لەبەردەم دادگاو پارێزەری هەردولادا، لەوانەیە ئەو نهێنیانە ئابڕوبەر بن و زیان بەناوبانگی خێزانەکە بگەیەنێن و، ئایندەی ئافرەتەکە بفەوتێنێت، باوا بێنینە پێش چاومان پیاوێك گومانی کرد لەرەفتاری ژنەکەی، ویستی بەچاودێری دادگا تەڵاقی بدات، ئەبێت ئەم کارە چەندە ئابڕوبەرانە بێت؟ دەبێت بڵاوبوونەوەی ئەوە چەندە کاریگەری هەبێت لەسەر ناوبانگی ژن و مێردەکە و خزمانیان؟ پاشان لەوانەیە پاڵنەرەکانی تەڵاقدان ناواخنی (باطني) بێت وەك رق لێبوون کەناتوانرێت بەڵگە و شایەتی بۆ بهێنرێتەوەو، تەنها خاوەنەکەی دەیزانێت، بەمجۆرەش لەدەرەوەی کاری دادگا دەبێت.

٥/ بەدەستی پیاو بێت و لەکاتی پێویستدا دەرفەت بدرێتە دەست ئافرەت:

ئیسلام دانی بەم ڕێگا دروستەدا ناوەو تەڵاقدانی بەمافێکی سروشتی پیاو زانیوە، چونکە لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرانبەر بەژن و منداڵ و ماڵەکەی دەگونجێت.

لەبەر ئەوەی پیاو پابەند دەکرێت بەدانەوەی مارەیی‌و لەئەستۆگرتنی بژێویەکان، ئەوا مافی خۆیەتی کۆتاپێهێنانی پەیوەندی هاوسەرێتیشی بەدەست بێت وەك کارکردن بەو بنەمایە (الغنم بالغرم) ئەو کەسەی سوود لەکارێك وەردەگرێت دەبێت زیانەکانیشی لەئەستۆ بگرێت، هەروەها لەبەر ئەوەشی ئەو زیاتر خۆگرە لەهەڵچووونداو باشتر دەرئەنجامەکانی تەڵاقدان لەبەرچاوو دەگرێت لەکاتی تووڕەیی‌و هەڵچووندا، هەربۆیە ئەم مافە کاتێك بەکار دەهێنێت کەرەشبین بووبێت لەبەختەوەری ژیانی هاوسەرێتیان.

لەم کارە مەترسیدارەشدا کەچارەنووسی ژن‌و مێرد دیاری دەکات ئیسلام مافی ژنی لەیاد نەکردووە، بەڵکو مافی داواکردنی تەڵاقی لەدادگای تایبەتمەند پێ بەخشیوە لەبەر ئەو هۆکارانەی لەجیابوونەوەی دادگادا روونکراوەتەوە.

# دەروازەی سێیەم:
# چۆنیەتی کۆتای پێهێنانی پەیوەندی هاوسەریی لەقورئاندا

## (كيفية انهاء علاقة الزوجية في القرآن)

وەك سووربوون لەسەر بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتیو، وێران نەبوونی دامەزراوەی خێزان بەسەر ئەوانەی لەسایەیدا دەژین بەگەورەو بچوکیانەوە کە گوناهیان نیەو، وەك هاندانێك لەسەر چۆك دانەدان لەبەرانبەر دەرکەوتەکانی لاساریو رقلێبوونو ناکۆکی.... بەوەی پەلە بکرێت لەپچڕانی پەتی پەیوەندی هاوسەرێتی، خوای گەورە لە کۆتا دەستوریدا (قورئان) چەند هەنگاوێکی هێواشی بۆ کۆتایی پێهێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی داناوەو، فەرمانی کردووە بەشێوەیەکی پلەبەندی پەیڕەو بکرێت بەڵکو ببێتە هۆی یەکخستنەوەو دروستبوونەوەی ئەو هاوسۆزیەی روو لەنەمان بوو، تا ژیانی هاوسەرێتیان سەقامگیر ببێتو بەردەوام بێت.

ئەو هەنگاوانەش هەروەك لەقورئاندا دیاریکراون بریتیە لەم هەشت هەنگاوە:

### هەنگاوی یەکەم: ئامۆژگاری کردن (فعظوهن):

قورئان فەرمانی بەپیاو کردوە لەحاڵەتی لاسار بوونی ژنەکەی دەست پێشخەری بکات بە ڕێگای ئامۆژگاری و ڕێنمایی و ئاراستەکردن و هۆشیاری کردنەوە لەسەر هەڵەکان لەبری پەنا بردن بۆ تەلاقدان، خودای گەورە دەفەرموێت: (وَاللاَّتِي تَخَافُونَ

نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ) [1].

ئەم ڕێگایە یەکەم ئەرکی سەرۆك خێزانە بەمەبەستی چاکسازی هەموو ئەوەی ڕووچاری خراپبوون دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی کارێکی پاکخوێی پێویستە بۆ هەموو تاکەکانی خێزانەکە بەگشتی، خودای گەورە دەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ) [2].

ئامۆژگاری لێرەدا بەتایبەتی مەبەست لێی ئامانجێکی دیاری کراوە کە ئەویش چارەسەرکردنی نیشانەکانی لاساری ژنە پێش ئەوەی کارەکە تەشە نەبکات و دەرئەنجامی نەرێنی لەسەر کەڵەکە ببێت، بەڵام ژن لەوانەیە شانازی بکات بە جوانیەکەی یاخود سامانەکەی یاخود بنەچەکەی یاخود شانازیی بەجگە لەوانە، هەروەك چۆن خودای گەورە دەفەرموێت: (كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى، أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى) [3].

لەوانەیە ئامۆژگاری باش کاریگەری لەسەری نەبێت بۆیە لەوکاتەدا لەسەر پیاوەکە پێویستە شێوازەکە بگۆڕێت بەگرتنەبەری هەنگاوی دووەم .

---

(1) ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء بِمَا فَضَّلَ اللّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً﴾ النساء : ٣٤

(2) ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾التحريم : ٦.

(3) سورة العلق/٦-٧.

## هەنگاوی دووەم: بەجێ هێشتن لەناو جێگای هاوسەریەتی (واهجروهن في المضاجع):

جێگای هاوسەریەتی شوێنی ورووژاندنە، بەجێ هێشتنی شێوازێکی دەروونیە پیاو پەنای بۆ دەبات لەپێناوی هۆشیارکردنەوەی ژنەکەی لەسەر ئەوەی کەدووچاری چارەنووسی بێ بەش بوونی پێکەوە خەوتن دەبێتەوە کە لوتکەی پەیوەندی ژن و مێردە لەخۆشەویستی و بەزەیی و ئارامی، هەروەك چۆن خودای گەورە دەفەرموێت: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ)[1].

پەروەردەی ئاکاری ئیسلامی فەرمان بەمێرد دەکات کەپابەندبێت بەمانەی لای خوارەوە:

١- بەجێ هێشتن (پشت لێکردن) دەبێت تەنها لەشوێنی پەنهانی هەردوو هاوسەرەکە بێت.

٢-نابێت لەپێش چاوی منداڵەکانی (پشتی لێ بکات) بۆ ئەوەی ئەوە کاریگەری نەبێت لەسەر ڕەفتاریان و خراپە و خراپەکاری لەدەروونیان دروست نەکات.

٣-نابێت پشت لێکردن لەپێش کەسانی بێگانە بێت و ژنەکە سووك بکات و لەبەهای کەم بکاتەوە یاخود شکۆمەندی لەکەدار بکات، چونکە زیاتر لاسار دەبێت، لەبەر ئەوەی مەبەستەکە چارەسەرکردنی لاساریە نەك سوکایەتی پێکردن بەژن وخراپکردنی منداڵەکان، ئەگەر ئەم ڕێگایە سەرکەوتوو نەبوو لەبەر ئەوەی ژنەکە خاوەنی بیرکردنەویەکی خراپە، لەسەر مێرد پێویستە پەنا بۆ شێوازێکی تر ببات کە بگونجێت لەگەڵ ئەم ڕوحیەت و بیرکردنەوەیە کەئەویش ئەم هەنگاوەی دواترە.

---

[1] سورة الروم/ ٢١.

## هەنگاوی سێیەم: لێدان (واضربوهن):

هەروەك چۆن هەموو دەردێك دەرمانێكی تایبەتی هەیە، بەهەمان شێوە هەموو یاخی بوونێك شێوازێكی دیاری كراوی هەیە كە دەگونجێت لەگەڵ قەبارەی یاخی بوونەكە.

بۆیە خودای گەورە فەرمانی كردووە بەلێدان لەبەر ئەوەی مێرد لەبەرانبەر سێ هەڵبژاردەدایە كەچوارەمی بۆ نیە، ئەوانیش: پەنابردن بۆ دادگا كەئاشكرابوونی نهێنیەكانی خێزانی تێدایە، یاخود تەڵاقدان كە هەڵوەشاندنەوەی خێزانی تێدایە، یاخود لێدانێك كەشوێنەواری دیار نەبێت (زیان نەگەیەنێت و ئازار نەگەیەنێت ونەبێتە هۆی بریندارکردن)، بۆیە لێدان باشترینیانە.

لەوانەیە هەندێك كەس بڵێن شێوازی لێدان هەڵبژاردەیەكی دروست نیە.

پێیان ئەڵێم: بەڵی لێدان بەتێكەیشتنی دڵڕەقانەی ئەوان بەكاریكی باش دانانرێت، بەڵام ئەم ڕێگایە جەنگێك نیە لەنێوان ژن وپیاودا كە مەبەست لەم شێوە ڕەفتارە شكاندنی سەری ئافرەت بێت، لەكاتێكدا تۆمەتبار دەكرێت بەلاساری، ئەمە بەشێوەیەكی بنبڕ لەئیسلامدا نیە، بەڵكو ئەمە نەریت گەلێكە لەهەندێك سەردەم لەگەڵ نەنگی مرۆڤدا دروست بووە، بەڵام فەرمانی ئیسلام لەڕووی شێوە و شێواز و ئامانج و مەبەستدا جیاوازە.

لەبەر ئەوە لێدان بەهەمان شێوەی تەڵاق بێزراوە بەڵام لەوانی دیكە خراپەی كەمترە.

پێغەمبەر (ﷺ) لەزۆر فەرموودەیدا جەختی لەمە كردۆتەوە، لەوانە: (لا يجلد احدكم إمراته جلد عبد ثُم يُجامعها في آخر النهار)[1].

---

[1] بروانە: فتح الباري بشرح صحيح الامام لبي عبدالله محمد بن اسماعيل البخاري للامام الحافظ احمد بن علي بن حجر العسقلاني (٧٧٢ – ٨٥٢ ه) باب ما يكره من ضرب النساء وقوله تعالى (واضربوهن) أي ضربا غير مبرح، ٣٢٠/٩.

واتە: هیچ کەس لەئێوە لەژنەکەی نەدات وەك ئەوەی لەبەندە دەدرێت و دواتر لەکۆتایی ڕۆژدا بچێتە لای.

لەبارەی ئەوکەسانەشی لەهاوسەرەکانیان دەدەن فەرموویەتی: (ولا تجدون اولئك خیاركم)[1]، واتە: ئەوانە نابنە باشترینتان. هەروەها دەفەرموێت: (ولا یضرب الا اشراركم)[2]، واتە: تەنها خراپەكانتان لێدان بەكار دەهێنن.

لەم فەرمودە پیرۆزانە وجگە لەوانەش ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت كەلێدان تەنها وەك سزایەكە بۆ ژن كەكارێك ئەنجام ئەدات دژبێت لەگەڵ ڕەوشت و ئادابی گشتی، ئەم سزایەش بەتەلاقدان نابێت لەبەر ئەوەی سزا دەبێت كاریگەرییەكانی كورت بكرێتەوە لەسەر كەسی تۆمەتبار، لەكاتێكدا تەلاق كاریگەری نەرێنی لەسەر هەردوو هاوسەرەكەو منداڵەكان ئەگەر بوونیان هەبێت وخێزانی هەردووكیان هەیە ئەمەش پێچەوانەی فەرمایشتی خودای گەورەیە كەدەفەرموێت: (وَلاَ تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى)[3].

هەروەها سزاكە لەدادگاوە نابێت لەبەر ئەوەی گەیشتنی بابەتەكە بەدادگا دەبێتە هۆی بڵاوبونەوەی دواتریش زڕاندنی ناوبانگی خێزانەكە.

بۆیە پیاوچاكانی پێشوو لەم ڕاستیە گەیشتوون، كاتێك دادوەر (شریح) كە فەرمان ڕەوای موسڵمانان عومەری كوڕی خەتاب (خوا لێی رازی بێت) وەك دادوەر لەبەسرە دەست نیشانی كرد وماوەی (٦٣) ساڵ كاری دادوەری كرد، كاتێك تووڕە دەبوو و دەگەیشتە لوتكەی هەڵچوون بەهۆی زەینەبی خێزانیەوە دەستی ئەدایە (سیواكەكەی) كە لەكاتی نوێژكردن ددانەكانی پێ پاك دەكردەوە و ڕای دەوەشاند

[1] الشوكاني، نيل الاوطار ٢٣٨/٦ .

[2] الطبقات الكبرى ١٤٨/٧.

[3] ﴿قُلْ أَغَيْرَ اللّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ثُمَّ إِلَى رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ الأنعام : ١٦٤.

وەك ئاماژەیەك بۆ هەڕشەکردن لەخێزانەکەی پێی، ئەی وت :

رأيت رجالا يضربون نسائهم     فشلّت يميني حين أضرب زينبا

واتە:     پیاوانێکم بینیوە لەئافرەتەکانیان دەدەن

دەستی راستم بشکێ کاتێ لەزینەب دەدەم

کەواتــە ئــەو لێدانــەی قورئــانی پــیرۆز فــەرمانی پێکــردوە بەوشــێوەیە نیــە کــە نەزانەکان تێی گەیشتون.

بردنی ئامانجەکە بۆ ئەم رێکارە رێگری دەکات لەوەی لێدان ئەشکەنجەدان بێت بۆ تۆڵە سەندنەوە و هێور بوونەوەو، رێگریە لەوەی کە سوکایەتی و شکاندنەوە و رق لێبونەوە بێت بـۆ ژنو، رەت کراوەیـە کـەبۆ ناچـارکردن و زۆر لێکـردن بێـت لەسـەر ژیانێك کەپێی رەزامەند نەبێت[1].

ئەو سێ هەنگاوە دەگیرێتە بەر ئەگەر هـاتوو لاسـارییەکە لەژنەکـەوە بـوو، بـەڵام ئەگەر لەپیاوەکەوە بوو، ئەوا قورئانی پیرۆز فـەرمان دەکـات ئـەم هەنگاوانـەی دیکـە بگیرێتە بەر:

## هەنگاوی چوارەم: ئاشتەوایی (ئاشتەوایی باشترە) (الصلح ) (والصلح خير):

هەرکاتێك نیشانەکانی لاساری بەدەرکەوتن قورئانی پیرۆز هـەردوو هاوسـەرەکەی ئاراستەکردوە بۆ ئاشتەوایی و گفتوگۆ ولێك تێگەیشتن، خودای گـەورە دەفـەرموێت: (وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزاً أَوْ إِعْرَاضاً فَلاَ جُنَاْحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحاً وَالصُّلْحُ خَيْرٌ)[2].

---

[1] ينظر سيد قطب في ظلال القرآن/٥/٦٤.

[2] ﴿وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الْأَنْفُسُ الشُّحَّ وَإِنْ تُحْسِنُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾النساء: ١٢٨.

کاتێك ترسی ڕوودانی دیاردەی لاساری و نیشانەکانی هەیە لەلایەن پیاوەوە، کەهەڕەشە لەپێگەی ئافرەت و شکۆمەندیەتی وهەروەها سەقامگیری و ئاسایشی خێزان دەکات، ئەمە باشترین ڕێگایە بۆ ڕیکخستنی کۆمەڵایەتی لەچوارچێوەی خیزاندا، لەپێش ئەوەی کارەکە بگاتە تەلاقدان کەبێزراوترین کاری حەڵاڵە لەلای خودای گەورە، یاخود وازهێنان لەژن بۆ ئەوەی لەنێوان هەردوو حاڵەتی مانەوە یاخود تەلاقدا بژی، بۆیە قورئانی پیرۆز هانی پیاوی داوە لەسەر لێگەیشتن و ئاشتەوایی قبولکردن کەئەمە زۆر باشە بۆ خۆی و ژنەکەی و منداڵەکانی، چونکە لەوانەیە هەڵبێت لەرق لێبونەوە لەژنەکەی، خودای گەورە دەفەرمووێت: (وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا) [1].

ئەم چوار هەنگاوە لەکاتێکدا دەگیرێتە بەر کە دیاربێت ژن و مێردەکە کامیان کەمتەرخەمن.

بەڵام لەحاڵەتی ناکۆکی کەهەریەك ئەوەی تر تۆمەتبار بکات بەکەمتەرخەمی وهۆکاری کەمتەرخەمیەکە، قورئانی پیرۆز فەرمان دەکات بۆ ئەوەی لایەنی سێیەم لەکەس و کار و خزمان بێنە ناو کێشەکەوە، بەمەبەستی چاککردنەوە نێوانیان لەرێگەی ناوبژیوانی کردنەوە.

## هەنگاوی پێنجەم: ناوبژیوانی (هەرلایەکیان لای خۆیەوە ناوبژیوانێک بنێرێت (التحکیم) (فابعثوا حکما من اهله وحکما من اهلها)[2]:

لەکاتی دەرکەوتنی نیشانەکانی ناخۆشی و ناکۆکی لەنێوان هەردوو هاوسەرەکەدا، لەسەر خێزانەکانیان یاخود سەرپەرشتیار یاخود دادوەر یاخود هەر کۆمەڵێکی

---

[1] النساء: ١٢٨.

[2] ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾ النساء:٣٥.

ئیسلامیە بچنە ناو بابەتەکەوە بەپێشکەشکردنی یارمەتی و هاوکاری بۆ لابردنی زیانی ناکۆکیەکە بەو شێوازەی کە خودای گەورە فەرمانی پێکردوە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێت: (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقْ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا)[1].

جێبەجێکردنی ئەم فەرمانەی خوای گەورە بۆ لێکۆڵینەوە لەناکۆکی ژن و مێرد وادەخوازێت ئەمانەی تێدا بێتەدی:

أ- ناوبژیوانێك لەکەس و کاری ژنەکە ڕەوانە بکرێت کەپێی ڕازی بێت و ناوبژیوانێك لەکەس و کاری پیاوەکە کەپێی ڕازی بێت.

ب- ئەبێت هەردوو ناوبژیوانەکە دادپەروەربن و شارەزابن لەکاروباری خێزانی و کێشەکانی.

ج- ئەوەندەی لەتوانادا بێت ئەبێت لەخزمانی هەردوو هاوسەرەکە بن، ئەگەر کەس و کاریان نەبوو یاخود هەبوو بەڵام کەسیان بۆ ئەم کارە شیاو نەبن لەبەر نا شارەزایی یاخود نا دادپەروەری یاخود جگە لەوانە باشتر وایە لەدراوسێکان بن[2].

حیکمەتی ئەوەی هەردوو ناوبژیوانەکە لەکەس وکاربن لەوە دایە بەتەواوی ئاگاداری کێشەکانی هەردوو هاوسەرەکەن و، پەرۆشیان بۆ ناوبانگی هەردوو خێزانەکە و بەزەیی پیێ هاتنەوە بەمناڵەکان و کاریگەریان لەسەریان زۆر جاردەبێتە هۆی سەرکەوتنی ئەرکەکانیان.

د- ئەبێت هەردووکیان بێ لایەن بن و مەبەستیان چاکسازی بێت بەبێ جیاکاری و جیاوازی و لاگیری.

---

[1] سورة النساء:٣٥.

[2] بڕوانە: احكام القران لابن العربي (لبي بكر محمد بن عبدالله)تحقيق علي محمد البجاوي، الطبعة الثانية. عيسى البابي الحلبي ٤٢٤/١.

هـ- ئەبێت هەردوو ناوبژیوانەکە لەکەشێکی ئارام ودوور لەهەڵچوونی دەروونی و کێشەکانی مەعیشەت و ئەو هۆکارانەی دیکە کەلەوانەن ببنە تێکدەری ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵ هاوسەرەکان کۆببنەوە.

و- ئەبێت راپۆرتێکی راست و سەرراستانە و پاك بەرزبکەنەوە کەهۆکارە راستەقینەکانی ناکۆکی و جیاوازییەکان لەنێوان هاوسەرەکاندا لەخۆ بگرێت و تێیدا لایەنی کەم تەرخەم دیاری بکەن.

لەکاتی باسکردنی بابەتی جیاکردنەوە لەدادگا قسە لەرادەی پابەندبوون بەراپۆرتی ئەم دوو ناوبژیوانە دەکەین.

ئەگەر ئەم پێنج هەنگاوە سەرکەوتوو نەبوو، لەو کاتەدا دەردەکەوێت کەشێك هەیە رێگرە لەوەی ژیانی هاوسەریەتی راستەڕێ و ئارام ببێت، لەم حاڵەتەدا ژیربێژی ئەوە دەخوازێت بچێتە ژێر ئەو بارودۆخە ناخۆشەی کەبەناچاری پەنای بۆ دەبردرێت کە تەڵاقە وەك کارێکی ناپەسەند و نەخوازراو لەلایەن ئیسلامەوە، چونکە بێزراوترین حەڵاڵە لەلای خودای گەورە.

## هەنگاوی شەشەم: تەڵاقی یەکەم (الطلاق للمرة الاولى):

لەکاتی بوونی پێویستی زۆر ئاینی ئیسلام رێگەئەدات بەپەنا بردن بۆ تەڵاق کە بەسێ جار لە فەرمایشتی خودای گەورەدا دیاری کراوە: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)[1].

واتا ئەو تەڵاقەی لەدوای روودانی دەکرێت جارێکی تر ژیانی هاوسەرێتی بەردەوام بێت بەگێڕانەوە لەتەڵاقی گێڕانەوەیدا وبەگرێبەست ومارەیی تازە لەتەڵاقی

---

[1] ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُواْ مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئاً إِلاَّ أَن يَخَافَا أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللّهِ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾البقرة : ٢٢٩.

لێکترازان(دووجار)، لەهەردوو حاڵەتی گێڕانەوە و گرێبەستی تازە سەرپەرشتیارەکەی مافی پەلێپ پێ گرتنی نیە بەگوێرەی فەرمایشی خودای گەورە: (وَإِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ)[1].

زۆرێك لەزانایان و ڕاڤەکاران بۆ ئەو چوون کەمەبەست ئەوەیە تەلاقی گێڕانەوەیی دووجارە، لەدوای هەر جارێك (بەچاکە دەست پێوگرتن – إِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ –) گێڕانەوەی ژنەکەیە بەبێ گریبەست یاخود (دەست هەلگرتن بەچاکەکاری – أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ –) واز هێنانە لەتەلاقدراو بەبێ گێڕانەوەی بۆ ئەوەی ببێتە لێکترازان بە بەسەرچوونی ماوەی چاوەڕوانی.

لەگەڵ ڕێزی بێ پایانم بۆ پێگەی ئەم زانا بەڕێزانە بەلاّم ئەم قسانەیان پێچەوانەی دەقی ئاشکرای ئاماژە بۆ کراوە، لەبەر ئەم هۆکارانەی لای خوارەوە:

١–دەربڕینی (دەست لێ هەلگرتن – تسریح – ) لەدەستەواژەی قورئانی پیرۆزدا هیچ واتایەکی تر ناگەیەنێت جگە لەتەلاقدان نەبێت بەبەلگەی ئەوەی لەسورەتی ئەحزاب ئایەتی(٢٨) هاتووە: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً).

هەروەها ئایەتی (٤٩): (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمْ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً).

٢–باوەر بەوە ناکرێت کەدەست هەلگرتن لەم دوو دەقەدا بەوشێوەیە ڕاڤەبکرێت بەوازلێهێنان تاکو ماوەی چاوەڕوانی بەسەردەچێت، بەشێوەیەکی تایبەت

[1] ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمْ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾(البقرة: ٢٣٢).

لەدەقی دووەم کەتەڵاق لێکترازانە، لەبەر ئەوەی لەپێش چوونەلایەو، ئاشکرایە کەقورئان هەندێکی هەندێکی تری ڕاڤەدەکات.

٣- جێگیربوونی بۆچوونی کۆمەڵی زانایانی موسڵمانان لەسەر ئەوەی تەڵاق و دەستهەڵگرتن و جیابوونەوە و دەرهاویشتەکانی لەشێوازە ڕوونەکانی تەڵاقن.

٤- دەست هەڵگرتن کارێکی ئەرێنیە کەلەمرۆڤەوە بەویستی تاك لایەنەی خۆی دەدرێت، بەڵام وازهێنان کاریکی نەرێنیە کەناکرێت یەکەم بە دووەم ڕاڤەبکرێت.

٥- ئەگەر مەبەست لە(تەڵاق دووجارە- الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ -) تەڵاقی گێڕانەوەیی بێت، ئەی حوکمی لێکترازان لەکوێیەو، حوکمی ئەوە چیە ئەگەر هاتوو تەڵاقی یەکەم لەپێش چوونەلا بێت؟.

٦- قورتبی دەڵێت: (ئەبو عومەر وتویەتی و زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی فەرمایشتی خودای گەورە: (یاخود دەست هەڵگرتنی بەچاکەکاری - أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ -) بریتیە لەتەڵاقی سێیەم لەدوای دوو تەڵاقەکە[1]. کامیان گرنگی داوە بەفەرمایشتی خودای گەورە: (فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ).

٧- هەروەها دەڵێت: (لە ئەبی ڕزین دەگێڕنەوە وتویەتی پیاوێك هات لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەم فەرمایشتەی خودای گەورەت بینیوە: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)، ئیدی تەڵاقی سێیەم کوا؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (إِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)[2].

[1] احكام القران لابي عبد الله محمد بن احمد الانصاري القرطبي، الطبعة الثالثة ١٢٧/٣.

[2] عمدة القاري بشرح صحيح البخاري ٢٣٤/٢.

٨- هـەروەها لـەکتێبی (احکـام القـران)ی (جصـاص)[١] و (احکـام القـران)ی (ابـن العربی)[٢] وا هاتووە کەئەوە دووپات دەکەنەوە.

کەواتە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) حەقیقـەتی تـەڵاقی سێیەمەو هیچ شتێك نیە لەو مانـا راسـتە دووری بخاتـەوە، ئـەو فەرمایشـتەی خـوای گەورەش: (فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)، خسـتنە رووی ئـەو حوکمەیە کەبەهۆی تەڵاقی سێیەمەوە دێتە ئارا نـەك شـتێکی دیکـە، ئـەم حوکمـەش بریتیە لەحەڵاڵ نەبوونی بۆ مێردی یەکـەمی تـا شـوو بـەپیاوێکی دیکـە نـەکاتو ئـەو پیاوە دەبێت بچێتە لای چوونەلایەکی شەرعی، ئەگەر بەهۆی مردن یـاخود تەڵاقـەوە یان جیاکردنەوە لەدادگا لێك جیابوونەوەو ماوەی چاوەڕوانی کۆتایی هـات ئـەو کاتـە ئەگەر ویستی لەسەر بوو دروستە شوو بەمێردی یەکەمی بکاتەوە.

٩-(ال) لە (الطلاق مرتان) ئەگەر بـۆ شـتێکە کەپێشـتر وترا(واتـە شـتەکە پێشـتر ناسراو) بوو ئەوا بۆ تـەڵاقی گەڕانەوەیی دەگەڕێتـەوە بـەپێی تێگەیشـتنی سـەردەمی نەفامی کەگەڕانەوەیی‌و لێکترازان دەگرێتەوە بـەپێی تێگەیشـتنی ئیسـلامی، چـونکە دەربڕینەکە هەموو تـەڵاقێك دەگرێتـەوە کـەماوەی چـاوەڕوانیەکەی تـەواو نـەبووبێت ئیدی بەبەرانبەر (عوض) بێت یان بێ بەرانبەرو بە یـەکجار بێـت یـاخود دووجـار یـان سێجار یاخود زیاتر، پاشان تەڵاقی گەڕانەوەیی بەپێی تێگەیشتنی ئیسسلامی لەکاتی هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتەدا بوونی نەبوو[٣].

---

[١] الامام ابو بکر احمد بن علي الرازي الجصاص، احکام القران تحقيق محمد صادق قمحاوي نشر دار المصحف القاهرة ٨١/٢.

[٢] سەرچاوەی پێشوو ١٩١/١.

[٣] بڕوانە دانراومان: الطلاق مرتان في تفاسير القرآن، ص ١٤.

**پابەندییەکانی تەلاقدەر لەکاتی تەلاقداندا (التزامات المطلق حين الطلاق)**

ئیسلام کە ڕێگای داوە بەپیاو بەپەنابردن بۆ تەلاق وەك دوا چارەسەر، بەلام ڕێگای پێ نەداوە هەرکاتێك و هەر چۆنێك مەبەستی بێت هەڵسوکەوت بەم مافەوە بکات، بەڵکو پابەندی کردوە بەم پابەندبوونانەوە:

**یەکەم: جیاکردنەوە لەنێوان سێ تەلاقەکەو دابەشکردنی بەسەر سێ جاردا (التفريق بين الطلقات الثلاث وتوزيعها على ثلاث مرات):**

ئەمەش بەدەقی ئەم ئایەتە: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ).

(جصاص) دەڵێت: خوای گەورە دەفەرمووێت: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ) ئەوەش جیابوونەوە (تفريق) دەخوازێت، چونکە ئەگەر بەیەکەوە دوو تەلاقیدا، ئەوا دروست نەبوو بوترێت دووجار تەلاقیداوە، بەهەمان شێوە ئەگەر پیاوێك دوو درهەم بدات نابێت بوترێت دووجار پێی داوە تا پێدانەکە بەدووجاری جیا بێت ئەو کاتە وا دەوترێت)[1].

هەروەها دەڵێت: (واتاکەی فەرمانە)، هەموو فەرمانێکیش بۆ جێبەجێکردنە.

درێژەی ئەم بابەتە لەکاتی لێکۆڵینەوە لەتەلاقی پەیوەستکراو بەژمارە باس دەکەین.

**دووەم: کات (التوقيت): لەسەر پیاو پێویستە پابەند بێت بەو کاتەی لەقورئانی پیرۆزدا بۆی دیاری کراوە**

خوای گەورە دەفەرمووێت: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)[2]، ئەم ئایەتە گوتارە بۆ پێغەمبەرەکەی بەمەبەستی گرنگی پێدانو بەبایەخ وەرگرتنی.

---

[1] (احكام القرآن)ی (جصاص)، سەرچاوەی پێشوو ٧٣/٢، ٧٤.

[2] الطلاق: ١.

کـاتی مـاوەی چـاوەڕوانی ئـافرەتیش جگـە لـەم ماوانـە لەسـوننەتی پێغەمبـەردا دیاریکراوە:

أ- کاتی بێنوێژی (وقت الحيض): دروست نیە تەڵاقدانی هاوسەر ئەگەر لـەماوەی بێنوێژیدا بوو.

ب- کـاتی زەیسـتانی (وقـت النفـاس): لـەکاتی زەیستانیشـدا تەڵاقـدانی هاوسـەر دروست نیە.

ت- کاتی پاکبوونەوەیەك تێیدا چوویێتەلای (وقت طُهرٍ عاشرها فيه): دروسـت نیـە تەڵاقدان لەوکاتەدا، چونکە ئەگەری دووگیانیی هەیـەو ئـەوەش دەبێتـە هـۆی پەشیمانی لەکاتێکدا کەپاشگەز بوونەوە سوودی نابێت[1].

سێیەم: وەدەرنەنانیان لەماڵی هاوسەرێتی (عدم إخراجهن من بيت الزوجية):

ئەگەر تەڵاقدانەکە بۆ جاری سێیەم نەبوو تا ئـەو کاتـەی مـاوەی چـاوەڕوانیەکەی تەواو دەبێـت، دەبێـت لەبـەر ئـەوەی لـەماوەی چـاوەڕوانیدایە ئـەوەی پێویسـتیەتی لەخواردن‌و جل‌و بەرگ‌و خواردنەوەو شوێنی نیشتەجێبوون لەبەر ئـەم فەرمایشـتەی خوای گەورە بۆی دابین بکات: (وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ لاَ تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا)[2].

---

[1] بۆ زیاتر ئاگاداربوون بڕوانە: فتح الباري بشرح صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو ٣٤٥/٩ كتـاب الطـلاق باب قوله تعالى: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ﴾ و بڕوانە: زاد المعـاد في هدي خير العباد محمد خاتم النبيين وامام المرسلين للامام العلامة ابن القيم الجوزيـة ٤٣/٤ و دواتـر لـەژێر ناونیشانی (حكم رسول الله ﷺ في تحريم طـلاق الحـائض والنفسـاء والموطـوءة في طهرهـا وتحـريم ايقـاع الثلاث جملة)- المدونة الكبرى في الفقه المالكي ١٠٤/٥ - المحلى في الفقه الظاهري ١٦٤/١٠ - الشـوكاني نيل الاوكار ٢٢٦/٦.

[2] (الطلاق: ١).

لەئایەتەکەدا فەرمان بە تەقوا پێش فەرمانکردن بە دەرنەکردنیان هاتووە، ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەکە ئاراستەی هاوسەرەکان کراوە، هەروەها لە (وتلك حدود الله) دواتر دەستەواژەی ( من بيوتهن) بۆ جەختکردنەوەیە لەمافی مانەوەیان تێیدا لەماوەی چاوەڕوانیدا.

لەبڕگەی کۆتایی: (لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا)، دیاریکردنی هۆکاری دەرنەکردنیانە ئەوەش بۆ ڕەخساندنی دەرفەت بۆ گێڕانەوە و دووبارە دروستکردنەوەی سۆز و خۆشەویستی و هۆگری و بیرکردنەوە لەدەرئەنجامەکانی جودابوونەوە و بیرەوەرییەکانی ژیانی هاوبەش، بەشێوەیەك کەژنەکە بەحوکمی تەلاقەکە دوورە بەلام لەبەر چاوان نزیکە.

لەماوەی چاوەڕوانی مافی ئەوەی هەیە بیگێڕێتەوە بەبێ گرێبەستی تازە بەکردەوە وبە ووتە وەك (تۆم گێڕایەوە) لەلای هەندێکی تر لەزانایانو، تەنها بەکردار وەك چوونەلا بەنیازی گێڕانەوە.

ئەگەر ماوەی چاوەڕوانی تەواو بوو بۆی نیە بیگێڕێتەوە بەگرێبەستی تازە نەبێت.

چوارەم :- شایەتیدان لەسەر تەلاق و گێڕانەوە (الإشهاد على الطلاق والرجعة):

لەسەر پیاو پێویستە بەئامادەبوونی دوو شایەت ژنەکەی تەڵاق بدات و لەبەرانبەر دوو شایەت ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ئەوەی دوور بێت لە تۆمەتبارکردن: شایەتیدان لەم دوو حاڵەتەدا بەدەق لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ)[1].

فەرمانکردن بەئامادەبوونی دوو شایەتی دادپەروەر بۆ پێویستبوونە لەبەر ئەوەی پێویستیەکە بەگوێرەی فەرمانی خودای گەورەیە ئەگەر هاتوو بەڵگەیەك نەبێت

---

[1] ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا﴾الطلاق:٢

بەپێچەوانەی ئەوە، فەرمانەکە بکرێتە رێنمایی هەڵەیەکە لێخۆشبوونی بۆ نیـە چـونکە حەقیقەتە بۆ پێویستبوون‌و بەبەڵگەیەك نەبێت لەسەری لاناچێت ئەوەش لەئارادا نیە.

پێنجەم :- زۆرنەکردن لەژن :

زۆر لەژن نەکرێت لـەوەی شـتێك لـەمارەیی یـاخود ئـەو بژێوییـەی لـەکاتی ژیـانی هاوسەریەتی پیـاو کردویـەتی بـۆی بگەرێنێتـەوە لەبەرانبـەر دەسـتهەڵگرتن لەژنەکـە ئەگەر ژیانی نەگونجێت لەگەڵیدا، بەڵام ئەگەر شـتێکی لـەوە گێرایـەوە بەرەزامەنـدی خۆی بۆ پیاوەکە لەبەرانبەر تەڵاق لەبەر ئـەوەی رقـی لێدەبێتـەوە ودەیـەوێت ئەگـەر نرخەکەی هەرچیەك بێت لەدەستی رزگاری ببێـت لـەوەدا گرفتێـك نیـە، ئـەم تەڵاقـە لەدەستەواژەی زانایان پێی دەوترێت خلع (جیابوونەوەی ئارەزوومەندانە).

خـودای گـەورە لـەدوای فەرمایشـتەکەی دەفـەرمووێت: (الطَّـلاَقُ مَرَّتَـانِ فَإِمْسَـاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)، (وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَ أَنْ يَخَافَا أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِـهِ تِلْـكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)[1].

ئەم دەقە نیشانەی پەرۆشـی ئیسـلامە لەسـەر پاراسـتنی ئـافرەت لـەو سـتەمەی کەلەوانەیـە تووشـی ببێـت لـەکاتی تەڵاقـدان، ئەگـەر لـەدوای تـەڵاقی یەکـەم ژیـانی هاوسـەریەتیان دەسـت پێکـردەوە دواتـر نـاکۆکی و نارەحـەتی و خـراپ تێگەیشـتن جارێکی تر گەرایەوە نێوانیـان، ئەوکاتـە لەسـەر پیـاو پێویسـتە ئـەو پێـنج هـەنگاوە

[1] ﴿الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلاَ أَنْ يَخَافَا أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾البقرة: ٢٢٩

سەبارەت بەپێویستبوونی شایەتەکان بڕوانە: التفسير الكبير للامام فخر الرازي ٤٣/٣ واحكام القران للقرطبي سەرچاوەی پێشوو، وتفسير الطبري ١٣٧/٢٨.

بگرێتەبەر کەلەپێش تەلاقی یەکەم هەیە بەهەمان ریزبەندی، ئەگەر هەوڵەکان سەرکەوتوو نەبوو بۆ پیاو هەیە ژنەکەی تەلاق بدات بۆ جاری دووەم (تەلاقی دووەم).

### هەنگاوی حەوتەم: - تەلاقدانی جاری دووەم:

لەسەر پیاو پێویستە بەهەمان شێوە ئەم جارەش سەرجەم ئەو کۆتانە ڕەچاو بکات کەلەسەر ویستی سەپێندراوە لەتەلاقی یەکەم لەجیابوونەوەو، کاتو، شایەتیدانو، دەرنەکردنی ژنەکەی لەماڵ ئەگەر هاتوو تەلاقەکە گێڕانەوەیی بێت تاکو ماوەی چاوەڕوانیەکەی تەواو دەبێت.

گەڕانەوە بۆ ژیانی هاوسەریەتیان لەدوای تەلاقی دووەم، ئەگەر بەگێرانەوەیی بوو کاتێ تەلاقەکە گێڕانەوەیی بێت، یاخود بەگرێبەستی تازە ئەگەر هاتوو لێکترازان بێت، دواتر بگەڕێنەوە بۆ هەمان ناخۆشی، لەو کاتەدا لەسەر پیاو پێویستە بەهەمان شێوە پەیرەوی پێنج هەنگاوەکەی یەکەم بکات، ئەگەر هیچ سوودێکی لێ نەبینی بۆی هەیە پەناببات بۆ تەلاقی سێیەم و کۆتایی.

### هەنگاوی هەشتەم: تەلاقی جاری سێیەم:

لەدەروازەی دووەمدا باسی ئەوە کراوە کەبەهۆی ئەم قۆناغەی کۆتاییەوە دروست دەبێت.

# بەندی دووەم

# پێکهێنەرەکانی تەڵاق

## ( عناصر الطلاق )

پێکهێنەری هەر دەستەواژەیەك ئەوەیە کەئەو دەستەواژە لەسەری دەوەستێت، ئەگەر بەشێك بوو لەپێکهێنەرەکەی ئەوا بە پایە ناو دەبرێت، ئەگەرنا ئەوا بەمەرج ناو دەبرێت، لەسەر ئەم بنچینەیە پایەکانی تەڵاق لای کۆمەڵی زانایانی شەریعەت سێ پایەیە: تەڵاقدەر، تەڵاقدراو، شێوەی تەڵاقدان، زانایانی ئیمامی پایەی چوارەمیان بۆ زیاد کردووە کەئەویش ئامادەبوونی دوو شایەتە[1].

ئەم پایەیەش قورئان بەشێوازی فەرمان بۆ پێویستبوون فەرمانی پێکردووە لەم ئایەتەدا: (وَأَشْهِدُوا ذَوَى عَدْلٍ مِنْكُمْ) .

بۆ زیاتر روونکردنەوە لێکۆڵینەوە لەم پایانە بۆ سێ دەروازە دابەش دەکەین، یەکەمیان بۆ تەڵاقدەر تەرخان دەکەین، دووەمیش بۆ تەڵاقدراو، سێیەمیش بۆ شێوازی تەڵاقدانەکە .

---

(1) الروضة البهية واللمعة الدمشقية ٢/١٤٧.

# دەروازەی یەکەم:
# تەڵاقدەر
# المُطلِق

لەبەشی پێشتردا باسمانکرد کە بنەما وایە تەڵاقدان لەلایەن پیاوەوە بێت، بەڵام دەکرێت ئافرەتیش لەڕێگەی دادگاوە ئەو مافەی بدرێتێ.

مەرجەکانی تەڵاقدەر: زانایانی شەریعەت کۆدەنگن لەسەر دروستی تەڵاقی کەسی باڵغی عاقڵی سەرپشکی بەهۆش، هەروەها کۆدەنگن لەسەر نادروستی تەڵاقی کەسێك شیاوێتی تەواو نەبێت، وەك شێتو منداڵی ناهەراشو ئەوانەی لەحوکمی ئەوانەدان، بۆچوونیشیان جیاوازە لەحوکمی تەڵاقی زۆرلێکراو(المُکرَه)و سەرخۆش(السکران)و توڕە(الغضبان)و گاڵتەچی(الهازل)و گەمژە(السفیه)و هەڵەکار(المُخطئ)و منداڵی هەراش(الصبي الممیز)و نەخۆش لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا.

سەرچاوەی ئەم راجیاییەیان لە زۆرلێکراو سەرخۆشو گاڵتەچیو هەڵەکاردا بریتیە لەجیاوازییان لەمەبەستەکەیدا، ئایا مەرجێکە لەمەرجەکانی دروستی تەڵاق، ئەگەر هاتوو تەڵاقدەر بەدەربڕینێکی ئاشکرا یان نا دەریبڕی.

ئەوانەی بەتوخمێکی رەهایان داناوە بۆچوونی وایە کەتەڵاقەکە ناکەوێت، ئەگەر تەڵاقدەرەکە یەکێك لەو خەسڵەتانەی باسکران تێیدا بوو[1].

---

[1] بۆ زیاتر ئاگادار بوون بڕوانە ئەم کتێبەمان: مدی سلطان الارادة في الطلاق ٢/٢٢٦.

لێرەدا بۆچوونی پەسەند دەخەینە روو:

## یەکەم: تەلاقی زۆرلێکراو (طلاق المُكرَه):

زۆرلێکردن بریتیە لە ناچارکردنی کەسێکی تر لە رێگەی هەڕەشەلێکردنەوە کە هەستێت بەئەنجامدانی کارێك کەپێی رازی نیەو بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کەتەلاقی زۆرلێکراو بەپێی ئەم بەڵگانە ناکەوێت:

أ- فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لەوانە: (لا طلاق في إغلاق)[1] واتە: تەلاقدان لەداخراندا نیە، هەروەها فەرموودەی: (ان الله وضع عن امتي الخطا والنسيان وما استكرهوا عليه)[2] واتە: خوای گەورە قەڵەمی هەلگرتووە لەسەر هەڵەو لەبیرکردن‌و ئەوەی بەزۆر پێیان دەکرێت.

ب- بەپێوانەکردنی بەموسڵمانبوونی زۆرلێکراو، هەروەك چۆن دروست نیە موسڵمان بوونی مرۆڤ بەزۆرلێکردن لەکاتێکدا ئیسلام لەبەرژەوەندییە تەواوسوود گەیەنەرەکانە، بەهەمان شێوە تەلاقی زۆرلێکراو لەپێشترە کەدروست نەبێت لەکاتێکدا کەلە کارە تەواو زیان گەیەنەرەکانە[3].

---

[1] سنن ابي داود بحاشية عون المعبود ٢/٢٢٥ .

[2] رواه ابن ماجه برقم (٢٠٤٥) وابن حبان برقم (١٤٩٨).

[3] شرح الخرشي في الفقه المالكي ٣٤/٤ وما يليها : المهذب في الفقه الشافعي لابي اسحاق الشيرازي ١٥٠/٢ . شرائع الاسلام في فقه الامامية للمحقق الحلي ٥٣/٢. المغني لابن قدامة ١١٨/٧ . التاج المذهب في الفقه الزيدي ١١٩/٢ . المحلى لابن حزم الظاهري ٢٠٣/٦ . جوهر النظام في الفقه الاباضي ٢٢٠/٢.

## دووەم: تەلاقی سەرخۆش (طلاق السكران):

بریتیە لە دروستبوونی ناتەواوی لەهاوسەنگی عەقڵیدا بەهۆی ئەو ماددە سەرخۆشکار یاخود بێهۆشکارانەی بەکاری دەهێنێت بەجۆرێك کە ئاگاداری دەرئەنجامی ئەو قسەو کردارانە نیە کەئەنجامیان دەدات.

بۆچوونی پەسەند ئەوەیە لەبەر ئەم بەڵگانە تەلاقی ناکەوێت:

أ- مەبەستی دروستی ئەوە نیەو کەوتنی تەلاقیش لەسەر ئەوە دەوەستێت.

ب- بەپێوانەکرانی لەگەڵ شێتو مناڵی هەراش لەگەڵ نەبوونی مەبەست.

ت- بێئاگابوونی لەخۆی زیاترە لەبێئاگابوونی خەوتوو، چونکە خەوتوو بەئاگا دێتەوە ئەگەر بانگکرا بەپێچەوانەی سەرخۆشەوە.

پ- نەمانی عەقڵی بەهۆی سەرپێچیەکەیەوە هیچ شوێنەوارێکی نیە، هەروەك چۆن هیچ کاریگەریەکی نیە لەمورتەد بوونیدا.

ج- گوتەی هەندێك لەزانایان [1] بەکەوتنی تەلاقەکەی بەهۆی رق لێبوون لەسەرپێچیەکەی، ئەمەش بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە سزای تاوانی خواردنەوەی بێهۆشکارەکان بەهەشتا شەلاق دیاری کراوەو رێگەنادرێت لەرووی شەرعو یاساوە کەمرۆڤ لەسەر تاوانێك دوو سزا بدرێت.

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە دروست نیە سزا کەسێکی تر بگرێتەوە کەبێتاوانە، سزای کەوتنی تەلاق کاریگەریە خراپەکەی ژنە بێتاوانەکەو منداڵە بێتاوانەکانیشی دەگرێتەوە.

---

[1] وەك شافیعیەکان (مغني المحتاج ٣/٢٢٩).

## سێیەم: تەلاّقی تورە بوو (طلاق الغضبان):

تورەبـوون خەسـلّەتێکی دەروونیـە لـەدەروونی مرۆڤـدا هەیـەو کاریگـەری رەواو نارەوای لێدەکەوێتەوە.

تورەبوونیش سێ پلەی هەیە:

١-تورەبوونێـك دەبێتـە هـۆی لەدەسـتدانی هاوسـەنگیو نـەمانی توانـا بەسـەر ویسـتدا، ئـەم تورەبوونـە حـوکمی تەلاّقەکـەی نەکەوتنـە لەبـەر ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبەر (ﷺ): (لا طلاق في اغلاق).

زۆرێك لەزانایانی هاوەلاّن وەك عـەلی کـوری ئـەبوتالّب (رضي الله عنه)و ئـیبن عـەباس (رضي الله عنهما) مانای وشەی (الاغلاق)یان بـە (الغضـبان)[1] لێکداوەتـەوە چـونکە تورەبـوو دەروازەی مەبەستی وەك زۆرلێکراو بەروودا داخراوە.

٢-پلەیەك کەمتر بەجۆرێك کەبالاّدەستە بەسەر بیرکردنەوەو ویستیداو دەزانێت قسەکانی چی لێدەکەوێتەوە، تورەبوون بەو رادەیە پێویسـتە بوترێت کەتەلاّقەکـەی دەکەوێت، چونکە مرۆڤ لەباری ئاساییدا دوور لەتورەبوونو شلّەژانی مێشك بەدەگمەن نەبێت هاوسەرەکەی تەلاّق نادات.

٣-پلەیـەکی مامناوەنـد لـەنێوان یەکـەمو دووەمـدا، بریـاردان دەمێنێتـەوە بـۆ دەستەلاّتی مەزەندەکردنی دادوەرو موفتی لەگەلّ لەبەرچاوگرتنی رەوشی تەلاّقدەر.

## چوارەم: تەلاّقی گالّتەچی (طلاق الهازل):

گالّتەکردن بریتیە لەو قسەیەی کەمەبەست لێی مانـا راسـتەقینەکەی نیـە، لێـرەدا مەبەست بەکارهێنانی دەربڕینی تەلاّقە بەگالّتەوە بەبێ ئەوەی مەبەستی کۆتایهێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی بێت.

---

[1] بروانە: اعلام الموقعين لابن قيم الجوزية ٥٢/٣ لاپەرەکانی دواتر.

ئەوانەی وتوویانە تەلاقەکەی[1] دەکەوێت پشتیان بەم بەلگانە بەستووە:

أ- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وَلاَ تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللّهِ هُزُوًا)[2] گاڵتەچی وەك سزادان و بێزارکردنی تەلاقەکەی دەکەوێت چونکە سوکایەتی بەئایەتەکانی خوداو حوکمەکانی دەکات.

ب- فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ): (ثلاث جدّهن جد وهزلهن جد: النكاح والطلاق والرجعة)[3]، واتە: سێ شت جدیان جدیەو گاڵتەشیان هەر جدیە: مارکردن و تەلاق و گەڕانەوە.

ت- دەستپێکردنی هۆکارەکان لەمرۆڤی سەرپشکەوەیەو کەوتنەوەی شوێنەواریش دروستکراوی خوایەو گاڵتەچیش دەست بەهۆکارەکە دەکات (شێوەی دەربڕینی تەلاقەکە).

گفتوگۆکردنی ئەم بەلگانە:

١- ئایەتەکە تەنها نەهیکردن لەگاڵتەکردنی لێدەخوێندرێتەوە بەپێی حوکمەکانی خوای گەورەو گوزارشت لەوە ناکات کە گاڵتەچی ئەگەر بەگاڵتەوە ئەوەی کرد ئەوا شوێنەواری ئەوەی لێدەکەوێتەوە.

٢- فەرموودەناسان تانەیان لە فەرموودەکە داوە، ترمزی وتوویەتی لەسەنەدەکەیدا عەبدولرەحمانی کوڕی ئەزوکی کوڕی حەبیب هەیەو ئەویش بۆچوونەکان لەبارەیەوە جیاوازن و فەرموودەکانی ناپەسەند (منکر)ە[4].

---

[1] وەك چوار مەزهەبەکە لەفیقهی سوننەدا.

[2] سورة البقرة /٢٣١.

[3] صحيح البخاري بشرح عمدة القاريء ٢/٢٥١.

[4] عمدة القاريء سەرچاوەی پێشوو، العمل ١٠/٢٤٠ تێیدا فەرموودەکە (موضوع)ە، الدرار البهية ٢/٦٩ تێیدا هاتووە سەنەدەکەی عەبدلرەحمانی تێدایە کەئەویش بۆچوونی جیاوازی لەبارەوە هەیە.

٣- دروست نیە پێوانەکردنی گاڵتەچی لەسەر زۆرلێکردنو سەرخۆشبوونو هاوشێوەکانیان، چونکە گاڵتەچی دەربڕینو واتاکەی بەگاڵتەوە مەبەستە نەك بەڕاست.

٤- یاریکردن یاخود گاڵتەکردن یان گاڵتەچێتی لەمافەکانی خوادا دروست نیەو بەوەش هیچ شوێنەوارێکی شەرعی لێناکەوێتەوە.

**هەڵوێستی یاسادانەر لەتەڵاقی ئەو کەسانەی باسکران:**

لەمادە (٣٥)ی یاسای باری کەسی عێراقی بەرکاردا هاتووە کە: تەڵاقی ئەم کەسانە ناکەوێت کەباسیان دەکەین:

١. تەڵاقی سەرخۆش و شێت و کەم ئەقڵ و ناچارکراو یان ئەو کەسەی شت لێك جیاناکاتەوە لە ئەنجامی تووڕەیی یان کارەساتی کتوپڕ یاخود پیری یان نەخۆشی ناکەویٚ.

٢. تەڵاقی ئەو نەخۆشە ناکەویٚ کە نەخۆشی مەرگێتی یان لەبارێکدا بووە کە ئەگەری لەناوچوونی زۆربیٚ، ئەگەر لەو نەخۆشیەدا یان لەو حاڵەتەدا مرد، ژنەکەی دەبێتە میراتگری.

لەبڕگەی دووەمی ئەو مادەیەدا تێبینی ئەمانە دەکرێت:

١- وتنی نەکەوتنی تەڵاقی نەخۆش لەنەخۆشی سەرەمەرگدا لەکاتێکدا توانای جیاکردنەوەو ویستو هۆشی لەدەست نەداوە پێچەوانەی کۆدەنگی زانایانی شەریعەتی ئیسلامو یاسای هەموو وڵاتە ئیسلامیەکانە.

٢- ئەگەر هاتوو کەوتنی تەڵاقەکە لەبەر ئەوە بوو مێردەکە بەهۆی نەخۆشینەکەیەوە توانای جیاکردنەوەی لەدەست داوە ئەوا دەبێتە دووبارەکردنەوەی ئەوەی لەبڕگەی (١)ی ئەم مادەیەدا هاتووە کە ئەو کەسەی لەبەر نەخۆشین توانای جیاکردنەوەی لەدەست دابێت ئەوا تەڵاقەکەی ناکەوێت.

٣- ئەگەر حوكمەكەی بەنەكەوتنی تەلاقی نەخۆش بوو لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا لەپێناوی پاراستنی مافی ئافرەتدا، ئەوا ئیسلام هەموو ئەو مافانەی پێدەدات كەمیرات دەیداتێ ئەگەر هاتوو تەلاقەكە لێكترازان بوو.

٤- دادوەر چۆن بزانێت نەخۆشەكە لەنەخۆشینی سەرەمەرگدایە لەو نەخۆشینەیدا لەكاتێكدا كەخوای گەورە لەتوانایدایە شیفای بدات، لەم حاڵەتەدا ژنەكە لەنێوان هاوسەرێتیو نەبوونی هاوسەرێتیدا دەمێنێتەوە تائەو كاتەی چارەنووسی مێردەكە روون دەبێتەوە.

٥- ئەگەر نەخۆش لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا تەلاقی نەكەوێت ئیدی دەستەواژەی (هاوسەرەكەی میراتی لێدەگرێت) چ سوودێكی دەبێت.

٦- لەتەواوی ئەو دەقەی باسكرا ئەوە دەخوێندرێتەوە كەتەلاقەكە ناكەوێت با بەهۆی كەمتەرخەمی ژنەكەوە یاخود لەسەر داوای ئەو بێتو ئەمەش هەڵەیەكەو هیچ یەكێك لەزانایان نەیوتووە.

لەهەموو ئەوەی باسمان كرد یاسادانەری عێراقی لەبابەتی تەلاقی نەخۆش لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا سەركەوتوو نەبووەو نەپێكاوە.

## پێنجەم: تەلاق لەبریكارەوە (الطلاق من الوكيل):

كۆمەڵی زانایانی شەریعەت وتوویانە ئەو مێردەی مەرجەكانی تەلاقدانی تێدا هاتبێتە دی دروستە خۆی ئەو كارە بكات یاخود كەسێك بكاتە بریكاریو ژنەكەی تەلاق بدات[1].

زاهریەكان وتوویانە تەلاقدان لەرێی بریكارەوە دروست نیە، چونكە نەبەدەق نەبەكاری پێشینەكان لەهاوەڵانو شوێنكەوتووان نەچەسپاوە، هەروەها لەبەر ئەوەی

---

[1] بروانە: شرح فتح التقدير ٣/٤٩٤.الشرح الصغيرمع حاشية الصاوي ٢/٤٣٦.

که قورئان کاتێ باسی تەڵاق دەکات رووی لەمێردەکانە[1].

یاسادانەری عێراقیش[2] ئەو بۆچوونەی وەرگرتووەو لـەمادە (٢/٣٤) هـاتووە کـە: (گوێ بە وەکالەت نادرێ لەکاتی رێکارەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایـەتیو ناوبـژیوانی و لە کەوتنی تەڵاقدا).

وایدەبینم ئەوەی زانایانی فیقهی ئیمامی بۆی چوون دروستە کە ئەگەر مێرد لەوێ نەبوو نەیدەتوانی ئامادە ببێت، دروستە بۆی کەسێك بکاتـە بریکـاری لەتەڵاقدانـدا[3] ئەمەش بەهۆی لەبەرچاوگرتنی پاساوی پێویستی (عذر الضرورة).

## شەشەم: تەڵاق لەلایەن بەخێوکاری ناکاملەوە (الطلاق من ولي القاصر):

لەدروستیدا زانایان بۆچوونیان جیاوازەو بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کـە بـەخێوکار بەسەرپەرشتێتی تایبەت (الولي بالولاية الخاصة) مافی تەڵاقـدانی هاوسـەری ناکـامڵی نیە کەلەژێر سەرپەشتێتیدا بێت ئیدی بچووك بێت یاخود شێت یان لەحوکمی ئەواندا، زانایـانی حەنــەفی[4] و شـافیعی[5] و حەنبەلیـەکان لەگێڕانەوەیەکـدا[6] و زەیـدی[7] و زاهریەکان[8] لەسەر ئەم بۆچوونە سەقامگیر بوون.

لەم جۆرە حاڵەتانەدا تەڵاقدان لەسەر داوای بـەخێوکار لـەدادگاوە دەبێـت چـونکە چەسپاوترو دابینکارتری مافەکانی ژنو مێردەکەیە.

---

[1] المحلى لابن حزم الظاهري ١٠/١٩٦.

[2] ژمارە (١٨٨) ی ساڵی ١٩٥٩.

[3] الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ٢/١٤٨.

[4] المبسوط للسرخسي ٦/١٧٨.

[5] المهذب ٢/٧١.

[6] المغني والشرح الكبير ٧/٨٧.

[7] البحر الزخار ٤/١٦٥.

[8] المحلى ١٠/١٩٦.

# دەروازەی دووەم :
# تەلاقدراو
## ( المطلقة )

تەلاقدراو پایەی دووەمە لەپایەكانی تەلاق، دەبێت ئەم مەرجانە لەم پایەیەدا بوونیان هەبێت:

**یەكەم:** دەبێت ئافرەتەكە بەشێوەیەكی راستەقینە لەژێر سایە(عصمة)ی مێردەكەیدا بێت وەك ژن پێش تەلاقدان و مردن و هەڵوەشاندنەوە و جیاكردنەوە لەرێی دادگاوە.

**دووەم:** نابێت لەبێنوێژیدا بێت بەوەی تەلاقدانەكەی لەكاتی بێنوێژیدا نەبێت.

زانایانی شەریعەتی ئیسلام لەسەر ئەوە كۆدەنگن كەتەلاق بەبێ پاساو لەكاتێكدا ژنەكە لەبێنوێژیدا بێت داهێنراو (بدعە)یەكی خراپە و حەرامە ئەگەر هاتوو ژنەكە پیاوەكەی چووبووە لای، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)[1]، گوتارەكە ئاراستەی ئومەتی موحەمەد (ﷺ) كراوە و (لام)ەكە لەوشەی (لعدتهن) بۆ كاتە واتە لەوكاتەی ماوەی چاوەڕوانی تەلاقدراو دەستبەجێ دوای كەوتنی تەلاقەكە دەست پێدەكات بەوەی لەپاكبوونەوەیەكدا بێت كەتێیدا نەچووبێتە لای، فەلسەفەی ئەم كاتەش دوو شتە:

یەكێكیان: زانستی هاوچەرخ سەلماندویەتی كەئافرەت ئەو كاتەی دەكەوێتە سوڕی مانگانە (بێنوێژی) ئاسایی نابێت و زاڵ نابێت بەسەر مێشكیدا لەبەر ئەوە زانایانی یاسای تاوانكاری كاتی سوڕی مانگانەیان بەحاڵەتی سووككردنی سزا (ظرفاً

---

[1] الطلاق: ١.

مخففاً للعقوبة) داناوه، ئەگەر هاتوو لەو حاڵەتەدابوو تاوانێكی ئەنجامدا، بەو پێیەش حاڵەتی بێنوێژی دەبێتە هۆكارێكی یارمەتیدەری ناكۆكیو دەمەقاڵێی نێوان ژنو مێرد لەكاتی ماوەی بێنوێژیدا.

قورئانی پیرۆز پێش دۆزرانەوە زانستیەكان فەرمانی بەمە كردووەو رێگری (نهی) كردووە لەتەڵاقدان لەكاتی بێنوێژیدا، نەهیەك كەلەو فەرمانەی قورئانی پیرۆزەوە كەلەو ئایەتەدا هاتبوو سەرچاوەی گرتووە[1].

هۆكاری دووەم ئەوەیە ئەو ژنەی لەكاتی بێنوێژیدا تەڵاق بدرێت ئەوا ماوەی بێنوێژییەكەی بەبەشێك لەماوەی چاوەڕوانی دانانرێت، لەبەر ئەوە پێویستە لەپاش ماوەی بێنوێژییو چوونەلا لەكاتی پاكیدا، ئەمەش زیانی دەبێت بۆ ئافرەتەكە.

زانایانی شەریعەتی ئیسلام بۆچوونیان جیاوازە سەبارەت بەحوكمی تەڵاقی بێنوێژ:

هەیانە وتوویەتی دەكەوێت هەرچەندە بیدعەیەو پێچەوانەی فەرمانی خوایە: (فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)، وەك حەنەفیەكان[2] لەسەر ئەو بنەمایەی كەئەو نەهیەی لەفەرمانەكە دەخوێنرێتەوە لەبەر خودی نەهی لێكراوەكە نیە بەڵكو بۆ جگە لەوەو ئەویش زیانی ژنەكەیەو ئەمەش مانای پوچەڵبوون (فساد) ناگەیەنێت، شافیعیەكان[3] و حەنبەلیەكان[4] لەمەدا هاودەنگن لەگەڵی.

هەشیانە وتوویەتی تەڵاقی بێنوێژ ناكەوێت چونكە ئەو نەهی لێكراوەی لە فەرمانەكە دەخوێنرێتەوە مانای پوچەڵبوون (فساد)ی نەهی لێكراوەكە دەگەیەنێتو

---

[1] بڕوانە دلنرلومان: موانع المسؤولية الجزائية في الشريعة الاسلامية والتشريعات الجزائية العربية، ص٦١.
[2] شرح فتح القدير ٣/٣٣.
[3] نهاية المحتاج ٦/٥.
[4] الانصاف للمرداوى ٨/٤٥٠.

بەوەش تەڵاقەکە ناکەوێت، وەك شیعەی ئیمامی[1] کە وتوویانە پێویستە لەکاتێکدا پاکەو نەچووەتە لای تەڵاقی بدات، ئەوەشیان وتووە ئەم مەرجە سەبارەت بەژنێك کەنەگەیشتبێتە تەمەنی بێنوێژی بوون پێویست نیە، هەروەها بۆ ئەو ئافرەتەی گەیشتۆتە تەمەنی بێئومێدیو لەبێنوێژی کەوتووەو، بۆ دووگیانێك کە دووگیانیەکەی دیارەو، بۆ ئەو ئافرەتەش کەپیاوەکەی تەڵاقی داوەو دوورە لێی.

زاهریەکان[2] وتوویانە هەر پیاوێك ویستی ژنەکەی کەچۆتە لای تەڵاق بدات ئەوا دروست نیە بۆی لەکاتی بێنوێژیو کاتی پاکیەك کەتێیدا چووبێتە لای تەڵاقی بدات، ئەگەر لەپاکیەکدا تەڵاقیدا یاخود لەکاتی بێنوێژیدا ئەوا ئەو تەڵاقەی کاری پێناکرێت هەر هاوسەریەتی وەك پێشتر مەگەر تەڵاقەکە لێکترازانی گەورە (بینونة کبری)بێت لەو کاتەدا دەبێت پابەندبن پێوەی.

بۆچوونی پەسەند لای شیعەی زەیدی ئەوەیە کەناکەوێت[3] لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)، مالکیەکان[4] بۆ ئەوە چوون کەتەڵاقەکە دەکەوێت بەڵام دەتوانێت لەکاتی ماوەی چاوەڕوانیدا بیگێڕێتەوەو دادوەر ناچاری دەکات بەگەڕاندنەوەی، ئەگەر رازی نەدەبوو ئەوا هەڕەشەی بەندکردنی لێدەکات، ئەگەر هەر نەیهێنایەوە ئەوا دادوەر لەبری ئەو فەرمانی گەڕانەوەی دەسەپێنێت لەبەر ئەو ئایەتەی باسمان کرد، هەروەها لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ)بەعومەری کوڕی خەتابی (ﷺ)فەرموو کاتێ عەبدوڵای کوڕی لەکاتی بێنوێژیدا ژنەکەی تەڵاقدا: (مرة فليراجعها)[5]. واتە: فەرمانی پێ بکە بابیگێڕێتەوە.

---

[1] رياض المسائل في بيان الاحكام بالدلائل كتاب الطلاق. مستدرك الوسائل ٦/٣.

[2] المحلى ١٦/١٠.

[3] الروضة الندية ٤٨/٢ ومابايها.

[4] المدونه الكبرى / ٢١١٠/٥ شرح الخرشي /٢٩.

[5] نيل الاوطار ٢٢١/٦.

وایـدەبینم بۆچـوونی پەسـەند بۆچـوونەکەی کۆتاییـە کـەزانایانی مـالکی کاریـان پێکردووەو بۆچوونی هەندێك لەحەنەفیەکانو گێرانەوەیەکی ئیمام ئەحمـەدی کـوڕی حەنبەلە، لەبەر ئەوەی کارکردن بـەم بۆچـوونە کۆکردنـەوەی بۆچـوونەکانی پێشـترە چونکە لەبنەڕەتەوە تەلاقەکە دەکـەوێت وەك ئـەوەی بۆچـوونی زۆرینـەی زانایانـەو، لەرووی مەبەست (المآل)یشەوە ناکەوێت کەئەوەش بۆچوونی هەندێکی دیکەیە.

سەرەڕای ئەوە ئەم بۆچوونە بوار دەداتە مێردەکە کە ژنەکەی لەکاتی پاکێتیەکدا کەنەچـووبێتە لای[١] تـەلاق بـدات ئەگـەر هـاتوو پاسـاوێکی هـەبوو بـەبێ ئـەوەی چاوەڕوانی ژنەکەی بکات، کارکردن بـەم بۆچـوونە بەرژەوەنـدی مێـردو بەرژەوەنـدی ژنەکە پێکەوە کۆدەکاتەوە.

**سێیەم:** مەرجە ژنەکە شیاوێتی بەخشینی (أهلاً للتبرع) تێدا بێت ئەگـەر هـاتوو تەلاقدانەکە بەبەرانبەر بوو، روونو ئاشکرایە خوای گـەورە هـەروەك چـۆن رێگەیـداوە بەتەلاقـدان بـەبێ بەرانبـەر بەهـەمان شـێوە رێگـەی داوە بەتەلاقـدان بەبەرانبـەر (قەرەبوو–عوض) یـك کـەژنو مێردەکـە لەسـەری پێکـدێنو لەزارەوەناسـی زانایـانی شەریعەتدا پێی دەوترێت(خولع) ئەگەرهاتوو وایان گومان برد پابەند نەبێت بە مـافـو پابەندییـەکانی هاوسـەرێتی، خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ[٢] شَيْئًا إِلاَ أَنْ يَخَافَا أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ[٣] فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ[١] بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ)[٢].

---

[١] فەلسـەفەی ئـەوەی کـۆت کـراوە بەنەچـوونە لای لـەکاتی پاکیتیـدا کەتێیـدا تـەلاقی بـدات بـۆ دوورخسـتنەوەیەتی لەپەشـیمانییەك کەلەئاینـدەدا تووشـی ژنو مێردەکـەببێت ئەگـەر بـەهۆی ئـەو چوونەلایەوە منالێك لەدایکبوو.

[٢] واتە مارەییەکەیان.

[٣] واتە مافـو پابەندییەکانی هاوسەرێتی.

دروسته که ئەو قەرەبووە هەموو مارەییەکەی ژنەکە بێت ئیدی لەمێردەکەیەوە وەریگرتبێت یاخود دواخراو (مؤجل) بێت، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کەئیبن عەباس (رضي الله عنهما) دەیگێڕێتەوە کە ژنەکەی سابتی کوڕی قەیس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هیچ رەخنەیەکم نیە لەسابتی کوڕی قەیس لەرووی رەوشتو ئاینەوە بەڵام رقم لەکەمتەرخەمیە[3] پاش موسڵمان بوون، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (أتردين عليه حديقته؟) واتە: ئایا باخچەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی باخچەکە قبوڵ بکەرەوەو یەك تەڵاقی بدە[4]، لەو ئایەتەی خستمانە روو لەگەڵ ئەم فەرموودە پیرۆزەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە(خلع) لەنێوان ژنو مێرددا دروست نیە ئەگەر پاساوێکی رەوا نەبوو، رووکاری بەمەرجگرتنی هەبوونی شیاوێتی بەخشین بۆ ژنەکە ئەوەیە ئەگەرهاتوو قەرەبووەکە لەسامانەکەی بوو ئەوەیە کەتەڵاقدرانی لەلایەن بەرانبەرەکەیەوە بەپارە نابێت، لەبەر ئەوە قەرەبووەکە بەبەخشین لەلایەن ئەوەوە دادەنرێتو بۆ دروستی بەخشینیش شیاوێتی لەبەخشەردا پێویستە[5].

**چوارەم:** نابێت لەماوەی چاوەڕوانی تەڵاقێکی پێشتردا بێت، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ) مەگەر لەکاتێکدا بێت کەماوەی چاوەڕوانی ئەو تەڵاقە دەست پێبکاتو ماوەی چاوەڕوانیش لەکاتی دەستپێکردنیەوە دەست پێناکات چونکە دەرئەنجامی بەدەستهاتووە (تحصيل حاصل)ە ئەوەش مەحاڵە بەکۆدەنگی زانایان.

---

[1] واتە سامانێك کەهەمووی مارەیی بێت یاخود هەندێکی یان جگە لەوە بێت.

[2] سورة البقرة /٢٢٩.

[3] واتە کەمتەرخەمیکردن لەوەی پێویستە لەسەری.

[4] اخرجه البخاري وابو داؤد والنسائي وهو حديث متفق علية – نيل الاوطار – ٦ / ٧٦.

[5] بۆزیاتر ئاگاداربوون بڕوانە دانراومان سەرچاوەی پێشوو ٢ / ٣٢٤ ولاپەڕەکانی دواتر.

**پێنجەم:** مەرجە کەتەڵاقدراوەکە نەخۆش نەبێت لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا لەبەر ئەو درێژەیەی لای زانایان هەیە لەبابەتی (خلع)دا:

أ- هەندێك[1] بۆ ئەوە چوون کەئەگەر ژنەکە نەخۆش بوو ژنەکە بەماڵەکەی خۆی خولعەکەیدا، ئەگەر ژنەکە لەو نەخۆشینەدا مرد ئەوا مێردەکەی کەمترینی میراتیەکەی‌و بەدەلی خولعەکەو سێ‌ یەکی ماڵەکە (میراتیەکە)ی بەر دەکەوێت.

ب- هەندێکی تر[2] وتوویانە ئەگەر ژنە نەخۆشەکە بەهەموو سامانەکەی خولع کردو پیاوەکەش ساغ بوو، ئیمامی مالیك وتوویەتی دروست نیەو تەڵاقەکە بەبێ‌ بەرانبەر دەکەوێت‌و لەسەر ئەو بنەمایەی کەتەڵاقەکە لێکترازانە میراتی ناکەوێت‌و کۆمەڵی زانایانی مالیکی وایان وتووە.

ت- هەندێکی دیکەش[3] وتوویانە ئەوەی ژنە نەخۆشەکە لەسەری بێت بیدات بەمێردەکەی لەبەرانبەر تەڵاقدانەکە ئەوا حوکمەکانی راسپاردن (وصیەت)ی بەسەردا جێبەجێ‌ دەکرێت، چونکە بەخشین (تبرع) بەرانبەرێکی ماڵی نیەو ئەوەی لەسێ‌ یەکی میراتیەکەی زیاتر بێت ئەوا بەتاڵ‌ دەبێت.

پ- هەندێکیش[4] وتوویانە مێردەکە کەمترینی بەدەلەکەو میراتیەکەی لێی بۆ هەیە.

ج- ئەوانەی دیکە[5] جیاوازیان نەکردووە لەنێوان هەردوو حاڵەتی ساغی‌و نەخۆشیدا لەبەر گشتێتی فەرمایشتەکەی خوای گەورە لەو ئایەتەی خرایە روو

---

[1] وەك حەنەفیەکان، بڕوانە: البحر الرائق للزيلعی ٤/٨.

[2] وەك مالکیەکان، بڕوانە: شرح الخرشي ٤/ ٢٠.

[3] وەك شافیعیەکان: المهذب ٢ / ٧٤ زەیدیەکانیش لەگەڵ‌ شافیعیەکاندا هاودەنگن: التاج المذهب ٢/ ١٩١.

[4] وەك حەنبەلیەکان: الانصاف للمرداوي ٨ / ٤١٩.

[5] وەك ئیمامیەکان: الخلاف للطوسي ٢ / ٢٢٢ و زاهریەکان: المحلى ١٠ / ٢٣٥ ولاپەڕەکانی دواتر.

کەسەرچاوەی رەوایەتی خولعە، ئەوەی تێدا نیە کەئاماژە بێت بۆ جیاوازی نێوان خولعی ئافرەتی نەخۆش و خولعی ئافرەتی لەشساغ.

بۆچوونی پەسەند لای ئێمە ئەم بۆچوونەی کۆتاییە، چونکە تەلاقی بەبەرانبەر قەرەبوویەکە کەژنەکە پابەند بێت بیدات بەمێردەکەی هەرچەندە کەسامان نیە لەگەڵ ئەوەدا شتێکی بەبەهایە لای ئافرەتەکە کەخۆی پابەند کردووە پێوەی لەبەرانبەردا، شایانی باسە کە ئەو بەرانبەرە هەروەك ئەوەی دەکرێت سامان (مال) بێت دەکرێت کاریش بێت وەك ئەو تەلاقەی کەژنە تەلاقدراوەکە بەرانبەر بەتەلاقدرانی پابەند بێت بەلەخۆگرتن و پەروەردەی منالەکانی لەسەر بژێوی خۆی.

ئەو کەسەی پابەند دەبێت بەدانی بەرانبەر تەلاقەکە مەرج نیە لەهەموو بارێکدا ژنەکە بێت، بەڵکو دروستە کەسێکی تر بێت وەك بەخێوکار (ولی) و کەسێك کەبیەوێت ژنە خولع کراوەکە بخوازێت پاش تەلاقدران و کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەی.

لەم حاڵەتەدا شیاوێتی ژنەکە بۆ بەخشین مەرج نیە، دروستە کە دەستباو یاخود بچوك یان شێت بێت لەبەر ئەوەی قەرەبووەکە لەسامانی ژنەکە نیەو (خلع)ەکەش لەبەرژەوەندیەتی بەپێی ئەوەی بەخێوکار یاخود دادوەر دەیبینێت، لەو حاڵەتەشدا کەژنە خولع کراوەکە پابەند بێت بەدانەوەی بەرانبەرەکە بەمێردەکەی مەرجە کەژنەکە باڵغ و عاقڵ و سەرپشك و هۆشیار بێت و سەرئەنجامی کاری خولعەکە لەماڵەکەی خۆی یان لەکارەکەی بزانێت.

## گونجاندنی خولع (تكييف الخلع)!

زانایانی شەریعەت بۆچوونیان جیاوازە سەبارەت بەگونجاندنی فیقهی خولع کەئایا تەلاقە یان هەڵوەشاندنەوە (فسخ)، ئەگەر هاتوو تەلاق بوو ئایا لێکترازانە یاخود گەڕانەوەیی، بەمجۆرە لەبارەیەوە قسەیان کردووە:-

حەنەفیەکان وتوویانە خولع تەلاقی لێکترازان[1] (بائن)ە بەو بەڵگەیەی کەقورئان روونی کردۆتەوە کەتەلاق بەقەرەبوو دەبێت و بەبێ قەرەبووش، تەلاقیش بەبەرانبەر تەلاقێکی سەربەخۆ (مستقل) نیە تا ببێتە چوارەم هەروەك لەئایەتی فیدیەدا هاتووەو مالکیەکان[2] و ئیمامیەکان[3] هاودەنگن لەگەڵیان.

شافیعیەکان سێ بۆچوونیان هەیە[4]: بۆچوونێکیان ئەوەیە کە گەڕانەوەییە ئەمە مەزهەبی زاهریەکانیشە[5]، لەسەر مێرد پێویستە قەرەبووەکە بگێڕێتەوە چونکە سامانو گەڕانەوە دژی یەکترنو لەکار دەخرێنو تەلاقەکە لەسەر بنەڕەتەکەی دەمێنێتەوە کەئەویش گەڕانەوەییە.

بۆچوونی دووەمیش تەلاقەکە ناکەوێت ئەگەر بەرانبەری خولعەکە لێخۆشبوون لەمارەییەکە یاخود قەرزەکانی بوو، چونکە هیچ رێگەیەك نیە بۆ کەوتنی خولعەکە جگە لەدروستی لێخۆشبوونەکەو دروستیەکەشی ئەوە دەخوازێت لێکترازان بێتو بۆچوونی سێ یەمیش ئەوەیە کەلێکترازانە.

بەرهەمی راجیاییەکە ئەوەیە کەتەلاقەکە ئەگەر گەڕانەوەیی بوو ئەوا مێردەکە مافی گەڕاندنەوەی هەیە پێش کۆتاییهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکە بەپێچەوانەی ئەوەی کە لێکترازان بێت.

ئەگەر بەو جۆرەش بگونجێنرێت کە هەڵوەشاندنەوەیەو بەیەك بێنوێژی ماوەی چاوەڕوانیەکەی کۆتایی دێتو هەڵوەشاندنەوەش ژمارەی سێ تەلاق کەم ناکاتەوە، ئەگەر پاش تەلاقدرانی دووجار خولعی کرد ئەوا بۆی هەیە بیهێنێتەوە بەبێ ئەوەی

---

[1] المبسوط للسرخسي ٦ / ٢٨٦ و لاپەڕەکانی دواتر.

[2] شرح الخرشي ٤ / ١٢ و لاپەڕەکانی دواتر.

[3] الخلاف في الفقة للطوسي ٢ / ٢١٥.

[4] بڕوانە: (المهذب)ی (لبي اسحاق الشيرازي) سەبارەت بەو سێ بۆچوونەی باسکران.

[5] المحلى ١٠ / ٢٣٠.

پێویست بکات شوو بەمێردێکی تر بکات[1].

بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کە کۆمەڵی زانایانی شەریعەت بۆی چوو، بەگونجاندنی خولع کەتەڵاقی لێکترازانە لەبەر ئەم بەڵگانە:

أ- پێویستی فدیەدان (مقتضی الافتداء)دەخوازێت کەتەڵاقەکە لێکترازان بێت.

ب- هۆکاری پاڵنەر بۆ رەوایەتی خولع بەزۆری بریتیە لە جێ بەجێ نەکردنی سزای خوای گەورە (حدود الله) لەلایەن مێردەکە یان ژنەکە یان هەردووکیان، تەڵاقی لێکترازانیش دەروازەی چاکبوونی مێرد دادەخات بەوەی کەبەویستی تاك لایەنەی دەتوانێت بیگێڕێتەوەو رێگر بێت لەوەی ئەو نەهامەتیە دووبارە ببێتەوە.

ت- هەڵوەشاندنەوە یان ئەوەتا مانای هەڵوەشاندنەوەی گرێبەند و گەڕانەوەی هەردوولایە بۆ ئەو کاتەی پێش دروستبوونی ناتەواوی لەهاوسەرگیریەکە تێیدا بوون ئەمەش سەبارەت بەهاوسەرگیریەك چاوەڕوان نەکراوە کەبەدەر لەهەر ناتەواوی (عیب)یەك ئەنجام درابێت کەهەڵوەشاندنەوە پێویست بکات، یان ئەوەتا مەبەست لێی دەستبەردان بێتو هەرلایەك ئەوەی لەبەرانبەرەکەی وەرگرتووە بگێڕێتەوە بەبێ هیچ کەمو زیادێكو ئەمەش هیچ یەك لەزانایان سەبارەت بەخولع نەیکردۆتە مەرج.

پ- وتنی ئەوەی خولع ئەگەر بەتەڵاقێکی سەربەخۆ دانرا ئەوا دەخوازێت ئەو تەڵاقانەی بۆ مێرد هەیە چوار بێت نەك سێ، بەوەی کەمەبەستە لەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ) کەئەویش بریتیە لەو تەڵاقەی ژنو مێردەکە بۆیان هەیە ژیانی هاوسەرێتیان دەست پێبکەنەوەو تەڵاقی سێ یەمیش لەم فەرمایشتەی خوای گەورە وەرگیراوە: (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ

[1] بۆ ئەم درێژەیە بڕوانە: تفسیر القرطبي ٣ / ١٤٤ و لاپەڕەکانی دواتر.

بِإِحْسَانٍ) واتە: یاخود تەڵاقدان بەشێوەیەکی باش (معروف).

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەش: (فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ) بۆ سێ تەڵاقە دەگەڕێتەوە واتە تەڵاق هەموو جارێك وەك ئەوەی بەبێ بەرانبەر بێت دروستە بەبەرانبەرو قەرەبووش بێت دروستەو ئەمەش پێی دەوترێت (خولع).

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەش: (فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ) روونکەرەوەی تەڵاقە لەجاری سێیەم و کۆتاییدا.

هەڵەیە کەگومان ببرێت کەسێ تەڵاقە لەم ئایەتە وەردەگیرێت[1].

**هەڵوێستی یاسا لە خولع(موقف القانون من الخلع):**

یاسای عێراقی بەرکار[2] هەندێك لەتوخم و حوکمەکانی خولعی لەژێر ناونیشانی جیاکردنەوەی سەرپشکی (التفريق الاختياري) لەخۆ گرتووەو لەمادە (٣٩)دا هاتووە: (مەرجە بۆ دروستێتی خولع کە مێرد شیاو بێت بۆ خستنی تەڵاق و ژنەکە بابەتی بێت بەخولعیش دەکەوێت– تەڵاقی لێکترازان) یاسای مەغریبی بەرکاریش لە(م٥)یدا هاتووە کەتەڵاقدان لەسەر سامان تەڵاقی لێکترازان (بائن)ە.

یاسای سوری لەمادە (٩٥) کردویەتیە مەرج ژنەکە گەیشتبێتە تەمەنی پێگەیشتن (سن الرشد)و لە(م٩٦) دانی ناوە بەمافی گەڕانەوە بۆ هەردوولا بەر لەوەی لای بەرانبەر قبوڵی بکات.

ئوردونیش لە (م١٠٢)دا بۆ دروستی خولع کردوویەتیە مەرج کەمێردەکە شیاوێتی خستنی تەڵاقی هەبێت و ژنەکەش بابەتی بێت.

---

[1] بۆ زیاتر ئاگاداربوون بڕوانە دلنزلومان: مدی سلطان الارادة في الطلاق سەرچاوەی پێشوو ٢ / ٣٤٦ و لاپەڕەکانی دواتر.

[2] باری کەسی ژمارە ١٨٨ی ژمارە ١٩٥٩.

### ئەو ئافرەتەی ڕێگەی خۆ تەلاقدانی پێدراوە (المفوضة بتطليق نفسها):

پێشتر ئەوەمان روون کردەوە کەبنەڕەت لەتەلاقدا ئەوەیە لەلایەن مێردەوە بێت، بەلام وەك هەلاوێرد لەو بنەڕەتە دەکرێت لەلایەن ژنەکەو دادگاشەوە بێت، تەلاقدانیش لەلایەن دادوەرەوە لەبەشی سێیەمدا دێت لەبەر ئەو پاساوانەی رەوایەتی دەداتێ.

بەلام لەلایەن ژنەکەوە ئەوە دەبێت بەرێگەپێدرانی بێت لەلایەن مێردەکەی لەکاتی دامەزراندنی هاوسەرگیریەکەیان یان پاش ئەوەو ناکرێت بەر لەوە بێت.

ئیسلامیش ئەم مافەی داوە بەژن بەو مەرجەی پەیوەست بێت بەهاوسەرگیریەکەوە یاخود پاش ئەوە، ئەمەش مەرجێکی رێگەپێدراوە لەدوو رووەوە:

یەکەمیان مەرجێکە بەتەنیشت بەهاوسەرگیریەکەیەوە و مەرجێکی پەیوەستکراو پێوەی نیە، چونکە دووەم راست نیە نەلەهاوسەرگیریداو نەلەتەلاقدا.

دووەمیش ئەوەیە کەمەرجێکەو دژ نیە لەگەڵ پێویستی گرێبەندەکەداو مافی پەشیمانبوونەوەی مێرد لەو رێگەپێدانە نیە ئیدی چۆن دەبێت بەخاوەنداریتیو بریکاردان، چونکە بریکارێتی هەرچەندە رێکەوتنێکی نا پابەندە بۆ هەریەك لەبریکاردەر بریکار پێدراو، لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر مافی کەسی تر پەیوەست بوو پێوەی هەروەك لەم بابەتەدا هەیە، بۆ بریکاردەر دروست نیە بریکارەکەی لابدات لەبەر ئەوەی مافی ژنەکە پەیوەستە پێوەی، بەلام بۆ مێرد هەیە تەلاقی بدات پێش ئەوەی ژنەکە خۆی خۆی تەلاق بدات.

تەلاقیش لەلایەن ژنەوە وەك تەلاق وایەلەلایەن مێردەوە لە پێکهێنەرو ئەو حوکمانەدا کەباسکرا، هەیانە وەك ئەوەی لێکترازان (بائن) بێت ئەوا دەکرێت

گەڕانەوەیی (رجعی) بێت و بۆ مێرد هەیە ژنەکەی بگێڕێتەوە پێش کۆتاییهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەی[١].

**هەڵوێستی یاسا لەڕێگەپێدان (موقف القانون من التفویض):**

یاسا[٢] دانی ناوە بەڕێگەپێدان و بریکارێتیداو لەمادە (١/٣٤) هاتووە کە: (تەڵاق هەڵگرتنی کۆتی هاوسەرگیریە بەخستنی لەلایەن مێرد یاخود ژنەوە ئەگەر بریکارێتی پێدرا بوو یاخود ڕێگەی درابوو یان لەلایەن دادوەرەوە).

---

[١] شایانی باسە ڕێگەپێدان پێش هاتنی ئیسلام لای عەرەبەکان هەبووە، بەزۆریش ئەو ڕێگە پێدانە بەئافرەتانێکی خاوەن پایەی بەرز دراوە، ئیسلامیش دانی پێدا ناوەو ڕێکی خستوەو گشتگیری کردووە بەهەموو ژنێك.

[٢] واتە یاسای باری کەسی ژمارە ١٨٨ ی ساڵی ١٩٥٩.

# دەروازەی سێیەم:
# شێوازی تەڵاقدان

## ( صيغة الطلاق )

پایەی سێیەم لەپایەکانی تەڵاق پاش تەڵاقدەرو تەڵاقدراو بریتیە لەشێوەی تەڵاقدان بەدەربڕین یان نووسین یاخود ئاماژە بۆ کەسێك کەتوانای دەربڕین یاخود نووسینی نەبێت، ئەویش بریتیە لەهەر گوزارشتێك بەرووني لەروانگەی عورفی شەرعیەوە واتای پچڕانی پەیوەندی هاوسەرێتی بگەیەنێت، زانایانی شەریعەت بۆچوونیان جیاوازە لەنێوان تەنگیو فراوانی لەشێوەی تەڵاقدا، لەبەر رۆشنایی ئەو راجیاییەدا چوارچێوەکەیو پەیوەستکرانی بەژمارەوەو هەڵپەساردنیو سوێند خواردن پێی بەکورتی باس دەکەین:

### یەکەم. چوارچێوەی شێوازەکە (نطاق الصيغة):

أ- زانایانی شیعەی ئیمامی شێوازی تەڵاقیان لەبازنەیەکی تەسکدا قەتیس کردووە کەدەبێت بەدەربڕینی (تەڵاقمدایت) (طالق) بێت، وەك ئەوەی بەژنەکەی بڵێت تۆ تەڵاقدرایت یاخود ئەو ژنە تەڵاقدرا یاخود فلانە ژن تەڵاقدرا[1]، لەسەر ئەم ئاراستەیە ئەو تێبینیە هەیە کەهەرچەندە هۆکارێکە لەهۆکارەکانی کەمبوونەوەی رووداوەکانی تەڵاقو کۆتێك لەسەر ویستی مێرد لەتەڵاقدانی ژنەکەیدا تەنها بەو دەربڕینەو بەدەر لەدەربڕینی دیکە، لەگەڵ

[1] الخلاف في الفقه للطوسي ٢٣١/٢ الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية للعاملي ١٤٧/٢

ئەوەشدا ناڕەحەتی تێدایە بۆ ئەو موسڵمانانەی کەعەرەب نینو ئیسلامیش ئەو ناڕەحەت کردنەی ناوێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: (مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ)[1].

ب- زانایانی زاهری شێوەی تەڵاقیان تەنها لەتەڵاق (طلاق)و جیابوونەوە(فراق)و بدەست لێ بەردان (سراح)و هاوشێوەکانیدا کورت کردۆتەوە[2]، هەڵسەنگاندنی بۆچوونی ئەم ئاراستەیەش بەهەمان شێوەی هەڵسەنگاندنی بۆچوونی ئیمامیە.

ت- کۆمەڵی زانایانی حەنەفی[3]و شافیعی[4]و حەنبەلی[5]و زەیدی[6]و ئەبازی[7]و زۆرینەی مالکی[8] بۆ ئەوە چوون کە دەبڕینی تەڵاق هەموو دەربڕینێکی ئاشکرای رەهایە کەپەیوەست بێت بەنیەتەوەو یەکەم مەبەستی لێی خستنی تەڵاق بێت و هەموو درکەیەکە(کنایە) لەدەربڕیندا کەبەنیەتی تەڵاق خستن بێت.

پێوەری جیاکردنەوەی ئاشکراو درکە (کینایە) بریتیە لەدەربڕینەکە ئەگەر بەزۆری لەرووی حەقیقەتو مەجازەوە بۆ تەڵاقدان بەکار دەهات، ئیدی لەرووی زمانەوە بێت یاخود لەرووی عورفەوە ئەوا بەئاشکرا دادەنرێت ئەگەر نا ئەوا بەدرکە دادەنرێت،

---

[1] سورة المائدة /٦
[2] المحلى ١٠/١٨٥ ولاپەڕەکانی دواتر.
[3] المبسوط ٦/٨٧.
[4] المهذب ٢/٨٢.
[5] الانصاف للمرداوي ٨/٤٦٧.
[6] التاج المذهب ٢/١٢٠.
[7] جوهر النظام في علمي الاديان والاحكام للسالمي ٢/٢١٥.
[8] بڕوانە: حاشية الدسوقي / اللشيخ محمد عرفة الدسوقي على الشرح الكبير لابي البركات سيدي احمد الدردير ٢/٣٣٨.

لەنمونەکانی دەرکەش مێردەکە بەژنەکەی بڵێت (بڕۆرەوە بۆلای خزمو کەسەکانت) لێرەدا تەڵاق بەدرکە (کینایە) ناکەوێت ئەگەر دەربڕینەکەی پەیوەست نەکرابوو بەنیەتەوە.

د- دەربڕینی تەڵاق لەفراوانترین سنووریدا:

هەندێك لەزانایانی مالکی[1] و شافعی[2] بۆ ئەوە چوون کە:

یەکەم. کەوتنی تەڵاق بەدەربڕینێك کەپەیوەندی بەتەڵاقدانەوە نیە ئەگەر هاتوو نیەتی تەڵاقدان بوو، وەك ئەوەی بەژنەکەی بڵێت (ئاومان بۆ بێنە)و مەبەستی تەڵاقدانی بێت.

## دووەم. تەڵاقدان بەقسە لەناخی خۆیدا (الطلاق بالحديث النفسي):

واتە ئەگەر مێرد لەمێشکی خۆیدا تەڵاقیدا ئەوا وەك تەڵاقدانی وایە بەدەربڕینی هەرچەندە کەدەریشی نەبڕیبێت بەوشەیەك ئەگەر لەدەروونی خۆیدا لەسەری سووربێت.

**هەڵسەنگاندنی ئەم بۆچوونە فیقهیانە (تقويم هذه الاراء الفقهية):-**

ئەو بۆچوونانەی خرانە روو کورترەوی‌و زیادەڕەویان تێدایەو هەردوولایان لەشەریعەتی ئیسلامیدا رەتکراونەتەوەو ئیسلام مامناوەندە لەهەموو شتێکدا دوور لەهەر تەنگکردنەوەیەکی نارەحەتکارو لەهەر فراوانکردنێکی شلڕەو (مائع)، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ)[3].

ئەوەی پێویستە بەپێی رۆحی شەریعەتی ئیسلامی کاری پێبکەین ئەوەیە کە

---

[1] المنتقى شرح موطا الامام مالك ١٦/٤.

[2] المهذب لابي اسحاق الشيرازي ٨٢/٢.

[3] سورة البقرة /١٤٣.

باسمان کرد هـەموو دەربڕینێکی روون کەبەپێی نـەریت گوزارشـت بکـات لەپچڕانی پەیوەندی هاوسەرێتی، لەم حاڵەتەدا ئەگەر مێردەکە بانگەشەی ئەوەی کرد کەنیەتی لەو دەبڕینە تەلاقدان نەبووە لێی قبولّ ناکرێت لەدادگادا (قضـاءاً) ئەگـەر نیشـانەیەك (قرینة) نەبوو ئەوە پشت راست بکاتەوە، بەڵام لەرووی ئاینیـەوە (دیانـةً) لێـی قبـولّ دەکرێت.

**هەڵوێستی یاسا لەشێوازی تەلاق (موقف القانون من صیغة الطلاق):**

یاسای باری کەسی عێراقی بەرکار تێیدا هاتووە کە: (تەلاق ناکەوێت بەو دەربڕینە نەبێت کەلەشەرعدا تایبەتکراوە بۆی)م٣٤، ئوردونیش: (تـەلاق دەکـەوێت بـەدەربڕین یـاخود نووسـینو لەکەسێکیشـەوە کـەتوانای نـەبێت بـەئاماژەی زانـراو لێیـەوە دەکەوێت)م٨٦.

## سێیەم: دەربڕینی تەلاقی پەیوەستکراو بەژمارە (صیغة الطلاق المقترن بالعدد):

پێشتر ئەوەمان خستە روو کە قورئانی پیرۆز ئەوەی دیاری کـردووە، کـە تـەلاق، سێ دانە تەلاقە، دابەشیش کراوە، بە سەر سێ کەڕەتدا، لە سێ کاتی جیاوازدا، لـەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ) [1].

جاری سێیەمیش بریتیە لە: (أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)، حـوکمی دووجارەکـە وەهایـە کەپیاوەکە دەتوانێت پەیوەندی هاوسەرێتی بەگەڕانەوە دەست پێبکات ئەگەر هـاتوو تەلاقەکە گەڕانەوەیی بوو، ئەگەر لێکترازان (بائن)یش بوو ئەوا بەگرێبەستی نوێ.

---

[1] سورة البقرة\٢٢٩.

حوكمی جاری سێیەمیش قورئانی پیرۆز روونی دەكاتەوەو خوای گەورە دەفەرموێت: (فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)، پێشتر حوكمەكانی ئەم سێ جارەمان خستە روو.

**بەڵام ئایا حوكمی خستنی سێ تەڵاقە بەیەكجارو لەیەك دانیشتندا كەپیاوەكە پەلە دەكات چی یە؟**

زانایان لەحوكمی ئەم تەڵاقەدا بەسەر چوار بۆچووندا دابەش بوون:

**بۆچوونی یەكەم:** هیچ تەڵاقێكی پێ ناكەوێت [1] چونكە پێچەوانەی دەقی قورئانی پیرۆزە كەفەرمان دەكات بەجار بەبێ ژمارەو پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەریشە، هەر بۆیە بیدعەیەكی خراپەو بیدعەی خراپیش رەتكراوەیە لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ): (من عمل عملا ليس عليه امرنا فهو رد) [2]. واتە: هەركەسێك كارێك ئەنجام بدات كەفەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا رەتكراوەیە.

ئەم بۆچوونەش رەت دەكرێتەوە چونكە ژمارەكان زیاتر لەیەك بیدعەیەو یەك تەڵاقی پێدەكەوێت.

**بۆچوونی دووەم:** جیاوازیكردن لەنێوان ئەو ژنەی مێردەكەی چۆتە لای لەگەڵ ئەو ژنەی كەمێردەكەی نەچۆتە لای، ئەو مێردەی كەنەچۆتە لای ژنەكەی‌و پێی بڵێت تۆم تەڵاقدا بەسێ تەڵاقە (أنتِ طالق ثلاثاً) لێرەدا تەنها یەك تەڵاق دەكەوێت بەدەربڕینی تۆ تەڵاقدراویت(أنتِ طالق)و دەربڕینی سێ (ثلاثا) پوچەڵە (لغو) [3].

---

[1] بڕوانە: مجموعة فتاوى ابن تيمية٣٣\١٠٩ الروضة البهية للعاملي ٢\١٤٨.

[2] بخاری ومسلم.

[3] عەسقەلانی لە( فتح الباري شرح صحيح البخاري ٩\٣٦٣) دەڵێت: پێویست بووە ئەوەی وتوویەتی كە ئافرەتێك مێردەكەی نەچۆتەلای روون بۆتەوە ئەگەر مێردەكەی پێی وت تۆ سێ تەڵاقە درایت ئەوا ژمارەكە هەڵدەوەشێتەوە لەبەر ئەوەی پاش لێكترازان(بينونة) كەوتووە چونكە تەڵاق پێش چوونە لا لێكترازان (بائن)ە.

ئەمەش رەت دەکرێتەوە چونکە دەربڕینی تۆ تەلاقدرایت سێ تەلاقە (أنتِ طالق ثلاثاً)هەمووی یەك رستەیەو بەیەکەوە بەستراوەتەوەو ناکرێت دەربڕینی (ثلاثاً) لە (أنت طالق) جیا بکرێتەوە.

بەڵام ئەگەر پاش چوونەلا بوو ئەوا بەپێی ئەم بۆچوونە سێ تەلاقەکەی پێدەکەوێتو وەڵامی ئەمە لەبۆچوونی چوارەمدا دەدەینەوە.

**بۆچوونی سێیەم:** ئەوەی مێردەکە خستویەتی دەکەوێت ئیدی چووبێتە لای یان نەچووبێتە لای‌و بەڵگەی لەسوننەتەکانی پێغەمبەر بۆ هێناوەتەوە، لەکاتێکدا ئەوانە یان رەتکراوەن یان فەرمووەدەکان (موضوع)ن‌و بەڵگە نین لەسەر خستنی سێ تەلاقە بەیەکجار، لێرەدا بواری خستنە روو قسەکردن نیە لەسەریان[1].

**بۆچوونی چوارەم:** تەلاقی پەیوەستکراو بەژمارە تەنها یەك تەلاقی پێدەکەوێت لەبەر ئەم بەڵگانە:

أ. **قورئانی پیرۆز:** قورئانی پیرۆز فەرمانی کردووە بەدابەشکردنی تەلاق بەسەر سێ جاردا، کەلەیەك دانیشتندا نەبێت‌و بەدەربڕینێکی راشکاوانەو روون بێت‌و ئیجتیهاد قبوڵ نەکات، لەرێسا گشتیەکانیشە کە ئیجتیهاد بواری نیە لەکاتی بوونی دەقدا (لا اجتهاد في مورد النص)، خوای گەورە دەفەرموێت: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)، قورئانی پیرۆزیش بەئاشکرایی باسی سێ جار دەکات‌و دروست نیە راڤەکردنی بەسێ ژمارە، لەنێوان جار (مرة)و ژمارە (عدد)دا جیاوازییەکی روون هەیە کەوەك رووناکی خۆر لەکاتی نیوەڕۆدا روونە، لەنێوان دووجار (مرتين)دا بەشێك کات هەیە بەپێچەوانەی دووان (اثنين) یاخود دوو ژمارە (عددين).

---

[1] بۆ زیاتر ئاگاداربوون بڕوانە دانراومان: سلطان الإرادة في الطلاق في الشرائع و القوانين خلال أربعة آلاف سنة ٢\١٧٦-٢١٢.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە ئەو تەڵاقەی کەژن‌و مێرد مافی ئەوەیان هەیە ژیانی هاوسەرێتیان دەست پێبکەنەوە بەگەڕانەوە یاخود بەگرێبەندی نوێ دووجارە (مرتان)، ئەگەر بۆ جاری سێیەم تەڵاقی دا ئەوا بواری ئەو گەڕانەوەیە نیە تا شوو نەکات بەپیاوێکی ترو بەتەڵاقدان یان مردن لەمێردە نوێیەکەی جیا ببێتەوەو ماوەی چاوەڕوانی ئەو جیا بوونەوەیە کۆتایی بێت ئەمجا دەتوانێت شووی پێ بکاتەوە.

**ب. سوونەتی صەحیحی پێغەمبەر (السنة النبوية الصحيحة):** ئیبن عەباس (ﷺ) دەڵێت: تەڵاق لەسەردەمی پێغەمبەری خودا (ﷺ)و ئەبوبەکرو دوو ساڵ لەجێنشینی عومەردا (رەزای خوایان لێ بێت) سێ تەڵاقە یەك تەڵاق بوو، عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) وتی: خەڵکی لەکارێکدا کەوتوونەتە پەلە کەنەرمی[1] تێدا بوو بۆیان ئەگەر لەسەریان پێویست بکەین ئەوا لەسەریان دەبێت[2].

شایانی باسە کە گەورەمان عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) زۆرجار لەسەر بنەمای سیاسەتی شەرعی گۆڕانی لەهەندێ بنچینەدا دەکردو ئەوانەی پابەند کرد کەپەلەیان لەکاری تەڵاقدا دەکردو هەر سێ تەڵاقەکەیان لەیەك تەڵاقدا کۆدەکردەوەو ئەوەش وەك سزایەکی رووشکێن (عقوبة تعزيرية) بۆیان‌و رێگریش لەوەی کەژمارە (عدد) لەبری جارەکان (مرات) بەکار بهێنن.

پاشان ئەم ئیجتیهادەی کەلەسەر بنەمای سیاسەتی شەرعی لەلایەن گەورەمان عومەری کوڕی خەتابەوە ئەنجامدرا گوازرایەوە بۆ ناو مەزهەبە فیقهیەکان بەتایبەت

---

[1] واتە دەرفەرت (مهلة) چونکە پەیوەندی هاوسەرێتی بەسێ جار کۆتایی دێت نەك یەکجار.

[2] واتە لەسەرمان پێویستکردن (پابەندمان کردن بەسێ جار) وەك سزایەك بۆیان چونکە ئەوەی خوای گەورە لە جارەکان فەرمانی پێکردووە وازیان لێ هێناوەو گۆڕیویانە بۆ بەکارهێنانی ژمارە.

بڕوانە: صحيح مسلم بشرح النووي ١٠\١٠٣.صحيح البخاري بشرح فتح الباري ٩\٣٦٣ سنن أبي داود مع حاشية عون المعبود ٢\٢٢٨.

نيل الأمطار للشوكاني ٦\٢٥٨.

سبل السلام للصنعاني ٢\٢٢٨.

چوار مەزهەبەکەی سوننە، کارکردن بەم سیاسەتە سەقامگیر بوو هەرچەندە بەرژەوەندییە گشتیەکەی پیێ نەهاتەدی کەئەویش مەبەست بوو کە وازهێنانە لەسیێ ژمارەو گەڕانەوە بۆ قورئانو کارکردن بەسیێ جار لەبری ژمارە.

لەرێسا ئوصولیە گشتیەکان کەهاودەنگی لەسەرە ئەوەیە: حوکم لەگەڵ هۆکەیدا بەبوونو نەبوون دەسوڕێتەوە (الحكم يدور مع علته وجودا وعدما)، پاساوی ئەو سیاسەتە شەرعیەش کەباسمان کرد بریتیە لەرێگری لەموسڵمانان کەلەتەڵاقداندا ژمارە بەکار نەهێننو بگەڕێنەوە بۆ بەکارهێنانی جارەکان وەك ئەوەی قورئانی پیرۆز فەرمانی پێکردووە، ئاشکرایە ئەو پاساوە مەبەستکراوە نەهاتەدیو لەئایندەشدا نایەتەدی، چونکە خەڵکی راهاتوون لەسەر بەکارهێنانی ژمارە لەبری جار، لەبەر رۆشنایی ئەو بنەمایەشدا پێویستە وازبهێنرێت لەکار کردن بەو سیاسەتەی باسمان کردو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی کەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرو گەورەمان ئەبوبەکرو گەورەمان عومەری کوڕی خەتاب دوو ساڵی سەرەتای جێنشینی پێش ئەوەی کار بەو سیاسەتە شەرعیە بکات لەسەری بوون، وتنی ئەوەش کە ئەم سیاسەتە شەرعیەی گەورەمان عومەر بۆتە کۆدەنگیەکی بێدنگو پێویستە بەردەوام کاری پێ بکرێت هەڵەیەکەو لێخۆشبوونی بۆ نیە، ئەبێت بەهای کۆدەنگی بێدەنگ (الإجماع السكوتي) لەبەرانبەر دەقی قورئاندا چی بێت کە مەتەواترەو فەرمانی کردووە بەتەڵاق سیێ جار؟

**ج. راڤەی هەندێك لەزانایانو راڤەکاران کەدەربڕینی (الطلاق مرتان) بەتەڵاقی گەڕانەوەی لێکدەدەنەوە لەدووڵاوە رەتکراوەیە:**

یەکەمیان چونکە ئەو ئایەتە کاتێك بۆ پێغەمبەرمان موحەمەد (ﷺ) هاتە خوارەوە تەڵاق بەش نەکرابوو بۆ گەڕانەوەیی و لێکترازان، ئەم دەستەواژانە دواتر زانایانی شەریعەتی ئیسلام دایانهێنا.

رووی دووەم ئەوەیە کەقورئانی پیرۆز حوکمی دوو تەلاقی روون کردۆتەوە کەدروستە ژیانی هاوسەرێتیان دەست پێبکاتەوە، ئەگەر ئەوەمان بەتەلاقی گەڕانەوەیی راڤە کرد ئایا حوکمی تەلاقی لێکترازان بۆ یەکجار یان بۆ دووجار کامەیە؟ سەرەڕای ئەوە ئەم حوکمە بەرانبەر بەحوکمی سێ تەلاقەیە کە قورئانی پیرۆز لەم ئایەتەدا روونی کردۆتەوە: (فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)، بەمەش دەربڕینی دووجار (مرتان) تەلاقی گەڕانەوەیی و لێکترازان دەگرێتەوە.

پاشان ئەو(الـ) لە (الطلاق مرتان)دا هەیە بۆ (للعهد الذكري) بۆ تەلاقی گەڕانەوەی دەگەڕێتەوە کە لەنەریتی نەفامیدا پێش هاتنی ئیسلام هەبوو، ئەویش بریتیە لەهەموو تەلاقێك کەماوەی چاوەڕوانیەکەی کۆتای نەهاتبێت، ئیدی یەك تەلاق بێت یان زیاتر، یاخود تەلاقەکە پێش چوونەلا بێت یان پاش چوونەلا، بەقەرەبوو بێت یان بەبێ قەرەبوو، بەمجۆرە بەو واتایە تەلاقی گەڕانەوەیی و لێکترازان دەگرێتەوە لەشەریعەتی ئیسلامدا.

د. **زۆرێك لەزانایان وتوویانە:** کە سێ تەلاقە هەر سێ تەلاقەکەی پێ دەکەوێت بەپێچەوانەی ئەوەی تەلاق لەجیهانی ئیسلامی و یاسای باری کەسی ئەو وڵاتانەدا لەسەری دەڕوات کەهاودەنگن لەسەر ئەوەی تەلاقی بەژمارە تەنها یەك تەلاقی پێدەکەوێت.

لەو رێسا ئوصولیە گشتیانەی کەهاودەنگی لەسەرە: (إذا حكم القاضي برأي من آراء الفقهاء في مسألة خلافية فقهية، فإن هذا الحكم يرفع الخلاف فيجب العمل بما يقضي به القاضي) واتە: ئەگەر دادوەر بەبۆچوونێك لەبۆچوونەکانی زانایان لەبابەتێکدا کە راجیای لەسەرە حوکمی کرد، ئەوا ئەو حوکمە راجیاییەکە لادەبات و پێویستە کار بەبڕیارەکەی دادوەر بکرێت.

ئاشكرایه كەهەمیشه یاسا بەهێزتره لەحوكمی دادوەر، چونكه دادوەر بەپێی یاسا حوكم دەكات، ئەگەر حوكمی دادوەر راجیایی لابیات و نەیهێڵێت ئەوا لەپێشتره كەبەیاسا نەمێنێت.

دەگەڕێمەوەو جارێكی دیكەش دەیڵێمەوه كەلەبابەتێكدا دەقی لەسەر بوو بواری ئیجتیهاد نیه، ئەو بۆچوونەشی دەڵێت سێ تەڵاقه بەیەكەوه دەكەوێت پێچەوانەی دەقی قورئانەو دروست نیه كاری پێبكرێت.

**هەڵوێستی یاسا لەتەڵاقی پەیوەستكراو بەژماره (موقف القانون من الطلاق المقترن بالعدد):**

یاسای وڵاته ئیسلامییه عەرەبیو ناعەرەبییەكان لەوەدا یەكه كەتەڵاقی پەیوەستكراو بەژماره تەنها یەك تەڵاقی پێ دەكەوێت.

لەو یاسایانه:

یاسای باری كەسی عێراقی بەركار: (تەڵاقی پەیوەستكراو بەژمارەك لەدەربڕیندا یاخود بەئاماژه تەنها یەك تەڵاق دەخات) (م٣٣).

ئوردنی: (مێرد خاوەنی سێ تەڵاقه لەسێ دانیشتندا) (م٨٥).

سوری: (تەڵاقی پەیوەستكراو بەژماره یاخود ئاماژه یان نووسین تەنها یەك تەڵاق دەخات) (م٩٢).

مەغریبی: (تەڵاقی پەیوەستكراو بەژماره یاخود ئاماژه یان نووسین تەنها یەك تەڵاق دەخات) (فصل ٥١).

بەمجۆره هەر وڵاتێك لەوڵاته ئیسلامیەكان بەپێی دادگا ژمارەكه هەرچەند بێت یەك تەڵاق دەخات، بەهەمان شێوه لەعێراق و ناوچه عەرەبیەكانیش، تەنها پێڕی فەتوا لەهەرێمی كوردستانی عێراق حوكم بەوه دەكات سێ تەڵاقه بەیەكجار دەكەوێت، ئەمەش هەڵەیەكه لەشوێنكەوتنی كوێرانەی مەزهەبیەوه سەرچاوەی گرتووەو پاڵی پێوەناون ئەوەی لەمەزهەبەكاندایه بەسەر ئەوەی لەقورئاندا بەدەقی

یەكلاكەرەوە (النص القطعي) هاتووە بەپەسەند بزانین، بەوەی كەتەلاقی پەیوەستكراو بەژمارە تەنها یەك تەلاقی پێدەكەوێت، ئەویش ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: (الطَّلاَقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ).

## چوارەم -تەلاقی هەلپەسێردراو و سوێندخواردن بەتەلاق (الطلاق المعلق والحلف بالطلاق):

زانایانی شەریعەت بۆچوونیان لەمەدا جیاوازەو بواری خستنە رووی بۆچوونە فیقهیەكان و قسە لەسەركردنی نیە لێرەدا، لەبەر ئەوە تەنها بۆچوونی پەسەند دەخەینە روو كەپێویستە لەجیهانی ئیسلامیدا كاری پێ بكرێت كەئەویش نەكەوتنی تەلاقی هەلپەسێردراوو سوێند خواردنە بەتەلاق، لەبەر ئەم هۆكارانە:

١-تەلاقی هەلپەسێردراو نەلەقورئانی پیرۆز نەلە سوننەتی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) و نەلە دادگەری جێنشینە راشیدەكان و هاوەڵان و شوێنكەوتوواندا نەهاتووە، بەڵكو لەسەردەمی ئەمەویەكاندا داهێنراوە.

٢-زانایانی شەریعەت كۆدەنگن لەسەر ئەوەی كەهەموو گرێبەندێك یاخود هەڵسوكەوتێكی هەلپەسێردراو لەسەر مەرج بەتاڵە[1] و ئاشكرایە كەتەلاق مەترسیدارترین هەڵس و كەوتە بۆسەر ژیانی خێزان، لەبەر ئەوە لەپێشترە كەتەلاقی هەلپەسێردراو بەتاڵ بێت.

٣-زانایانی شەریعەت كۆدەنگن كەسوێند خواردن بەجگە لەخوای گەورەو سیفەتەكانی بەتاڵە[2] و لەسەر ئەو بنەمایە سوێندخواردن بەتەلاق بەتاڵەو

---

[1] بڕوانە: الخلاف في الفقه للطوسي ٢٣٠/٢. المحلى لابن حزم ٢١٣/١٠ ولاپەڕەكانی دواتر، اعلام الوقعين ١٠١/٤.

[2] بگەڕێنەوە بۆ (كتاب الايمان) لەهەموو مەرلجیعە فیقهیەكاندا.

ئەوەشی لەسەر بەتاڵ بونیات بنرێت بەتاڵ دەبێت، لەبەر ئەوە تەڵاقەکە نەکەوتووە.

٤-هەڵپەساردنی تەڵاق و سوێندخواردن پێی لەسەردەمی ئەمەویەکاندا داهێنرا کاتێ بەرپرسانی خەلافەتی ئەمەوی نەیارانی دەستەڵاتەکەیان و سیاسەتەکانیان تۆمەتبار دەکردو کاتێ دەستگیریان دەکردن لەو کاتەدا سزای بێبەشکردن لەئازادی نەبوو تابەندیان بکەن یان حەپسیان بکەن، لەبەر ئەوە سوێندیان دەدان بەقورئان کەیارمەتی ئەوانە نەدەن کەنەیارن بەئەمەویەکان، پاشان دەردەکەوت بەدرۆ سوێندیان بەقورئان خواردووە کەیارمەتی نەیارەکان نەدەن و یارمەتیەکانیان بۆ نەیارەکان ئاشکرا دەبوو، لەبەر ئەوە پەنایان بۆ رێگەیەکی تر برد کەئەویش بریتیە لەهەڵپەساردنی بەتەڵاق و سوێندخواردن پێی، سوێندیان بەتەڵاق دەخوارد کەهاریکاری ئەوانە نەکەن نەیارن بەئەمەویەکان، یاخود دەیان وت ئەگەر یارمەتی ئەوانەمدا کەلەدژتان کاردەکەن ئەوا تەڵاقم کەوتبێ، پاشان ئەگەر دەرکەوت درۆ دەکات رێگەیان نەدەدا بچێتەوە لای ژنەکەی و بۆی نەبوو بیگێڕێتەوە، بەمجۆرە ئەم بیرۆکەیە لەسیاسەتەوە گوازرا بۆ شەریعەت و، بۆچوونی هەندێك لەزانایان لەسەر ئەوە چەسپا کەکار بەو سیاسەتە بکەن، ئەم حاڵەتەش بەردەوام بوو تا گەیشتە ئەم سەردەمەو بووە هۆی وێران بوونی ئایندەی ملیۆنەها موسڵمان کە لەرێگەی هەڵپەساردنی تەڵاق یاخود سوێندخواردن بەتەڵاق ژیانی هاوسەریان تێکچوو.

٥-لەرێسا فیقهیە گشتیە هاودەنگ لەسەرەکانە کە: (ان القاضي إذا حكم برأي فقهي في المسائل الفقهية الخلافية يجب العمل بما يحكم به القاضي) واتە: ئەگەر دادوەر بەبۆچوونێکی فیقهی لەبابەتێکی فیقهیدا کە راجیایی لەسەرە حوکمی کرد پێویستە کار بەو حوکمەی دادوەر بکرێت.

**هەڵوێستی یاسا لەهەڵپەساردنی تەلاق و سوێندخواردن پێی (موقف القانون من تعليق الطلاق والحلف به):**

یاسای وڵاتە ئیسلامییە عەرەبی و ناعەرەبییەکان کردویەیانەتە مەرج کەتەلاق پێویستە بەدەربڕینێکی دەست بەجێ (مُنجزة) بێت و بەمەرجەوە هەڵنەپەسەردرێت و بەشێوەی سوێند دەرنەبڕابێت، لەوانەش:

یاسای عێراقی: (ئەو تەلاقە ناکەوێت کە دەستبەجێ نەبێت، یان مەرجدار بێت، یان بەشێوەی سوێند خواردن بەکارهاتبێت)م ٣٦.

ئوردنی: (تەلاقێك دەستبەجێ نەبێت ناکەوێت ئەگەر مەبەست لێی ناچارکردنی بێت بەئەنجامدانی کارێك یان وازلێهێنانی)م ٨٩.

مەغریبی: (تەلاقی هەڵپەسێردراو بەئەنجامدانی کارێك یان وازلێهێنانی ناکەوێت) فصل ٥٢.

هەوڵمداوە لەباسکردنی ئەم بابەتە مەترسیدارەدا شێوازێکی نوێ بگرمە بەر، ئەگەر پێکام ئەوا لەخوای گەورەوەیەو سوپاس و ستایش بۆ خوا، ئەگەر هەڵەش بووم ئەوا لەمنەوەیەو داوای لێخۆشبوون دەکەم لەخوای گەورە کەبەخشەرو بەبەزەییە.

ئەوەی هانیدام بۆ ئەم هەڵبژاردەیە ئەم خاڵانەیە:

١- هەموو ئەو هۆکارانەی لەکاتی مەدرەسەو مەزهەبە ئیسلامیەکانەوە تا ئێستا لێی کۆڵراوەتەوەو، ئەوەی لێی دەکۆڵرێتەوە لەرووی لەبەرچاوگرتنی پاساوەکانی جیاکردنەوە، هەموویان بۆ یەك هۆکار دەگەڕێنەوە کە ئەویش زیان (الضرر)ە.

٢- خستنە رووی هەموو راجیاییە فیقهیەکان و قسە کردن لەبارەی هەموو ئەوەی وتراوە لەکۆن و نوێداو، سەرژمێرکردنی ئەو هۆکارانەی بەبۆچوونی هەر زانایەك پاساوە بۆی و، جیاکردنەوەی ئەوەی داواکردنی جیاکردنەوە رێگە پێدەدات لەوەدا کەرێگە پێنەدراوە، ناکرێت هەموو ئەوە بخرێتە بەردەم دادگا لەجیهانی ئیسلامیدا وەك خزمەتێکی کرداریی و هیچ لەیاسا دانراوەکان زیاد ناکات کەلە فیقهی ئیسلامیەوە وەرگیراوە جگە لە کەلێنی ناکۆکی.

٣- نەبوونی پێوەرێکی ورد بۆ ئەوەی کەبەهۆکار دادەنرێت و ئەوەی کەبەهۆکار دانانرێت، یاسادانەرانی وڵاتە ئیسلامیەکان لەسەر ئەوە راهاتوون کەشێوازی هەموارکردنی یەك لەدوای یەکی یاسای باری کەسی بگرنە بەرو، ماوە ناماوەیەك لیستێکی نوێی هۆکارەکانی جیاکردنەوە دەخەنە روو، وەك ئەوەی یاسادانەری عێراقی لەساڵانی رابوردووی نزیکدا ئەنجامیدا.

٤-ئـەوەی لەگـەڵ ڕۆحـی شـەریعەتدا دەگونجێـت بریتیـە لەلێکۆڵینـەوە لـەزیان‌و سەرچاوەکەی‌و وازهێنان لەژماردنی هۆکارەکانی کـەبێ سـوودە لەمـەدا چـونکە ژیـان لەپێشـکەوتندایەو، کێشـە ئاڵۆزەکـان‌و نەخۆشـینە زیانبەخشـەکان نـوێ دەبێتەوە.

٥-پێوەری ڕاست بـۆ لەبەرچـاوگرتنی هـەموو هۆکارێـك بەپاسـاو بـۆ جیاکردنـەوە بریتیە لەوەی بێتە سەرچاوەی زیانێك کە بونیـاتی ژیـانی هاوسـەرێتی تێکبـدات بەجۆرێك کەژن‌و مێردو هەر دوو ناوبژیوانەکەو دادگاش بگەنە ئەو بڕوایەی جگـە لەجیاکردنەوە ڕێگا چارەیەکی دیکەیان لەبەردەمدا نیە.

٦- ئەو پاڵپشتە شەرعیەی کە دان بەبیرۆکەی زیاندا دەنێت لەجیاکردنەوە لەدادگا بریتیە لـەقورئانی پـیرۆز، لەچـەندین ئایەتـدا باسـکراوە، لەوانـە، خـوای گـەورە دەفەرمووێت: (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ)، لەئایەتێکی دیکەدا هـاتووە: (وَلاَ تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَاراً لِّتَعْتَدُواْ)، هەروەها سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (لا ضـرر ولا ضـرار في الإسـلام[1]) واتـە: زیانگەیانـدن‌و زیـان بـەزیان لابـردن لەئیسلامدا نیە.

٧- مەرج نیە هەموو زیانێك تەنها جیاکردنەوە تاکە ڕێگای چارەسـەرکردنی بێـت، لەبـەر ئـەوە پێویسـتە دەرگـای جیاکردنـەوە بەتـەواوەتی لەلایـەن یاسـادانەری دەسـتکردەوە نەکرێتـەوە، دادگـاش ڕێگـە بەجیاکردنـەوە نـەدات لەبـەر ئـەو هۆکارانەی کەدەکرێت بەڕێگای دیکە چارەسەر بکرێت.

٨- ئەو هۆکارانەی دەبنە پاساو بۆ جیاکردنەوە نابێت بەزۆری بسەپێنرێن بەسـەر دادوەردا، بـەڵکو پێویسـتە دەسـتەڵاتی ڕەهـای مەزەنـدەکردن بدرێتـە دەسـت دادوەر تا ئەو بڕیاریـدات کەجیاکردنـەوە کۆتـا چارەسـەرە کەپـەنای بـۆ ببـات،

---

[1]) ابن ماجة: ٢٣٣٣٢.

ئەمـەش بەسـوود وەرگـرتن لەئـەزموونی زۆری خـۆیو، لەبـەر رۆشـنایی بـیرو بۆچـوونی زانایـانو، بەپشـت بەسـتن بەهـەوڵی دوو ناویژیوانەکـەو توێـژەری کۆمەڵایەتی لەچاکسازیدا.

٩-خوێندنەوەی تێروتەسەل وادەخوازێت کەهۆکارە زیانگەیەنەرەکان کەپاساون بۆ جیاکردنەوە دابەش بکەین بۆ دوو بـەش: خۆویسـتیەکان وەك نـاکۆکیو بـژێوی خەرج نەکردن، خۆنەویستیش وەك کەمئەنـدامی و نەخۆشیەکان، هـەردووکیان یـان ئـەوەتا تایبـەتن بـەژنو مێـرد یـەکێکیان وەك شـلەپەتکی(العنـة) مێـردو داخراوی(الرتق) [1]ی ژن، یان ئەوەتا لەهەردووکیاندا هەیە وەك شێتی.

لەروانگەی ئـەم راسـتیەوە لێکۆڵینـەوە لـەم بابەتـە لـەرووی رووکـارەوە بـۆ سـێ دەروازە دابەش دەکەین، لە یەکەمیاندا بـاس لەنمونـەکانی هۆکـارە خۆنەویسـتیەکان دەکەین، دووەمیش هەندێك هۆکاری خۆویستی لەخۆ دەگرێت، لەگەڵ روونکردنەوەی هەموو ئەوەی پەیوەنـدداره بـەو هۆکازانـەوە لـەناکۆکی لەمەرجـەکانو شـوێنەواریان بەپێی جیاوازی سروشـتی هۆکارەکـە، سـێیەمیش تایبـەت دەکـەین بەخسـتنە رووی هەڵوێستی یاسا لەهەندێ وڵاتی ئیسلامیدا.

---

[1]) مەبەست داخرانی دلەنی ئافرەتە بەهۆی بوونی ئێسکەوە.

## دەروازەی یەکەم:
## جیاکردنەوە لەبەر زیانی خۆنەویست
## (التفريق للضرر اللا ارادي)

مەبەست لەزیانی خۆنەویست بریتیە لەوەی کەویستی هیچ یەك لەژن و مێرد نەبەراستەوخۆ نەبەناڕاستەخۆ نەبەهۆکار دەستی نیە لەدروستبوونیدا، وەك ئەو زیانەی کەبەهۆی ناتەواوی (العلل)و نەخۆشینەکان و کەمئەندامی (العاهات)و نەخۆشینە بێزراوەکان (الامراض المنفرة)دروست دەبن.

زانایانی شەریعەت راجیان لەجیاکردنەوە بەهۆی زیانی خۆنەویستیەوەو سێ بۆچوونیان هەیە:

(بەرەهایی دروست نیە، دروستە بەرەهایی، تەنهاً بۆ ژنەکە دروستە)

سەرچاوەی ئەم را جیاییەش بریتیە لەنەبوونی دەقێکی راشکاو کەبەڵگە بێت لەسەر دروستی جیاکردنەوە بەهۆی زیانێکەوە کەسەرچاوەکەی خۆنەویست بێت.

ئەوەی وتوویەتی دروست نیە دەستی بەنەبوونی دەقەوە گرتووە، بەڵکو وتوویەتی دەقێك هەیە کەپشتگیری مانەوەی هاوسەرێتی و جیانەکردنەوە دەکات، ئەوەشی وتوویەتی بەرەهایی دروستە پەنای بۆ رێسا شەرعیە گشتیەکان بەستووە، لەوانە: (لا ضرر ولا ضرار في الإسلام) هەروەها پشتیان بەپێوانە (قیاس) بەستووە لەسەر سەرپشکێتی لەکەموکورتی (خیار العیب) لەفرۆشتندا، هەورەها بەگوتەی هاوەڵان لەسەر ئەو بنەمایەی کەبەڵگە (حجە)یە.

ئەوەشیان کەجیاوازیکردووە لەنێوان ژن و مێردداو وتوویەتی: جیاکردنەوە هەڵاوێرد (استثناء) لەرێسای کۆتایی نەهاتنی هاوسەرێتی بەمردن و تەڵاق نەبێت، هەڵاوێرد (استثناء)یش بۆ کاتی پێویستی (ضرورة) دەبێت، پێویستیەکانیش بەپێی رادەکەیان

دەخەملێندرێت، جا لەبەر ئەوەی مێرد دەستەڵاتی تەڵاقی هەیە بۆیە بۆ ئەو پێویست نیە.

## وتەی یەکەم - ڕێگری بەرەهایی (المنع مطلقا):

بۆ هیچ یەکێك لەژن و مێرد نیە بەپاساوی هەبوونی زیان لەدادگا داوای جیاکردنەوە بکات و بۆ دادوەریش نیە بەدەم ئەو داوایەوە بچێت.

زانایانی زاهری[1] و هەندێك لەزانایانی زەیدی پەیڕەویان لەمە کردووە.

چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە، کەئەمانە گرنگترینیانە:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا) [2]، زیانی خۆنەویست لەتوانای مرۆڤدا نیەو بەدەرە لەویست و دەستەڵاتی، لەبەر ئەوە بەپێی ئەو ئایەتە لەسەر ئەوە لێپێچینەوەی لەگەڵ ناکرێت.

٢- هاوسەرگیری دروست بەپێی قورئان و سوننەت دەسەلمێت، هەرکەس بەجگە لەقورئان و سوننەت جیاوازی بکات لەنێوانیاندا ئەوا ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە: (فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ) [3].

---

[1] ئیبن حەزم (المحلی ١٠/٥٨) وتوویەتی: (هەر پیاوێك ژنی هێناو نەیتوانی جارێك یاخود چەند جارێکی یەکلەدوای یەك یان هەر نەیتوانی بچێتەلای بۆ دادوەرو کەسی تر نیە لێکیان جیابکاتەوە). هەروەها وتوویەتی (هەمان سەرچاوە ١٠/١٠٩):(شوکردن (نیکاح) پاش ئەوەی بەدروستی ئەنجامدرا ئەوا نە گەری، نەبەبڵەکی، نەبەشێتی، نەبەهەر نەنگیەکی تر کلەژنەکەدا بدۆزرێتەوە، یان ئەو وەهای ببینێت، نەبەشلەپەتك (نەتوانینی ئەنجامدانی چونەلا) نەبەنەخۆشی لەدامەنی ژن و نەبەهیچ شتێك لەو نەخۆشینانە هەڵناوەشێتەوە).

[2] (لا يكلف الله نفسا الا وسعها لها ما كسبت وعليها ما اكتسبت) الاية.

[3] (واتبعوا ما تتلو الشياطين على ملك سليمان وما كفر سليمان ولكن الشياطين كفروا يعلمون الناس السحر وما انزل على الملكين ببابل هاروت وماروت وما يعلمان من احد حتى يقولا انما نحن فتنة فلا تكفر فيتعلمون منهما ما يفرقون به بين المرء وزوجه وما هم بضارين به من احد الا باذن الله ويتعلمون ما ←

٣–نەبوونی پێشینەیەکی دادگایی لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) لەگەڵ خستنە رووی ئەو جۆرە کێشانە کەهێنراونەتە خزمەتی، لەوانە کێشەی هاوسەرەکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی زوبەیر کەتووشی شلەپەتك(العنة) بوو بوو لەگەڵ ئەوەشدا لێکی جیا نەکردنەوە[١].

٤–لەپێویستیە ئاینیەکانە کەهاوسەرگیری دروست تەنها بەتەڵاق و مردن کۆتایی دێت، لەبەر ئەوە دەقێکی راشکاو نیە لەسەر دروستی کۆتایی پێهێنانی پەیوەندی هاوسەرێتی بەجگە لەو دووانە[٢].

تاوتوێکردنی ئەم بەڵگانە:

١–فەرمایشتی خوای گەورە: (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا) بەڵگەیە لەسەریان نەك بەڵگە بێت بەدەستیانەوە، چونکە خوای گەورە مێردی زیان پێگەیشتوو بەهۆی هاوسەرەکەیەوە ناچار ناکات کەئارام بگرێت لەسەر زیانێك کەلەتوانادا نەبێت ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵیدا بەردەوام بێت.

٢–جیاکردنەوە لەبەر زیان پێگەیشتن کارکردنە بەقورئان و سوننەت، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ)[٣]، فەرموودەی

---

یضرهم ولا ینفعهم ولقد علموا لمن اشتراه ما له في الاخرة من خلاق ولبئس ما شروا بـه انفسهم لـو كـانوا یعلمون)(البقرة: ١٠٢).

[١] پوختەی کێشەکە: هاوسەرەکەی عەبدوڕەحمان کەپاش تەڵاقدرانی لەلاین رفاعەوە خواستی وتی بەپێغەمبەر (ﷺ) تەنها وەك ئەم پەتکەی لەلا هەیە، پەتکەکەی بربوو لەژێر عەباکەیەوە بوو، پێغەمبەر زەردەخەنە گرتی و فەرمووی: لەوانەیە بتەوێت بچیتەوە بۆ لای رفاعە؟ تا لەهەنگوینۆکەکەی چێژ وەربگریت و ئەویش لەهەنگوینۆکەکەت چێژ وەربگرێت، مەبەست لەمەش چوونە لایە.

[٢] ئیبن حەزم (١٠ / ١٠٩، ٥٨) دەڵێت:(ئەم ئافرەتە سکاڵای بردە خزمەت پێغەمبەرو ویستی لێی جیاببێتەوە سکاڵاکەی وەرنەگرت و هیچیشی بۆ دیاری نەکردو لەیەکیشی جیا نەکردنەوە.

[٣] وجاهدوا في الله حق جهاده هو اجتباكم وما جعل عليكم في الدين من حرج ملة ابيكم ابراهيم هـو سماكم المسلمين من قبل وفي هذا ليكون الرسول شهيدا عليكم وتكونوا شهداء على الناس فاقيموا الصلاة واتوا الزكاة واعتصموا بالله هو مولاكم فنعم المولى ونعم النصير)(الحج: ٧٨).

پێغەمبەریش (ﷺ): (لا ضرر وضرار في الإسلام)[1]، فەرمایشتی خوای گەورەش: (فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ) لەبارەی جیاکردنەوە لەرێگەی جادوگەری‌و سیحرەوە (الدجل والسحر) هاتووە.

٣- ژنەکەی عەبدوڕەحمان داوای جیاکردنەوەی نەکردووە دەنا پێغەمبەر فەرمانی پێ دەکرد، چونکە کاری پێغەمبەر نەهێشتنی زیان‌و لابردنی ستەم بووە، پرسیارەکەی لەبارەی حوکمی گەڕانەوەی بووە بۆ لای مێردی پێشووی ئەگەر عەبدوڕەحمان تەڵاقیدا بەو نزیکایەتیەی کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (لا حتى تذوقي عسيلته ويذوق عسيلتك)[2] واتە تاچێژی لێ وەربگریت‌و چێژت لێ وەربگرێت، مەبەست چوونەلایە.

٤-ئەو بەباشزانین (استصحاب)ەی پەنایان بۆ بردووە دژە لەگەڵ دەقی: (لا ضرر ولا ضرار)و هاوشێوەکانی، لەرێسا ئوصولیەکانە: (ان الاستصحاب لا يعمل به الا عند عدم وجود النص، واذا تعارض معه يُقدم عليه النص) واتە: بەباشزانین کاتێ کاری پێدەکرێت کەدەق لەئارادا نەبێت، ئەگەر دژ بوو لەگەڵیدا ئەوا کار بەدەق دەکرێت.

## وتەی دووەم: دروستی جیاکردنەوە لەبەر زیانی خۆنەویست (جواز التفريق بالضرر اللا ارادي):

کۆمەڵی زانایانی مالکی‌و، شافعی‌و حەنبەلی‌و، جەعفەوری‌و، کۆمەڵی زانایانی زەیدی‌و، ئەبازی بۆ ئەوە چوون کەبڵێن دروستە جیاکردنەوە لەرێی دادگاوە لەبەر زیانێك کەهۆکارەکەی نەخۆشی‌و کەموکورتی خۆنەویست بێت، لەگەڵ جیاوازییان

---

[1] مراسيل أبوداود ٤٥١.

[2] البخاري: ٥٣٤٦.

لەوردەكاریدا، بەمجۆرە:

**مالكیەكان:**

نەخۆشینەكان‌و كەم‌وكورتیەكان (عیوب)ی كەپاساون بۆ جیاكردنەوە لایان دیاری كراوە: هەیانە هاوبەشە گەڕی‌و بەڵەكی(جذام والبرص)، هەیانـە تایبەتـە بـەمێرد وەك شلەپەتك (العنة) [1]، هەشیانە تەنها تایبەتە بەژنەكە وەك داخرانی دامەن لەبەر بـوونی گرێ‌و ئێسك(الرتق والقرن) [2].

ئەوان سەرەڕای كاركردن بەبیرۆكەی دیاریكردنی هوكارەكان بەمـەرجیان گرتـووە ئەم خاڵانەی تێدا بێتە دی:

١-دەبێت هۆكارەكە لەكاتی گرێبەندەكەدا هەبووبێت، هۆكارە لەناكاوەكان پـاش هاوسەرگیری- جگە لە گەڕی‌و بەڵەكی زیاندەر- نابێتە پاساو بۆ جیاكردنەوە [3].

٢-نابێت ئەوەیان كەساغە پێش گرێبەندەكە ئاگادار بێت، یاخود پاش ئەوە پێی رازی بێت، چونكە زانینی كەم‌وكورتی‌و رازیبوون پێی بەوتە یاخود كردار ئـەو مافـەی ناداتێ داوای جیاكردنەوە بكات.

٣-داوای جیاكردنـەوە بـۆ مـاوەی سـاڵێك لەبـەروارى بەرزكردنـەوەی داواكـەوە لەهەموو نەخۆشینێكدا كەئومێدی چارەسەركردنی هەیە دوا بخات.

---

[1] شلەپەتك (العنة): نەبوونی توانای ئەنجامدانی سكێس لەبەر لاوازی یاخود پیری یان نەخۆشین.

[2] (القرن) كە پیتی(ق) و(ر) سەرەیان لەسەر بێت، گرێیەكە لەدامەنی ژنەكەدا رێگرە لەپەیوەندی سێكسی، (الرتـق)یش كـە پیتـی(ت) سـەرەی لەسـەر بێـت، بەیكـەوە نوسـانی دامـەنی ژنەكەیـە بـەهۆی بـوونی ئێسكەوە كەدەبێتە رێگر لەئەنجامدانی پەیوەندی سێكسی.

[3] لە كتێبی ( شرح الخرشـی) (٢٣٥/٣)دا هـاتووە:(ئـەو ناتەولوییەیـە كـە سەرپشـكێتی بـۆ ژن‌و مێردەكـە یەكێكیان پێویست دەكات لەسەر خاوەنەكەی بەو مەرجەی لەكاتی گرێبەند یان پێش ئەوە هـەبوبێت، ئەوەی لەناكاو دواتر پەیدا بووە ئەوا سەرپشكێتی پێویست ناكات مەگەر بەهەڵاوێن).

پاش هاتنەدی ئەم مەرجانەش مالکیەکان دوو بۆچوونیان هەیە: یەکەمیان دادوەر لەجیاتی مێردەکە تەلاقی دەدات گەر رازی نەبوو خۆی تەلاقی بدات، دووەمیشیان دادوەر فەرمان بەژنەکە دەکات خۆی تەلاق بداتو پاشان ئەو بڕیار بەوە دەدات، جیاکردنەوەش بەپێی هەردوو بۆچوونەکە تەلاقی لێکترازان (بائن)ە[1].

**شافعیەکان:**

زانایانی شافیعی هەستاون بەدیاریکردنی هۆکارەکان، لای ئەوان حەوتن، هەیانە هاوبەشە وەك: شێتیو گەرِیو بەڵەکی، هەیانە تایبەتە بەمێرد وەك: شلیو بڕاوی ئەندامی نێرینە(عنة والجب)[2]، هەیانە تەنها بۆ ژنە وەك: بوونی ڕێگری گرێو ئێسك لەدامەنی ژندا (كالرتق والقرن)، ئەم مەرجانەیان بۆ جیاکردنەوە بەپێویست زانیوە:

١. دەبێت داواکاری جیاکردنەوە راستەوخۆ پاش زانینی ناتەواوییەکە بێت، هەر دوا خستنێك بەبێ پاساو دەبێتە هۆی کەوتنی مافەکە، وەك پێوانەکردن بە سەرپەشکێتی ناتەواوی (خيار العيب) لەفرۆشتندا.
٢. دەبێت جیاکردنەوە بەهۆی شلەپەتك (العنة) پاش دوا خستنی ساڵێك لەمێژووی داواکە بێت.
٣. سەلماندنی ئەو هۆکارەی بانگەشەی دەکات لای دادوەر.
٤. نابێت شلەپەتك (العنة)ەکە بەهۆی ڕووداوێکەوە بێت پاش چوونەلا ئەگەر وابێت پاساوی جیاکردنەوەی نابێت.
٥. نابێت هەردوولایان شێت بێت، چونکە جیاکردنەوە پاش داواکاری لەلایەن لایەکیانەوە دەبێتو شێتیش شیاوێتی بەرزکردنەوەی ئەو داوایەی تێدا نیە.

---

[1] الدسوقي على الشرح الكبير ٢ – / ٣٣٧.
[2] واتە ئەندامی زاوزێی مێردەکە بڕا بێت.

٦. پاش لێکۆڵینەوە لەو مەرجانە دادوەر ئەرکی جیاکردنەوە لەخۆ دەگرێت، ئەگەر وانەبوو ئەوا فەرمانڕەوا (حاکم) ئەو کارە ئەنجام دەدات، ئەگەرنا ئەوا بۆ ژنەکە هەیە خۆی هەستێت بەهەڵوەشاندنەوەی لەبەر پێویستی، جیاکردنەوەکەش هەڵوەشاندنەوەیە (الفرقة فسخ)[1].

**حەنبەلیەکان:**

لای ئەمان جیاوازی نیە لەنێوان جیاکردنەوە لەبەر ناتەواوی ئەندامی زاوزێ (العلل التناسلية) کەرێگر بێت لەسەرجێی ژن‌و مێرد، بەڵام ئەگەر رێگرەکە لای هەردوولا هەبوو بەوەی پیاوەکە شەلەپەتك (عنين)و ژنەکەش دامەنی بەستراو (رتقاء)بوو، لەوتەیەکیاندا لێك جیاناکرێنەوە[2].

جیاوازیەکانی دیکەش ئەوا هیچ جیا راییەکی تێدا نیە بۆ جیاکردنەوە وەك شێتی‌و گوڵی‌و بەڵەکی، جگە لەو سیانە لەوانەی دیکەدا دوو بۆچوونیان هەیە: یەکەمیان بریتیە لە هەڵبژاردەی ئیبن تەمیەو ئیبن قەیم مافی داواکاری جیاکردنەوە بەهەموو نەخۆشی یان ناتەواو (عارض) کەزیان بەلایەنی بەرانبەر بگەیەنێت بەبێ دیاریکردن دەسەلمێت[3].

مەرجەکانی جیاکردنەوە بەهۆی نەخۆشین‌و ناتەواوی (علل) لای حەنبەلیەکان بریتیە لە:

---

[1] المهذب ٢ / ٤٨. الشرقاوي ٢٢٥٢. نهاية المحتاج ٦ / ٣٠٢.

[2] المحرر ٢ / ٢٤.

[3] زاد المعاد (٤/٣١) تێیدا هاتووە:(پێوانە ئەوەیە کەهەموو ناتەواوی (عیب)ێك کەلایەنی بەرانبەر لێی هەڵبێت و ئەوەی ژنهێنان لێی مەبەستە بەهۆیەوە نەیەتەجێ لەسۆزو بەزەیی ئەوا سەرپشکێتی پێویست دەکات، خوای گەورە هەرگیز زیانلێکەوتوویەك یاخود مافخوراوێکی ناچار نەکردووە بەوەی زیانی پێدەگەیەنێت یان مافی دەخوات، هەرکەس لەمەبەستەکانی شەرع رابمێنێت لەسەرچاوەو بابەتەکان‌و دادپەروەری‌و دڵنیایی‌و ئەو بەرژەوەندیانەی لەخۆی گرتووە ئەو گوتەیەو مەبەستەکانی لەبنەما شەرعیەکاندا لای شاراوە نیە.

١. دەبێت هۆکارەکە لەکاتی گرێبەندەکەدا هەبێتو لایەنە ساغەکە پێی نەزانێت، ئەگەر پاش ئەوە هەبێت ئەوا دووبۆچوونیان هەیە: لەیەکێکیاندا دروست نیە جیاکردنەوە.

٢. لەجیاکردنەوە بەهۆی نەتوانینی سێکسیەوە پێویستە ساڵێك دوا بخرێت لەکاتی بەرزکردنەوەی داواکەوە.

٣. بەرزکردنەوەی داواکاری لەزیان پێکەوتووەوەو بڕوا پێهێنانی دادوەر بەبوونی زیانەکە[1].

## جەعفەریەکان:

زانایانی جەعفەری وەك کۆمەڵی زانایان ئەو ناتەواوییانەیان دیاریکردووە کەدەبنە پاساو بۆ جیاکردنەوە، (عاملی) دەڵێت: ئەو ناتەواویانەی کەدبنە ڕێگەدەر بۆ هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرگیری لەپیاودا بریتیە لەم پێنجە: شێتی، خەساوی، بڕاوی، شلەپەتك، گولی (الجنون والخصاء والجب والعنة والجذام)، ناتەواوی (عیب)ی ئافرەتیش ئەم نۆیەیە: شێتی، گولی، بەڵەکی، کوێری، و داخرانی دامەن بەگرێو ئێسك و پارچەگۆشتی زیادە لەخوار دامەن و لەدەستدانی کچێنی (الجنون والجذام والبرص والعمي والعفل والرتق والافضاء).[2]

بۆ جیاکردنەوەش لەبەر ئەو ناتەوایانە دەبێت ئەم مەرجانە بێتە دی:

١- دەبێ داواکارییەکە یەکسەر دوای زانینی عەیبەکە بێت، ئەگەرنا مافی دەکەوێت.

٢- ئەگەر هۆکارەکە لەپیاوەکەدا بوو ئەوا نابێت لەناکاو پاش چوونەلا ڕوویدابێت، با چوونەلاکەش تەنها بۆیەکجار بێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت جیاکردنەوە بۆ

---

[1]) منتهى الارادات ٢ / ١٨٨. الاقناع ٢/ ٧٨.

[2]) الروضة البهية ٢ / ١٨٨ و لاپەڕەکانی دواتر. شرائع الاسلام ٢/ ٣٠ – ٣٢.

ماوەی ساڵێك لەبەرواری بەرزکردنەوەیەوە دوا بخرێت.

٣- لەخەوش (عیب)و نەخۆشیەکانی ژندا ئەگەر لەناکاو پاش گرێبەندەکە روویدا، ئەوا سێ بۆچوونیان هەیە:

أ. بەرەهایی سەرپشك نیە لەداوای جیاکردنەوە، لەبەر تەواوێتی گرێبەندەکەو بەدواداهاتنی حوکمەکەی.

ب. بەرەهایی سەرپشکە وەك کارکردن بەرەهایەتی هەندێك لەدەقەکان.

ج. پاش چوونەلا بۆی نیەو پێش ئەوە مافی داوای جیاکردنەوەی بۆ هەیە.

د. جیاکردنەوەش لای ئەوان بەهەڵوەشاندنەوە دادەنرێت.[١]

## زەیدیەکان:

ئەمانیش بەهەمان شێوە پابەندن بەدیاریکردنەوەو دەڵێن: ئەو خەوشانەی دەبنە پاساو بۆ دوای جیاکردنەوە یازەدن، هەیانە هاوبەشە لەنێوان ژن‌و مێرددا، ئەوانەش بریتین لە: (شێتی‌و گەری‌و بەڵەکی‌و، نەبونی شیاوێتی (الجنون، والجذام، والبرص، وعدم الكفاءة) سیانیشیان تایبەتن بەژنەکەو بریتین لە: بەسترانی دامەنی بەگرێ‌و ئێسك‌و زیادەگۆشت لەخوار دامەن (قرن ورتق والعفل.)و سیانیشیان تایبەتە بەپیاوەکە ئەوانیش: براو، خەساو، هێلکەپوچی (الجب والخصي والسل)[٢].

بەڵام جیاکردنەوە لەبەر شەلەپەتك (عنە) ناکۆکن لەسەری، هەیانە وەك هۆکارێکی جیاکردنەوەی دانانێت ئیدی پێش چوونەلا روویدابێت یاخود پاش چوونەلا، هەندێکی دیکەیان خەوش‌و نەخۆشینەکانیان دیاری نەکردووە، بەڵکو وایان داناوە هەموو

---

[١] الروضة البهية ٢/ ١٢٦.

[٢] هێلکەپوچی لەگەڵ مانەوەی ئەندامی نێرینە.

زیانگەیەنەرێك بەلایەنی بەرانبەر پاساوە بۆ داوای جیاکردنەوە[1]، هەروەك ئیبن تەیمیەو ئیبن قەیمیش هەمان شتیان وتوە.

لای زەیدیەکان بۆ جیاکردنەوە لەبەر ئەو هۆکارانەی خرانە روو پێویستە ئەم مەرجانە هەبێت:

١- نابێت هۆکارەکە لەناکاو بێت پاش چوونەلا- بەجیا لە شێتیو گەڕیو بەڵەکی کەبەهۆی مەترسیانەوە جیاوازی نیە لەنێوان کۆنو نوێدا.

٢- نابێت لەو کەسانەوە دەربچێت کەمافی سەرپشکیان هەیە، ئەمەش گوزارشتە لەرەزامەندیو بەو پێیە مافی داوای جیاکردنەوە بەمانە بەتاڵ دەبێتەوە:

أ- ئەگەر پێش گرێبەندەکە هۆکارەکەی زانیو لێی بێدەنگ بوو.

ب- ئەگەر پاش گرێبەندەکە پێی زانی و لێی بیدەنگ بوو.

ت- ئەگەر چوونەلا یاخود پێکەوەبوونی بەپەنهان (الخلوە) روویدا، یاخود پاش زانینی خەوشەکەی ژنەکە خۆی دا بەدەستەوە، ئەوا چوونەلاو پێکەوەبوونی پەنهان مافی داوای جیاکردنەوە بۆ مێرد ناهێڵن، یاخود خۆبەدەستەوەدانی ئافرەتەکەش مافی جیاکردنەوەی بۆ ناهێڵێت.

٣- ئەگەر هەردووکیان خەوشیان تێدا بوو، ئیدی خەوشەکەی هەردووکیان وەك یەکبوو یاخود جیاواز بوو ئەوا هیچ کامیان سەرپشك نابێت.

ئەگەر ئەو مەرجانەش هاتەدی ئەوا هاوسەرگیریەکە بەرەزامەندی هەردوولا هەڵدەوەشێتەوە بەبێ پێویستی پەنا بردن بۆ دادگا ئەگەر هاتوو ئەو خەوشەی پاساوە بۆ جیاکردنەوە هاودەنگی لەسەر بوو لەمەزهەبەکاندا، ئەگەر بەرەزامەندیان

---

[1] لە: المنتزع المختار (٢/ ٢٣٩)دا هاتووە:(دادوەر حسین دەڵێت: دیاری نەکراون بەڵکو هەر رێگرێك ببێتە هۆی نەمانی ئارەزووی سێکی ئەوا مارەبڕینەکەی پێ رەت دەکرێتەوە.

جیانەبوونـەوە، یـاخود هۆکارەکـە جیـارایی لەسـەر بـوو ئـەوا بـەبڕیاری دادوەر جیـا دەبنەوە.

جیاکردنەوەش بەهۆی خەوشەوە ئیدی بەرەزامەندیان بێـت یـان بـەبڕیاری دادگـا لای ئەمان هەڵوەشاندنەوەیە.[1]

**ئەبازیەکان:**

زانایانی ئەبازی بۆ ئـەوە چـوون کـەمافی سەرپشـکی بـۆ ژنو مێـرد هـەردووکیان سەلماوە ئەگەر لەمێردەکەدا نەخۆشیەکی ئەندامی زایەنـد یـاخود پـەتا یـان بێـزراو هەبوو، هەروەها هەستاون بەدیاریکردنی شێتیو گەڕیو بەڵەکیو بڕاویو شـلەپەتکو وتوویانە: بەجگە لەو نەخۆشیانە جیاناکرێنەوە.

سەرەڕای دیاریکردن بەمەرجیان گرتووە ئەمانەی تێدا بێت:

١-هۆکارەکە پێش گرێبەند هەبێت بـەڵام لەلوایـدا بەلـەناکاوی رووبـداتو پـاش چوونەلا ئەوا دوو بۆچوونیان لەبارەوە هەیە: یەکێکیان وایە نابێتە پاساو.

٢-نابێت لایەنی بەرانبەر پاش ئاگاداربوون لێی پێی رازی نەبێت بەڵام بەمەرجیان نەگرتووە دەستبەجێ بێتو یاخود ئەوەیان کەداوای جیاکردنەوە دەکات ساغ بێتو ئەو نەخۆشینانەی تێدا نەبێت.

وتوویانـە: مـافی داوای جیاکردنـەوە پـاش چـاکبوونەوە لەنەخۆشـینەکەش هـەر دەمێنێت، چونکە توشـبوو بەنەخۆشـینی درم ئەگـەری دووبـارە بوونـەوەیان هەیـە، بەهەمان شێوە بڕیاری دادوەریان بۆ جیاکردنەوە بەمەرج دانەناوە[2].

جیاکردنەوەکەش لای ئەوان هەڵوەشاندنەوەیە.

---

[1] التاج المذهب ٢/ ٦٣-٦٦. المنتزع المختار ٢/٢٣٩.

[2] شرح النيل وشفاء العليل ٣/٢٤٤-٢٤٩.

ئەمــە درێــژەی بۆچــوونی کۆمــەڵێ زانایانــە کەوتوویانــە: جیاکردنــەوە بــەهۆی نەخۆشینەکان و ناتەواوی و درمە بێزراوەکان و نەخۆشینە درێژخایەنەکان.

ئەم تێبینیانە لەسەریان هەیە:

١- دەسـتگرتنیان بـەدیاریکردنی نەخۆشـین و پاسـاوەکان لەهەنـدێك شـێوەداو وازهێنـان لەهەنـدێك شـێوەی تـری دژە لەگـەڵ پاسـاو (علـە)ی پاسـای جیاکردنەوە، لەبەر ئەو هۆیانە کەئەویش بریتیە لە نەهێشتنی زیان، پێویست بوو حوکمەکە لەگەڵ پاساوەکەیدا بەبوون و نەبوون بگەڕایە، هەرکاتێ زیانەکـە دروست بوو کەلەتوانا بەدەر بوو ئەوا بڕیار بەدروستی جیاکردنەوەکە دەدرێـت بەچاوپۆشی لەوەی سەرچاوەی زیانەکە چیە.

٢- بەهەند وەرگرتنی رازیبوون بەخەوشەکە لە رۆژێکدا یـاخود دواخسـتنی داوای جیاکردنەوە، یان ئەوەی هۆکارەکە لەناکاو بێت پاش گرێبەند یاخود چـوونەلا لەدەستدەری مافی داوای جیاکردنەوەیە، ئەمانە یەکناگرنەوە لەگـەڵ رەهـایی ئەم فەرمایشتەی خوای گـەورە: (وَمَـا جَعَـلَ عَلَـيْكُمْ فِـي الـدِّينِ مِـنْ حَـرَجٍ)[1]، هەروەها گشتگیری ئەم فەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ): (لا ضـرر ولا ضـرار)[2]. چـونکە دەبڕینـی (حـرج) رەهایـەو هـەموو حاڵەتـەکان دەگرێتـەوە، هـەردوو دەربڕینـی (ضـرر وضـرار) (نكرتـان واقعـان في حيـز النفـي) مانـای گشـتگیری دەدەن، رەهـاو گشـتگیر کـار بەرەهایەتیەکـەیان دەکرێـت ئەگـەر هـاتوو نیشانەیەك نەبوو ئەوە بگەیەنێت کە کۆت کراوەو گشتیش کار بەگشتێتیەکەی دەکرێت ئەگەر هاتوو بەڵگەیەك نەبوو لەسەر تایبەت کردنی، لێرەشدا نەبەڵگـە هەیە نەنیشانە.

---

[1] سورة الحج/ ٧٨.

[2] السنن الكبرى للبيهقي ١٥٨/٦.

## وتەی سێیەم: مافی جیاکردنەوە بەهۆی ناتەواوی و نەخۆشی کەتەنها بۆ ژن چەسپاوە (حق التفريق للعلل والامراض ثابتة للزوجة فقط):

ئەمەش بژاردەی کۆمەڵی زانایانی حەنەفیەو وتوویانە:

مێرد خاوەنی تەڵاقە، ژنیش مافی داوای جیاکردنەوەی هەیە ئەگەر مێردەکەی تووشی ناتەواوی (علە)یەك بوو لەناتەواویەکانی ئامێری زایەند وەك شەلەپەتكو براوی‌و خەساوی، بەڵام سەبارەت بەنەخۆشیە درم‌و بێزراوەکانی دیکە نە ئەبو حەنیفەو نەیوسف ئەو مافە بەژن نادەن، چونکە بنەڕەت لای ئەوان نەبوونی بژاردەیە بەهۆی پوچەڵکردنەوەی مافی مێردەوە، بەڵکو ئەو مافە تەنها بەنەخۆشیەکانی ئەندامی سێکسی دەچەسپێت لەبەر ئەوەی دەبێتە کێشە بۆ ئەو مەبەستە شەرعیەی کەلەپێناویدا هاوسەرگیری دانراوە[1]، موحەمەدی هاوەڵی ئەبو حەنیفەش جیاوازی نەکردووە لەنێوان خەوشی ئەندامی زاوزێ‌و هی دیکەدا لەسەلماندنی مافی داوای جیاکردنەوە بۆ ئافرەتەکە[2]، لێیەوە دەگێڕنەوە کە نەخۆشیەکانی جگە لەئەندامی زایەندیشی دیاری کردووە وەك شێتی‌و گەری‌و بەڵەکی، بەڵام کاسانی وایدەبینێت کە پێشەوا موحەمەدی هاوەڵی ئەبو حەنیفە نەخۆشین‌و ناتەواویەکانی قەتیس‌و دیاری نەکردووە[3].

---

[1] فتح القدير ٤/ ٣٠٥.

[2] سەرچاوەی پێشوو. المبسوط ٥/١٠٤.

[3] البدائع (٣/ ١٥٣٦ — ١٥٣٧) تێیدا هاتووە:(بەڵام ئەگەر مێردەکە ئەو پێنج خەوشەی بڕلو و شلەپەتکی‌وخەسان‌و نێرەموکی (الجب والعنة والخصاء والخنوثة)ی تیا نەبوو ئایا مەرجە بۆ پابەندی مارەبڕین؟ ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف وتوویانە: مەرج نیەو نابێتە هەڵوەشێنەرەوەی مارەبڕینەکە. موحەمەدیش وتوویەتی: بەدەربوونی لەهەموو خەوشێك کەتوانای ژیان بەبێ زیان لەگەڵی نەمێنێت وەك شێتی‌و گەری‌و بەڵەکی لەمەرجەکانی پێویستی مارەبڕینە، تا مارەبڕینی پێ هەڵبوەشێتەوە.
رووکاری وتەکەی موحەمەد: بژاردە لەو پێنج خەوشە لەپێناوی دوورخستنەوەی زیان لەژنەکە چەسپاوە، ئەم خەوشانە لەزیانگەیاندن بەژنەکە لەوانەی تر زیاترە چونکە ئەگەر زیان بەوان بسەلمێت
←

بەمەش بۆچوونی موحەمەد هاودەنگە لەگەڵ بۆچوونی ئیبن تەیمیەو ئیبن قەیم لەحەنبەلیەکانو، قازی حوسێن لە زیدیەکان لەوەی کە پاساو (علل)و نەخۆشینەکانی دیاری نەکردووەو چونکە پێوەر لێرەدا ئەو زیانە خۆنەویستیەیە بەچاوپۆشی لەسروشتی نەخۆشینەکە مادام هاوسەرەکەی دیکە ناتوانێت ئەو زیانە بەرگە بگرێت، ئەبوحەنیفە و ئەبو یوسف بەوە بەڵگەی نادروستی جیاکردنەوە بەهۆی نەخۆشینە نا ئەندامیە زایەندیەکان دەهێننەوە لەبەر ئەوەی بژاردە بەو خەوشانە لەبەر دوورخستنەوەی زیانی فەوتانی مافێکیەتی کەشایستەیەتی بەهۆی گرێبەندەوە کەئەویش یەکجار چوونەلایەتی (الوطء) ئەو مافەش بەو خەوشانە نەفەوتاوە چونکە پێکەوەبوونی هاوسەرێتی بێجگە لەنەخۆشینەکانی ئەندامی سێکسی دێتە دی لەبەر ئەوە بەو بژاردەیە ناسەلمێت[1].

سەیرو سەمەرەیە کەئەو دوو زانا گەورەیە وایدابنێن مافی چێژ وەرگرتنی مێرد لەژنەکەی بەتەنها یەکجار چوونەلایەتی، وابیبینن کەپێکەوەبوونی هاوسەرێتی تەنها بریتیە لەبابەتی سێکسی، نەخۆشینەکانی بەدەر لەئەندامە زایەندییەکان نابێتە رێگر لەبەدیهێنانی، لەکاتێکدا پێکەوەژیان بریتیە لەئارامیو سۆزو خۆشەویستیو بەزەیی‌و ئەو رەنگانەی دیکەی پێکەوە شادی هاوسەرێتی، هەروەك قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێکردووە لەم ئایەتەدا: (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ)[2].

---

ئەوا لەپێشترە کەبەئەمان بسەلمێت، بەپێچەوانەی ئەوەی ئەگەر ئەو خەوشانە لەلای ژنەکەوە بوو چونکە مێرد با زیان پێگەیشتووش بێت بەڵام دەتوانێت ئەو زیانە لابدات بەهۆی تەڵاقەوە لەبەر ئەوەی تەڵاقی بەدەستەو ئافرەت ئەوەی لەتوانادا نیە.

[1] البدائع سەرچاوەی پێشوو.

[2] سورة الروم: ٢١.

زانایانی حەنەفی بۆ جیاکردنەوە لەبەر ئەو پاساوانەی باسکران ئەمانەیان بەمەرج گرتووە:

١. ژنەکە شتێکی وا نەخاتە روو کەدەری بخات رازیە بە خەوشەکە.
٢. نابێت خەوشەکە لەناکاو بێت پاش چوونەلا.
٣. دەبێت بڕیاری جیاکردنەوەکە بەهۆی شلەپەتك(عنة) پاش دواخستنی داواکە بۆ ماوەی ساڵێك بێت[1].
٤. لەکاتی داواکردنی ژنەکە بەجیاکردنەوە لەبەر شلەپەتك (عنە) دەبێت ژنەکە دامەن داخراو (رتق) نەبێت، چونکە ئەگەر وابێت ئەوا مافی سەرجێی نامێنێت لەکاتێکدا رێگری هەبێت.
٥. داواکاری لەلایەن ژنەکەوە بۆ دادوەر بەرز دەکرێتەوەو جیاکردنەوەکەش لەلای حەنەفیەکان[2] لێکترازان (بائن)ە چونکە کاری دادوەر خراوەتە سەر پیاوەکە وەك ئەوە وایە خۆی تەلاقی دابێت، هەروەها لەبەر ئەوەی مەبەستەکە بریتیە لەهەڵگرتنی ستەم لەسەر ئافرەتەکە کەبەهۆیەوە نەبێت تووشی نابێت چونکە ئەگەر لێکترازان (بائن) نەبێت ئەوا بەگەڕانەوەیی دەگەڕێتەوە[3].

لەم بوارەدا چەندین تێبینی لەسەر حەنەفیەکان هەیە، لەوانە:

١. وتنی نەبوونی مافی داوای جیاکردنەوە ئەگەر هۆکارەکەی لەناکاو بوو پاش چوونەلا دژە لەگەڵ گشتێتی رێسا گشتیەکانی شەریعەتی ئیسلامیدا کەفەرمان بەلادانی زیان دەکات هەروەك پێشتر باسمان کرد.
٢. رەتکردنەوەی جیابوونەوە بەجگە لەنەخۆشینی ناتەواوی ئەندامی زاوزێ دژە لەگەڵ ئەوەی ناسراوە لەباری شیکاری عەقڵیو لۆژیکی دروستی مەزهەبی ئەبو

---

[1] فتح القدير ٤/٢٩٧.
[2] فتح القدير ٤ / ٢٩٩.
[3] ئەمەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ وتەی ( مالك والثوري).

حەنیفە، ئەمە سەرەڕای دژایەتی لەگەڵ ڕێسا شەرعیە گشتیەکان کەبەرەهایی فەرمان بەپێویستی لادانی زیان دەکات.

٣. بێبەشبوونی مێرد لەمافی داوای جیاکردنەوە بەپاساوی ئەوەی خاوەنی تەڵاقە ناحەقیە بەرانبەری، لەبەر ئەوەی جیاکردنەوە لەڕێی دادگاوە جیاوازە لەتەڵاق لەهەندێ شوێنەواردا، چونکە جیاکردنەوە لەسەر داوای مێرد بەهۆی هەبوونی هۆکارێك کەلەژنەکەدا هەبێت ئەوا مافی ژنەکە لەمارەی دواخراودا نامێنێت بەپێچەوانەی تەڵاقەوە، لەبەر ئەوەی ئەگەر پاش چوونەلا تەڵاقیدا ئیدی کەمتەرخەمیەکە لەژنەکەوە بێت یان نا مێردەکە پابەندە بەپێدانی هەموو مارەییەکەی کەبەچوونەلا بۆی سەلماوە.

## دەرئەنجام و پەسەندکردن (الاستنتاج والترجیح):

١. زۆرینەی لایەنگرانی جیاکردنەوەی دادگایی بەهۆی نەخۆشیەکانی ناتەواوی (علل) پەنایان بۆ قەتیسکردن(حصر) و دیاری کردن بردووە لەگەڵ ئەوەشدا دژە لەگەڵ بیانووی ڕەوایەتی پاسایی جیاکردنەوە بەو نەخۆشیو ناتەوایانە (علل) کەئەویش لابردنی زیانە لەسەر زیان لێکەوتوو لەیەکێك لەژنو مێردەکە، چونکە وا پێویستە هەروەك لە ئوصولی فیقهی ئیسلامیدا بڕیاری لەسەر دراوە کەحوکمەکە لەگەڵ پاساوەکەدا بەبوونو نەبوون بسوڕێتەوە، هەروەها لەوانەیە بواری پزیشکی نەخۆشینی دیکە بدۆزێتەوە کەمەترسیدارتر بێت لەوانە، یان ناتەوای وا دروست بێت بەهۆی پێشکەوتنی ژیانەوە کەزیانی لەوانە زیاتر بێت وەك ئایدز.

٢. کەوتنی مافی داوای جیاکردنەوە بەهەندێ بخەر (مسقطات) کەباسکران وەك دواخستنی دلواو، ڕازیبوون بەزیان لەماوەیەکی دیاریکراوداو، ڕوودانی نەخۆشین پاش گرێبەند یاخود پاش چوونەلا، یەکناگرێتەوە لەگەڵ گشتێتیو ڕەهایەتی

ڕێسا شەرعیە گشتیەكانو دەقە بڕیار دەرەكان لەسەر جیاكردنەوە لەپێناوی لابردنی زیان، چونكە مرۆڤ لەوانەیە بەرگەی زیان بگرێت لەكاتێكداو نەتوانێت بەهۆی ئەو گۆڕانكاریانەی لەژیانیدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە لەكاتێكی دیكەدا بەرگەی بگرێت.

٣. وتەی هەندێك لەزانایانی زەیدیو جەعفەریو ئەبازی بەوەی جیاكردنەوە پێویستی بەبڕیار یاخود دادگا نیە، دەروازەی جیاكردنەوەی چۆنیەتی (التفریق الكیفي) لەبەر هۆكارانێك دەكاتەوە كە وەهمی بێت نەك حەقیقی بەهۆی مەترسیانەوە بۆسەر لایەنی بەرانبەر بەداوای جیاكردنەوەو بواری ئاژاوە لەژیانی خێزاندا دەكاتەوە، لەبەر ئەوە وایدەبینم كەهەموو جیاكردنەوەیەك بەهۆی زیانی خۆنەویستیەوە بەفەرمانی دادوەر پاش سەلماندنی ئەو زیانە بەپشكنینی پزیشكی لەلایەن لیژنەیەكی پسپۆڕی پزیشكیەوە.

٤. ئەركی ئاینیو ڕەوشتیو مرۆیی وادەخوازێت لەژنو مێرد كەهاریكاری یەكترین لەخۆشیو ناخۆشیداو، هەموو هەوڵێكی مادیو مەعنەویان بخەنە گەڕ لەپێناوی چارەسەری تووشبوەكە بەو نەخۆشینەی بۆتە پاساو بۆ جیاكردنەوە لەبری ئەوەی پەنا ببرێت بۆ دادگا، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ پێش زاین دەبینین یاسای حامورابی داوای لەمێرد كردووە كەژنە نەخۆشەكەی تەڵاق نەداتو، ڕێگەی داوە ژنێكی دیكە بهێنێت بەڵام دەبێت لەگەڵ ژنە نەخۆشەكە بژێتو چاودێری بكاتو، ئازادی ویستی داوەتە نەخۆشەكە لەمانەوە یان داوای جیاكردنەوەو گەڕانەوە بۆلای كەسو كارەكەی، پێویستبوو ئێمە زیاتر پابەندبووینایە بەم لایەنە ڕەوشتیەوە لەكاتێكدا خۆمان بەشارستانی ترو زیاتر پێشكەوتووو زیاتر مرۆیی دەزانین لەوانەی لەسەردەمی حامورابیدا ژیاون.

٥. پێشنیار دەكەم یاسادانراوەكانی وڵاتە عەرەبیو ئیسلامیەكان لەجیاكردنەوەی دادگادا كار بەپێوەری زیانی خۆنەویست بكات كەلەگەڵیدا ناتوانرێت ژیانی

هاوسەرێتی بەردەوام بێت بەچاوپۆشی لەوەی سەرچاوەکەی چییە، هەروەها واز بهێنرێت لە ژماردنی هۆکارەکان لەیاساکانی باری کەسیداو، وەك کارکردن بەبۆچوونی ئیمام موحەمەد هاوڕێی ئەبو حەنیفەو بۆچوونی ئیبن تەیمیەو ئیبن قەیمو قازی حوسێن.

٦. لەحاڵەتی جیاکردنەوە لەدادگا وایدەبینم کەکار بەبۆچوونی مالیکیو حەنەفی بکرێت لەدانانی جیاکردنەوە بەتەڵاقی لێکترازان (بائن) لەکاتێکدا مەبەست لێی لادانی ئەو زیانەیە کەهەیە.

# دەروازەی دووەم:

# جیاکردنەوە لەبەر زیانی خۆویست

# (التفريق للضرر الارادي)

مەبەست لەزیانی خۆویست ( الضـرر الارادي) بریتیـە لـەو زیانـەی سەرچـاوەکەی کارێك یـاخود قسـەیەکی خۆویسـتی ژن‌و مێـرد یـەکێکیان یـاخود هـەردووکیان بێـت راستەوخۆ یان بەهۆکار، ئیدی ئـەو زیانـە مـادی بێـت وەك زیـانی کەڵەکەبوو لەسـەر بژێوی نەکێشان، یاخود مەعنەوی بێـت وەك بێبەشـکردنی ژنەکـەی لەچـێژوەرگرتنی سێکسـی بـەهۆی دووری یـان سـەفەری مێردەکەیـەوە، دەتـوانین هـەموو هۆکـارە خۆویستەکان کەزیان بەژن‌و مێرد یەکێکیان یاخود هەردووکیان دەگەیەنن بگێڕینـەوە بۆ ئەم چوارە:

١. بێبەشکردنی ژن لەبژێوی.
٢. بێبەشکردنی ژن لەسەرجێی.
٣. ئەنجامدانی سەرپێچییەك لەلایەن یەکێکیانەوە.
٤. دەستدرێژی ژن‌و مێرد یەکێکیان بۆ سەر ئەوی دیکەیان بەقسە یاخود کردار.

واینابینم هۆکارێکی خۆویستی دیکـە هـەبێت کەببێتـە هـۆی زیـان لێکـەوتنی ژن‌و مێرد یەکێکیان بەدەر بێت لەم چوار کاروبارە سەرەکییە، بەم پێیـە لەخسـتنە رووی ئەم هۆکارانەدا وازم لەو رێگا لاسایکارە کۆن‌و نوێیانـە هێنـاوەو، هەوڵمـداوە هـەموو هۆکـارە خۆویسـتەکان کەدەبنـە پاسـاوی جیاکردنـەوە لـەدادگا لـەژێر ئـەم چـوار ناونیشانەدا کۆبکەمەوە، داوا لەیاسا دانەرەکانیش دەکـەم هـەمان شـێواز بگرنـە بـەر چونکە زیاتر گشتگیرەو وردتریشە:

## یەکەم: بێبەشکردنی ژن لەبژێوی (حرمان الزوجة من النفقة):

سەرچاوەی ئەم بێبەشکردنە لەوانەیە بەهۆی سەرسەختی مێردەکەوە بێت، هەروەها دەکرێت بەهۆی ئامادە نەبوونیەوە بێت، یاخود بەهۆی سووربوونیەوە، یان ونبونیەوە، یاخود دەرچوونی بڕیاری بەندکردنیەوە، هەموو ئەم کارانەش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەچنە چوارچێوەی ویستی مرۆڤەوە.

**بۆچوونی زانایان لەبارەی جیاکردنەوە بەهۆی بژێوی نەکێشان (اراء الفقهاء في التفريق لعدم الانفاق):**

لەم بابەتەدا سێ بۆچوونی جیاوازیان هەیە: (بەرەهایی قەدەغەیە، بەرەهایی دروستە، قسەلەسەرکردنی بەتێروتەسەلی):

**بۆچوونی یەکەم- بەرەهایی قەدەغەیە (بەبیانوو بێت یان بێ بیانوو(بعذر او بدونه):**

ئیدی ئەوە بەهۆی کەمتوانایی دارایی مێردەکەوە بێت، یاخود وەك دژایەتی، یان دیارنەمانی، یاخود بەدیل گیرانی، یان ونبوونی، یا بەندکرانی... ئەمە بڕاردەی زانایانی حەنەفی[1] و زاهری[2] و هەندێك لەجەعفەریەکان[3] و کۆمەڵێ زانایانی

---

[1] فتح القدير (٣٩٠/٤) تێیدا هاتووە:(هەر پیاوێك بژێوی ژنەکەی نەکێشا ئەوا لێك جیاناکرێنەوەو پێی دەوترێت کەرلزی بێت، واتە ژنەکە بیکرێتو پیاوەکەی پارەکەی بدات... ئەگەر لەگەڵ بوونیشدا بژێوی نەکێشێت لێك جیا ناکرێنەوەو فەرمانڕەوا لەماڵەکەی دەفرۆشێتو بۆ بژێوی ژنەکەی خەرج دەکات، ئەگەر ماڵەکەی نەکەوتە بەردەست ئەوا بەندی دەکات تا ئەو کاتەی بژێوی دەکێشێتو هەڵناوەشێنرێتەوە).

[2] المحلى (٩٢/١٠) تێیدا هاتووە:(ئەگەر مێردەکە بەستەم بژێوی یاخود پۆشاك یان مارەیی نەدەدایە، یاخود لەبەر هەژاری کە لەتوانایدا نەبوو ئەوا ژنەکە بۆی نیە لەبەر ئەوانە خۆی لێ قەدەغە بکات) هەروەها تێیدا هاتووە (٩١/١٠): (هەر مێردێك بژێویو پۆشاکی بۆ ژنەکەی دابین نەکرد لەکاتێکدا لەسایەی ئەودا بوو ئیدی پیاوەکە لەوێ نەبێت یاخود لای بێت قەرزەو لەگەردنیدایەو لێی وەردەگیرێتەوە و لەژیانیدا بێت یاخود پاش مردنی بڕیاری لەسەر ئەو وەرگرتنەوەیە دەدرێت...).

[3] الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ١٤٤/٢. الخلاف للطوسي ٣٣٤/٢.

زەیدی[1]و، یەکێك لەبۆچوونەکانی شافعیەو ئەوزاعی‌و سەوریش وایان وتووە، هەندێك لـەزانا شـوێنکەوتووەکانی وەك زوهـری‌و نەخـەعی‌و، عـەتای کـوڕی یەسـار بەهـەمان شێوە بۆی چوون‌و ئیبن ئەبی یەعلاش[2] هەمان بۆچوونی وەرگرتووەو، وتوویانە: بۆ ژن هەیە مۆڵەت لـەدادوەر وەربگرێـت بـۆ قـەرزکردن‌و بـژێوی کێشـانی خـۆی لەسـەر حسابی مێردەکەی‌و لەسەر دادوەریش پێویستە بژێوی ژنەکـە لەسـامانی مێردەکـەی دابین بکات یاخود بەقەرز یاخود لە دارایی گشتی (بیت المال)...

ئەو زانایانە بەڵگەی زۆریان هێناوەتەوە کەئەمە گرنگترینیانە:

١- دەستگرتن بەکەمترینی زیانەوە (اخف الضررین) چـونکە ئەگـەر لێکیـان جیـا بکاتەوە ئەوا مافی مێردەکە بەتاڵ دەبێتەوەو، ئەگەر جیاشیان نەکاتەوە ئـەوا مـافی ژنەکە دوا دەکەوێت‌و یەکـەمیان زیـانی زیـاترە چـونکە بـژێوی بـەبڕیاری دادوەر وەك قـەرز لەئەسـتۆی مێردەکـە دەسـەلمێت‌و لەئاینـدەدا لێـی وەردەگیرێتـەوەو، بـژێوی لەسەر پەککەوتەی (العجز) لەسەرجێیدا پێوانـە ناکرێـت چـونکە سـامان شـوێنکەوتە (تـابع)ی مارەبڕینـەو هەریۆیـە ناگـات بـەوەی مەبەسـتە لێـی کەئـەویش منـاڵبوون (توالد)ە[3].

---

[1] التاج المذهب:(٢/٢٨٥) تێیدا هـاتووە:(ئەگـەر مێردەکـە دیار نـەبوو (غـاب) یـاخود ئامادەنـەبوو بـژێوی ژنەکەی بدات ئەوا فەرمانڕەوا لەسامانی مێردە دیار نەبووەکـە بـەرادەی ئـەوەی پێویسـتیەتی لـەماوەی دیارنەبوونەکەدا خەرج دەکات بـۆی... هـەروەها فـەرمانڕەوا لەسـامانی مێردەکـە کەئامادەنیـە بـژێوی ژنەکـەی بکێشـێت بـا خۆیشـی لـەوێ بێـت بـژێوی بـۆ ژنەکـە خـەرج بکـات بـا مێردەکـەش لـەوێ ئامادەبێت..هەروەها فەرمان بەبەندکردنی بکات ئەگەر ژنەکـە داوای بەنـدکردنی کـرد بـۆ بەدەسـتهێنان (التکسب)، لەبـەر ئـەوە لای ئێمـە دروسـت نیـە هەڵوەشـاندنەوەی مـارەبڕینی نێوانیـان لەبـەر بـژێوی نەکێشان ئیدی لەبەر دیارنەبوونی بێت یاخود سەرکێشیکردنی یان نەداری یاخود کاسپی نەکردنی ...).

[2] فتح القدیر ٤/٣٠٤. بدایة المجتهد ٢/٤٣.

[3] الزیلعي ٣/٥٤ .

٢- دەق لەسەر چاوەڕوانی لەكاتی نەداری مێردەكەدا ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: (وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ)[١]، هەموو داواكارییەك لەژنەكەوە بۆ جیاكردنەوە لەبەر بژێوی نەكێشان لەحاڵەتی نەداری مێردەكەیدا دژە لەگەڵ ئەم دەقەدا.

٣- ئەوەی هاوەڵان لەسەری بوون لەحاڵەتی هەبوونیو نەداریدا، نەدارەكانیان چەند هێندەی هەبووەكان بوونو هیچ ڕووداوێك نەبووە تێیدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) یاخود هاوەڵان تێیدا بڕیاری جیاكردنەوە بدەن لەبەر بژێوی نەكێشان.

**تاوتوێكردنی ئەم بەڵگانە:**

١. بانگەشەی ئەوەی كەزیان لێكەوتنی ژنەكە سەرچاوەكەی بژێوی نەكێشانی بێت كەمترین زیانی هەیە لەوەی كەبەهۆی حوكمی جیاكردنەوەوە تووشی مێردەكە دەبێت، ئەمەش پەسەندزانین (ترجيح)ە بەبێ بەڵگە، بەڵكو پێچەوانەكەی ڕاستە، چونكە مرۆڤ دەتوانێت بەبێ سەرجێی سێكسی بژی بەڵام ناتوانێت لەگەڵ بێبەشبوون لەبژێوی بژی، باشە بۆچی دروستە جیاكردنەوە لەبەر شلەپەتك (العنة) بڕیاری جیاكردنەوە بدرێت خۆ بژێوی نەكێشان لەپێشترە، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەم بەڵگەیە دژە لەگەڵ دەقە قورئانیەكاندا كەفەرمان دەكات بەدەستگرتن بەچاكەوە، لەوانە ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ)[٢].

٢. فەرمایشتی خوای گەورە: (وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ)[٣] بەڵگەیەكی تایبەتەو حوكمی گشتی پێ ناسەلمێتو نەدارو هەبوو وەك یەك دەگرێتەوە،

---

[١] (وان كان ذو عسرة فنظرة الى ميسرة وان تصدقوا خيرا لكم ان كنتم تعلمون)(البقرة: ٢٨٠).

[٢] ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا﴾(الطلاق: ٢).

[٣] ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ البقرة : ٢٨٠.

سەرەڕای ئەوەش گونجانە لەنێوان خۆیو ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا) مافی سەرپشکی دەدرێتە ژنەکە لەداواکردنی جیاکردنەوە ئەگەر نەیتوانی، پاشان قەرز سەرشۆڕی (مذلة)ەیەو لەسەر ئەو بنەمایە پارە وەرگرتن (القرض) بە قەرز (دین) ناویبراوەو ئافرەتەکە ناچار ناکرێت ئەو سەرشۆڕییە بگرێتە ئەستۆ کە وەرگرتنە لەسەر حسابی مێردەکەی بۆ بژێوی خۆی.

٢. نەبوونی پێشینەی رووداوێکی جیاکردنەوە لەسەردەمی پێغەمبەرو هاوەڵاندا نابێتە بەڵگە لەسەر دروست نەبوونی جیاکردنەوە لەبەر بژێوی نەکێشان، ئەمەش لەبەر ئەم خاڵانە:

ا- جیاکردنەوە پاش پێشکەشکردنی داواکاری دەبێتو، ئەم پێشکەشکردنی داوایەش لەلایەن ژنی هیچ هاوەڵێکەوە نەسەلمێنراوە.

ب- هاوسەرانی هاوەڵان لەبژێوی نەکێشانی تەواو بێبەش نەکراون.

ت- ژیان گەشەی کردووەو، خەڵکی گۆڕاوە، لایەنی مادی زاڵبووە بەسەر لایەنی رۆحیدا، بەپێچەوانەی سەردەمی هاوەڵانەوە لەسەرەتای هاتنی ئیسلامدا، لەبەر ئەوە ئەوەی مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە تێیدا دەژین پێوانە ناکرێت لەسەر ئەو کاتەی کەپێشینە چاکەکارەکان لەسەردەمی دێریندا تێیدا دەژیان، بۆیە ناچارکردنی ژنەکە لەئەمڕۆدا بۆ قبوڵکردنی ژیانی کولەمەرگی بێزارکردنە بۆیو دژە لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ)[1].

---

[1] (وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيداً عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلَاكُمْ فَنِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرُ)(الحج: ٧٨).

**بۆچوونی دووەم: بۆ ژن هەیە بەرەهایی داوای جیاکردنەوە بکات (بەبیانو یان بێ بیانو):**

واتە بۆی هەیە لەبەر ئەوەی بژێوی ناکێشێت لەدادگا داوای جیاکردنەوە بکات ئیدی ئەگەر مێردەکە هەبوو بێت یاخود نەبوو، ئامادە بێت یان ئامادەنەبێت، هەربۆیە سەرپەستی هەڵبژاردنی یەکێك لەم دووانەی هەیە: (ئارامگرتن یاخود داوای جیاکردنەوە) ئەگەر هاتوو دادوەر نەیتوانی بژێوی ژنەکە لەماڵی مێردە هەبووەکە دابین بکات.

زانایانی مالیکی[1] و هەندێك لەحەنبەلیەکان[2] ئەمەیان پەیڕەو کردووە، ئەوان وتوویانە بەرەهایی لەبەر بژێوی نەکێشان جیادەکرێتەوە ئەگەر هاتوو ئەم مەرجانەی تێدا هاتە دی:

١. پێشکەشکردنی داواکارییەك لەلایەن ژنەکە یان بریکارێکیەوە بۆ دادگا تێیدا داوای بژێوی بکات یاخود جیاکردنەوە.
٢. چەسپاندنی هەبوونی هاوسەرگیریتی دروست.
٣. چەسپاندنی شایستەبوونی ژنەکە بۆ بژێویەو، نەبوونی شتێك کەببێتە ڕێگر لەوە[3].
٤. نەتوانینی دابینکردنی بژێوی لەسامانی بەردەستی مێردەکەی[4].
٥. پێدانی ماوەیەك بەمێردەکە بەپێی مەزەندەی دادوەر تا مێردەکە بەیەکێك لەدوو بژاردەکە رازی بێت، ئەوانیش بژێوی کێشان یان جیاکردنەوە[1].

---

(1) شرح الخرشي ٤/ ١٩٦ – ١٩٨. الشرح الصغير للدردير ٢ / ٨٤٥ فما بعدها. مواهب الجليل ٤ / ١٩٦.

(2) المغني ٧ / ٥٧٣ و لاپەڕەکانی دواتر تێیدا هاتووە:(ئەگەر ڕێگری کردو هیچی نەبوو بیباتو جاکردنەوە لێی هەڵبژارد ئەوا دادوەر لێکیان جیا دەکاتەوە ). الانصاف ٩ / ٣٩٠ و دواتر الاقناع ٣ / ١٤٧.

(3) الخرشي (٤ / ١٩١) تێیدا هاتووە:(ڕای بەناوبانگ ئەوەیە کەژنەکە ئەگەر ڕێگری کرد مێردەکەی سەرجێی لەگەڵ بکات بەبێ پاساو ئەوا مافی بژێوی لەسەر مێردەکەی نامێنێت، بەهەمان شێوە بەرێگری لەچێژوەرگرتن مافی بژێوی نامێنێت، یاخود ئەگەر لەگوێڕایەڵی مێردەکەی دەرچوو بەبێ مۆڵەت).

(4) الخرشي (٤ / ١٩٧) تێیدا هاتووە:(ئەگەر ماڵێکی دیاری هەبوو ئەوا بەزۆر لێی وەردەگیرێت).

٦. مێردەکە لەیەک کاتدا نەئامادە بێت بژێوی بکێشێت نەئامادەبێت تەڵاقی بدات، پاش دەرچوونی فەرمانی دادوەر لەسەری پێویستە یەکێکیان هەڵبژێرێت[٢].

٧. دەبێت جیاکردنەوە بەهۆی بژێوی نەکێشانەوە لەئێستاو ئایندەشدا بێت، ژنەکە بۆی نیە داوای جیاکردنەوە بکات لەبەر بژێوی کەڵەکەبووی پێشتر لەئەستۆی مێردەکەیدا[٣].

جیاکردنەوە لەبەر بژێوی لای مالیکیەکان بەتەڵاقی گەڕانەوەیی دادەنرێت، واتە مێردەکە مافی گەڕانەوەی هەیە لەماوەی چاوەڕوانیدا ئەگەر دەستیکرد بەبژێوی کێشانی، ئەمەش بۆچوونێکی دروستەو لەرۆحی شەریعەتی ئیسلامیەوە سەرچاوەی گرتووە.

گرنگترین بەڵگەی ئەوانەی وتوویانە لەبەر بژێوی نەکێشان بەرەهایی جیا ناکرێنەوە ئەمانەیە:

---

(١) الخرشي (٤/ ١٩٧) تێیدا هاتووە:(بەئیجتیهادی دادوەر بەبێ دیاریکردنی بۆ رۆژێك یان سیان یاخود مانگێك یان دوومانگ لێی دوور دەخرێتەوە).

(٢) العدوی، سەرچاوەی پێشو، تێیدا هاتووە:(بەڵام ئەو کەسەی نەبوونیەکەی نەسەلمێنراو دڵنیادەنا بەپێدڵنیو بژێوی نەدەکێشاو ئامادەنەبوو تەلاقی بدات، واتە سامانێکی دیاری نەبوو ئەوا پەلە دەکرێت لەتەلاقدانی بەپێی بۆچوونێك، بەند دەکرێت هەتا بژێوی ژنەکەی بکێشێت بەپێی دوا بۆچوونیان کەئیبن عەرەفە گێڕاویەتەوە ئەگەر بەند کراو ئەنجامی نەدا ئەوا پەلەدەکرێت لەتەلاقدانیدا) ولە (المغني)(٧ / ٥٧٦) تێیدا هاتووە:( ئەگەر سامانەکەی دیار نەبوو لەسەر بەندکران ئارامی گرتو دادوەر نەیتوانی سامانی لێی وەربگرێت بۆی یاخود نەیتوانی بژێویەکەی لەسامانە نادیارەکەی وەربگرێت ئەوا ژنەکە تەنها بژاردەی هەڵوەشاندنەوەی لەبەردەمدایە، ئەمەش بۆچوونی (خرشی)و بژاردەی (ئەبی تاڵب)ە).

(٣) المغني ٧/ ٥٧٥ تێیدا هاتووە:(ئەگەر نەیبوو بژێوی پێشتری بدات ئەوا ژنەکەی هەڵوەشاندنەوەی بۆ نیە، چونکە قەرزێکەو لەئەستۆیدایە وەك هەموو قەرزەکانی تر) ولى شرح الخرشي (٤ / ١٩٤) تێیدا هاتووە:( ئەگەر مێردەکە نەیبوو بژێوی ئێستا یاخود ئایندەی بدات بۆ کەسێك کەدەیویست سەفەر بکات بەبێ رابوردوو).

١. فەرمایشتی خوای گەورە: (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ). دەستگرتن پێوەی لەگەڵ وازهێنان لەبژێوی کێشانی دەستگرتن نیە بەچاکە تا مانای جیاکردنەوە بگەیەنێت[1].

٢. گێڕانەوە لەسەعیدی کوڕی موسەیبەوە، دەگێڕنەوە لە سوفیان لە (بن ابی زنادە)ەوە وتوویەتی: پرسیارم کرد لە سەعیدی کوڕی موسەیب لەبارەی پیاوێکەوە کە هێندەی نیە بژێوی ژنەکەی بکێشێت ئایا لێك جیادەکرێنەوە، وتی: بەڵێ، وتیان: سوننەتە، لەوەڵامدا وتی: سوننەتە، ئەمەش واتە پێغەمبەر (ﷺ) وایکردووە.

٣. عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه)فەرمانی بەو پیاوانە کرد کەلەژنەکانیان دوور دەبن کەبژێویان بکێشن یاخود تەلاقیان بدەن.

٤. پێوان لەسەر جیاکردنەوە لەبەر نەتوانینی سێکسی (العجز الجنسي)، وتوویانە: ئەگەر هەڵوەشاندنەوە سەلمێنرا بەهۆی نەتوانینی چوونەلا -کەزیانەکەی کەمترە- ئەوا بە نەتوانینی بژێویدانیش دەسەلمێنرێت کەجەستە بەبێ ئەو توانای نامێنێت و ئەم لەپێشترە[2].

بۆچوونی سێیەم- درێژە (التفصيل):

واتە جیاوازیکردن لەنێوان هەردوو حاڵەتی نەتوانین و سەرسەختی، بەدەربڕینێکی دیکە لەنێوان حاڵەتی هەبوونی بیانوو لەگەڵ نەبوونی بیانوو، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنانی ئەم بۆچوونە پەیڕەوی یەك بەرنامەیان نەکردووە لەوردەکاریدا، بەڵکو بۆ دوو تیم دابەش بوون هەر ئاراستەیەکیان پێچەوانەی لایەکەی دیکەیە، بەمشێوەیە:

---

(1) المغني ٧ / ٥٧٣.

(2) سەرچاوەی پێشوو.

أ- لایـەکیان بۆچـونی لەگـەڵ جیاکردنەوەدایـە لەبـەر بـژێوی نەکێشـان لەلایـەن هەژاری پەککەوتنەوە(الفقير العاجز)، بەڵام ئەگەر هۆکاری بژێوی نەکێشـانەکە بەهۆی سەرسەختییەوە بوو نەك دەستکورتیو هـەژاری، ئـەوا ویسـتی ژنەکـە هیچ دەسەڵاتێکی نیـە لـەداواکردنی جیاکردنـەوەدا، چـونکە دەکێـت لـەڕێگای دادگاوە بژێوی بەدەست بهێنرێت، ئەمە بۆچوونی پەسـەندە لای شـافعیەکان[1] و بۆچوونی هەڵبژێردراوە لای قازی لەحەنبەلیەکان[2].

چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە، لەوانە:

١. مێردێك هەبوو بێت دەتوانرێت لەرێگەی دادگاوە بژێوی لێ وەربگیرێت، لەسـەر ئەم بنەمایە ئەگەر مێردەکە دیار نەماو هەواڵی بـڕا ئـەوا هەڵوەشـاندنەوە بـۆ ژنەکــە ناســەلمێت چــونکە هەڵوەشــاندنەوە بــۆ نــەبوو دەســـەلمێتو نەسەلماوە[3].

٢. ئەوەی ئەبوو هورەیرە (رەزای خوای لێبێـت) گێڕاویەتیـەوە لەپێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: لەبارەی پیاوێکەوە هیچی نیە بژێوی ژنەکەی پێ بکێشێت ئەوا لێك جیا دەکرێنـەوە، ئـەم بۆچـوونەش بـەوە تـاوتوێ دەکرێـت کـەهۆکاری

---

[1] المهذب ٢/ ١٦٣ تێیدا هاتووە:(ئەگەر مێردە نەبووەکە بژێوی ژنەکەی نەدەکێشا ئـەوا ژنەکـە بـۆی هەیـە مارەبڕینەکە هەڵبوەشێنێتەوەو، ئەگەر مێردەکەش هەبوو بوو بژێوی نەدەکێشا ئەوا هەڵوەشـاندنەوەی بۆ ناسەلمێت چونکە دەتوانرێت لەرێی حاکمەوە بۆی وەربگیرێت).

[2] المحرر ٢/ تێیدا هاتووە:(ئەگەر مێـردە نەبووەکـە بـژێوی ژنەکـەی هـەمووی یـان هەنـدێکی نەدەکێشـاو نـەدەتوانرا لەسـامانەکەی بژێویەکـە بـدرێت قـازی وتوویـەتی ئـەوەی بـۆ نیـە (داواکـاری جیاکردنـەوە بەپێچەونەی هەبووەوە).

[3] نهايـة المحتـاج ٧/٢٠٧ تێیـدا هـاتووە:(بۆچـوونی هـەرە راسـت ئەوەیـە هەڵناوەشـێتەوە بەرێگریـەکی دەوڵەمەندانە –یان مامناوەند ئامادەبێت یان ئامـادە نـەبوو). شـافعیەکانیش بۆچـوونێکی تریـان هەیـە سـەبارەت بـە ئامادەنـەبوو (غائـب) بـەجۆرێك هەنـدێك لـەهاوەڵانی شـافعی وتوویانـە: ئەگـەر هـەواڵی دیارنەماوەکە پچڕا ئەوا هەڵوەشاندنەوەی بۆ دەسەلمێت چونکە نەکێشانی بژێویەکەی بـەهۆی پچـڕانی هەواڵیەوە وەك پاساویەتی بەهۆی نەبوونیەوە . المهذب ٢/١٦٣.

راستەقینە بریتیە لە زیان لێکەوتنی ژنەکە کەسەرچاوەکەی بژێوی نەکێشانەو هۆکارەکە هەیە ئیدی مێردەکە هەبوو بێت یان نەدارو، لەبەر ئەوەی ژنەکە بێبەشە لەبژێوی.

ب- بەشەکەی تر وتوویانە بۆ ژنەکە هەیە داوای جیاکردنەوە بکات ئەگەر هاتوو بژێوی نەکێشانەکە لەمێردێکی هەبوەوە بوو چونکە ستەمکارە، نەك لەبێ توانایی و هەژاری لەبەر ئەوەی بیانووی هەیەو هەمان مامەڵەی ستەمکاری لەگەڵ ناکرێت، ئەمەش بژاردەی ئیبن تەیمیەو ئیبن قەیمە لەحەنبەلیەکان[1] و هەندێك لەزانایانی موتەئخری جەعفەریش[2] وایان وتووەو دیارترین بەڵگەشیان: ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا) هەروەها ئەم ئایەتە: (وان كان نو عسرة فنظرة الى ميسرة).

ئەم بەڵگەهێنانەوەش بەوە قسەی لەسەر دەکرێت کەئایەتی یەکەم بەڵگەیە بەدەستی ژنەکەوە بۆ داوای جیاکردنەوە، دووەمیش پەیوەندداره بەقەرزەوە لەمامەڵە داراییەکاندا، شایانی باسە کە ئیبن حەزمی زاهری (رەحمەتی خوای لێبێت)

---

[1] ئیبن قەیم (زاد المعاد ٣/٥١) وتوویەتی:(مێرد ئەگەر توانای بژێویکێشانی هەبوو، بژێوی ژنەکەی نەکێشاو، ژنەکەی نەیتوانی بژێویەکەی لێوەربگرێت ئەوا بۆ ژنەکە هەیە داوای هەڵوەشاندنەوە بکاتو ئەوە بۆ ژنێك نیە مێردەکەی هەژار بێت مەگەر لەکاتی گرێبەندندا هەڵیخەڵەتاندبێتو وتبێتی: دەوڵەمەندە پاشان دەرکەوتبێت هەژارەو هیچی نیە، لێرەدا بۆ ژنەکە هەیە داوای هەڵوەشاندنەوە بکات).

[2] مامۆستا(جواد مغنية) لەکتێبەکەیدا (الزواج والطلاق في المذاهب الخمسة) ل ١٩٢:(مامۆستا ( سيد ابو الحسن) لة (الوسيلة)دا ء، (سيد محسن الحكيم) لەنامەی (منهاج الصالحين)دا فەتوایان داوە: ئەگەر مێردەکە رێگر بوو لەبژێوی کێشان لەگەڵ ئەوەی هەبوو بوو ژنەکەی داواکەی بۆ بەردەم دادوەر بەرز کردەوە ئەوا ناچاری دەکات بەبژێوی کێشان یاخود تەڵاقدان، ئەگەر هەر رێگر بوو نەشدەتوانرا لەسامانەکەی بژێوی ژنەکەی بدرێتو نەدەتوانرا ناچاریش بکرێت لەسەر تەڵاقدانی ئەوا رووکاری کارەکە ولیە دادوەر بۆی هەیە ئەگەر تەڵاقی ویست تەڵاقی بدات.

وتوویەتی: مێرد باهەژارو نەداریش بێت پێویستە بژێوی ژنەکەی بکێشێت با ژنەکە لەرووی دارایشەوە هەبوو بێت[1].

وایدەبینم ئەم بۆچوونە سەرچاوەکەی رۆحی شەریعەتی ئیسلامیەو داوا لەیاسادانەری ولاتانی ئیسلامی دەکەم وەریبگرن‌و لەیاساکانی باری کەسیدا بیچەسپێنن.

**دەرئەنجام و پەسەندکردن (الاستنتاج والترجيح):**

**یەکەم: دەرئە نجام:**

لەوەی خستمانە روو دەگەینە ئەو ئەنجامەی هۆکاری راجیایی زانایان لەجیاکردنەوە بەهۆی بژێوی نەکێشانەوە لەلایەك بۆ نەبوونی دەقێکی راشکاو دەگەڕێتەوە، دژیەکی لەنێوان پێوانە (قیاس)و بەباشزانین (استصحاب) لەلایەکی دیکەوە، ئەمە سەرەڕای جیاوازییان لەپاساو (علە)ی حوکمەکەدا کەئایا تەنها زیانی ژنەکەیە یاخود زیانی ژنەکەیە لەگەڵ خراپی مەبەستی مێردەکە.

ئەوەیان وتوویەتی جیا ناکرێنەوە: دەستی گرتووە بەنەبوونی دەقەوەو، بەپەسەندکردنی بەباشزانین (استصحاب) بەسەر پێوانە (قیاس)دا، ئەوەشی پێوانەی پێش خستووەو بژێوی نەکێشانی پێوانەکردووە بۆ نمونە لەگەڵ شلەپەتك (عنة) لەبەر هاویەشی پاساوی حوکمەکەیان (زیانلێکەوتن) ئەوە وتوویەتی جیادەکرێنەوە، ئەوەشی جیاوازی نەکردووە لەنێوان حالەتی هەبوون‌و نەداریدا ئەوا پاساوی حوکمەکە کەتەنها زیانلێکەوتنی ژنەکەیە، ئەوەشیان جیاوازی کردووە لەنێوان

---

[1] لمحلى ٩٢/١٠ تێیدا هاتووە: ئەگەر مێردەکە نەیبوو بژێوی خۆی بکێشێت‌و ژنەکەی دەوڵەمەند بوو ئەوا بژێویەکەی دەکەوێتە سەر ژنەکەی‌و هیچی لەوە بۆ ناگێڕێتەوە ئەگەر دواتر دەوڵەمەند بوو...بەلگەی ئەمەش فەرمایشتی خوای گەورەیە :(وعلى المولود لـه رزقهن وكسوتهن بالمعروف لا تكلف نفس الا وسعها لا تضار والدة بولدها ولا مولود له بولده وعلى الوارث مثل ذلك) عەلی وتوویەتی: ژن میراتگریەتی لەبەر ئەوە بژێوی مێردەکەی لەسەرە بەدەقی قورئان).

حاڵەتی هەبوون و نەبوون وتوویەتی لەحاڵەتی هەبووندا جیا دەکرێنەوەو لەنەبووندا جیا ناکرێنەوە، چونکە لەوەی یەکەمدا زیانلێکەوتنی ژنەکەو مەبەست خراپی مێردەکەشی پێکەوە لەگەڵدایە.

ئەوەشی پێچەوانەی ئەوەی وتووە، وتوویەتی پاساو (علە) تەنها بریتیە لەزیان لێکەوتن، ئەوەش لەتوانادایە لەحاڵەتێکدا مێردەکە هەبوو بێت ئەوا دەکرێت لەرێگای دادگاوە نەهێڵدرێت بەپێچەوانەی حاڵەتی نەدارییەوە کەتەنها بەجیاکردنەوە نامێنێت.

دووەم: پەسەندکردن (الترجیح):

وایدەبینم ئەوەی کەلەپێشتر بێت بۆ هەڵبژاردن کارکردنە بەوتەی ئیبن حەزمی زاهری لەحاڵەتی نەتوانینی جەستەیی و دارایی مێردەکەدا لەبژێوی کێشانو، توانای مێردەکە لەسەر بژێوی کێشانی خۆی و ژنەکەی و منداڵەکانی، چونکە پەیوەندی هاوسەرێتی پەیوەندییەکی رۆحیەو سروشتی بەردەوامی تێیدا لەسەر بناغەی هاریکاری و خۆشەویستی وەستاوەو لەسەر ئافرەتی رێزدار پێویستە کەهاوبەشی مێردەکەی بێت لەهەبوون و نەبووندا، خۆشی و ناخۆشیەکانی لەگەڵ بەش بکات.

هەژاری نە نەنگیە نەکەمی کەلەبەهای مرۆڤ کەم بکاتەوە، سامانیش دێت و دەڕوات وەك کەفە: (فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ)[1] ، لەحاڵەتی نەداری هەردولایاندا لەسەر دەوڵەت پێویستە لەگەنجینەی دەوڵەت (ربیت المال) ژیانیان دابین بکات چونکە دەستەبەری ئابووری بۆ نەداران لەکۆمەڵگادا لەگرنگترین ئەرکەکانی دەوڵەتە.

---

(1) (أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَداً رَّابِياً وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاء حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ)(الرعد: ١٧).

ئەگەر مێردەکە هەژار بوو دەیتوانی کاربکات ئەوا لەسەر دەوڵەت پێویستە کارێکی بەبەهای بۆ دەستەبەر بکات.

لەحاڵەتی پەککەوتەی مێردی هەبوودا پێویستە مافی داوای جیاکردنەوە بدرێتە ژنەکە لەپێناوی هەلگرتنی ستەم لێی، چونکە لابردنی زیانو نەهێشتنی ستەم لەئەرکەکانی دادگایە، ئەمەش پاش ئەوەی ماوەیەکی پێویست بدرێتە مێردەکە تا ویژدانی بەخەبەر بێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ بژێوی کێشانی هاوبەشەکەی ژیانی، ئەگەر رازی نەبوو بەبژێوی کێشانو تەڵاقدانی ژنەکەش داوای جیاکردنەوەی کرد ئەوا لەسەر دادوەر پێویستە بەدەم ئەو داوایەوە بچێت بەڵام جیاکردنەوەکە بەیەك تەڵاقی گەڕانەوەیی دابنێت وەك کارکردن بەبۆچوونی ئیمامی مالیك (رەحمەتی خوای لێبێت)، ئەمەش وەك پێدانی دەرفەتێکی دیکە بەژنەکە لەپێناوی دەستپێکردنەوەی ژیانی هاوسەرێتی پاش ئەوەی مێردەکە بەڵێننامەیەك لەسەر بەردەوامی بژێوی کێشانی پێشکەش دەکات.

## دووەم – بێبەشکردنی ژن لەسەرجێی (حرمان الزوجة من المعاشرة):

حاڵەتی دووەمی زیانی خۆویست بریتیە لەبێبەشکردنی ژن لەچێژی پێکەوەبوونی هاوجێی لەگەڵ مێردەکەیدا، ئەویش مرۆڤەو ئەوەی بۆ پیاو هەیە بەرێگایەکی رەوا لەچێژ وەرگرتنی سێکسی بۆ ژنەکەش هەیە، هەربۆیە بێبەشکردنی لەو مافە بەویستی راستەوخۆ یان بەهۆکاری مێرد ئەو مافەی پێدەدات کەدووبژاردەی لەبەردەمدا بێت یان ئەوەتا ئارام بگرێت لەو نەهامەتیو زیانەدا، یاخود داوا لەدادوەر بکات ئەوەی لەسەر لاببات چونکە ستەمەو لابردنی ستەمیش لەپسپۆڕێتی تایبەتمەندی دادوەرە.

کۆچی دیارنەمان (الهجر بالغیبة)کەحاڵەتەکانی ونبوونو بەدیلگیرانو بەندکردن دەگرێتەوە، چونکە هەموو ونبوو، هەموو دیلێكو، هەموو بەندکراوێك دوورە

لەژنەکەی، پاشان ئەم حاڵەتانە هۆکاری جیاکردنەوە نیە بەڵکو هۆکاری راستەقینە بریتیە لەو زیانەی بەهۆی دوور کەوتنەوەی مێردەوە دێتە ئاراو، بەهۆی دیارنەمانو ونبوونو بەدیلگیرانو بەندکرانەوە ژنەکە بێبەش دەبێت لەبژێوی، ئەوەش هەمان بێبەشبوونە لەرووی حوکمەوە کەلەکاتی ئامادەبوونی مێرددا بێبەشی بکات، چونکە هیچ سامانێکی بەجێ نەهێشتووە ژنەکە بژێوی لێ دابین بکات، لەبەر ئەوە پێویست بەوە ناکات ئەو راجیاییەی کەباسمان کرد لەجیاکردنەوە بەهۆی بژێوی نەکێشانەوە دووبارە بکەینەوە، بەڵکو تەنها حوکمی ئەو زیانە باس دەکەین کەبێبەشبوونی ژنەکەیە لەچێژوەرگرتن لەهاوجێی ژنو مێردایەتی لەم حاڵەتانەدا، زانایانی موسڵمان راجیان لەجیاکردنەوە لەبەر ئەم زیانەو دوو بۆچوونیان هەیە، یەکەمیان: بەرەهایی جیاکردنەوە رەت دەکاتەوە، دووەمیش بەدرێژی لێی دوواوە:

**بۆچوونی یەکەم** — یەك حوکم دەدات بەسەر هەموو شێوەکانی دیارنەمان (غیاب)دا، ئەویش دروست نیە دادوەر بڕیاری جیاکردنەوە بدات لەبەر دیارنەمان مەگەر هاوتەمەنەکانی دیارنەماوەکە بمرن، لەو کاتەدا دادوەر دەتوانێت بڕیاری مردنی بدات بەشێوەی ئەوانو ئەو کاتە ژنەکەی ماوەی چاوەڕوانی مێرد مردوو دەست پێدەکات.

زانایانی حەنەفیو، زاهریو، کۆمەڵێ زانایانی زەیدیو، شافیعی لەبۆچوونی نوێیدا پەیڕەویان لێ کردووە، هەروەك لەم روونکردنەوەیەدا دەیخەینە روو:

**حەنەفیەکان وتوویانە:**

ونبوو لەگەڵ ژنەکەیدا لێك جیاناکرێنەوە لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ژنی مێرد ونبوو: (انها امراته حتى يأتيها البيان)[1]، واتە: ژنیەتی تائەو کاتەی هەواڵی تەواوی پێدەگات، هەروەها لەبەر وتەی عەلی کوڕی ئەبوتاڵب (ﷺ) کەهەر بەهاوسەری دەمێنێتەوەو تووشی ئیبتیلا بوو با ئارام بگرێت تا روون

---

[1] السلسلة الصحيحة للألباني ٣٣٤١

دەبێتــەوە مــردووە یــاخود بەتــەڵاق، هــەروەها لەبــەر ئــەوەی مــارەبڕین بەیــەقین چەسپاوەو مردنی لەحاڵەتی گریمانەدایەو یەقینیش بەگومان لاناچێت، هەروەها لەبەر ئـەوەی عومـەری کـوڕی خـەتاب (ﷺ) لـەو بۆچـوونەی پاشـگەز بوویـەوە کـەبڕیاری جیاکردنەوەی دابوو پاش دواخستنی بۆ ماوەی چوار ساڵو لەگەڵ عەلیـدا هاودەنگـە لەرەتکردنەوەی جیاکردنەوەدا.

لەبەر ئەوەش کەدیارنەمان لەسەر سوێنخواردنی پیاو کەسەرجێی لەگەڵ ژنەکەیدا نــەکات(الایــلاء) پێوانــە ناکرێــت چــونکە تــەڵاقی پەلــەکراو (معجــل)ەو لەســەر شلەپەتکەیی(عنة)ش پێوانە ناکرێت چونکە دیـار نـەمان پێشـبینی دەکرێتـە کۆتـایی بێت بەپێچەوانەی شلەپەتك(عنة)ەوە[1]، لەسـەر ئـەم بنەمایانـە دادوەر بڕیـار دەدات بەمردنی ئەو دیارنەماوەی کەپاش مردنی هاوتەمەنەکانی چارەنووسی دیار نیە، بەڵام ئەو دیارنەماوەی کەشوێنو چارەنووسی دیارە ئەوا ناچار دەکرێت بەگەڕانەوە یـاخود تەڵاقدان.

قسەیەکی باشە ئەگەر بڵێین ئەم بۆچوونە دژیەکە لەگـەڵ ڕۆحـی ئیسـلامو دەقـە فەرمان کارەکان بەپێویستی لادانی زیانو نەهێشتنی ستەمی سەر زیانلێکەوتوو.

**زاهریەکان:**

ئیبن حەزم وتوویەتی[2]: دروست نیە هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینی هیچ کەس لەبەر دیارنەمانیو، پێویست نەبوونی ماوەی چاوەڕوانی لەکەسێك کەمردنی دیـار نـەبێتو، کەس بۆی نیە لەبری کەسی تر تـەڵاق بـداتو، تانـەش لـەو گێڕانەوەیـە دەدات کەلـە عومـەری کـوڕی خەتابـەوە دەگێڕنـەوە چـوار سـاڵ دوای خسـتووەو پاشـان جیـایی کردونەتەوە بەوەی گێڕانەوەیەکی لاوازە.

---

[1] بڕوانە: الهدایة شرح بدایة المبتدی)ی مرغیناني، طبعة البابي الحلبي، القاهرة ٢ / ١٨١.
[2] بڕوانە: المحلی ١٣٩/١٠ – ١٤٣.

حەڵاڵ نیە حەرامکردنی شەرمگەیەك (فرج) کەخوا بۆ مێردەکەی حەڵاڵ کردووەو، حەڵاڵکردنی بۆ پیاوانی تر کەخوا لێی حەرام کردوون بەبێ بەڵگەی قورئانو سوننەت.

**شافعی:**

ئەبو ئیسحاقی شیرازی دەڵێت[1]: لەبۆچوونی نوێیدا (واتە شافیعی) کەئەویش دروستە بۆی نیە هەڵیبوەشێنێتەوە وەك پێوانە لەسەر ماڵەکەی، کەدروست نیە لەدابەشکردنی ماڵەکەیدا بڕیار مردنی بدرێت، بەهەمان شێوە دروست نیە لەشووکردنەوە ژنەکەیدا بڕیار بدرێت مردووە.

**زیدیەکان:**

کۆمەڵی زانایانی زەیدی دەستیان بەو ڕێسا گشتیەوە گرتووە کەلەسەر زمانی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) هاتووە: (الطلاق لمن لزم بالساق) [2]، واتە: تەڵاق هی ئەوەیە کەلاقی گرتبێت، بەوەش کەهاوسەرگیری چەسپا بەقورئانو سوننەت تەنها بەتەڵاقو مردن کۆتایی دێت[3].

**بۆچوونی دووەم**- وردەکاری دەوێت: واتە پێدانی حوکمی تایبەت بەهەموو شێوەکانی دیارنەمانو ئەمەش بژاردەی زانایانی مالکیو، جەعفەریو، حەنبەلیەکانو، هەندێك لەزانایانی زەیدیو، شافعی لەبۆچوونی کۆنیداو، سەعیدی کوڕی موسەیەبوئەوانەی بەشوێن ئەودا ڕۆشتوون.

---

(١) المهذب ٢ / ١٤٦.

(٢) لەگێڕانەوەیەکی تردا: (لمن اخذ بالساق).

(٣) بڕوانە: تاج المهذب ٢ / ٢٨٥. البحر الزخار ٣ / ١٦٥ الروض النضير ٤ / ٤٢٨ – ٤٣٠.

**مالكیەكان:**

زانایانی مالكی بەجۆرێكی وا درێژ لەبابەتی جیاكردنەوە قسەیان كردووە كەلـەهیچ فیقهێكی دیكەدا نایبینین، هەروەك لەم روونكردنەوەیەدا دەردەكەوێت:

أ- ونبوو پێنج بەشە، بۆ ژن لەهەریەكەیاندا حوكمێكی تایبەت هەیە:

١-ونبوو لەولاتی ئیسلامدا لـەكاتی بـلاو نەبوونـەوەی پـەتاداو لـەكاتی ئاسـاییدا: پاش دواخستنی بۆ ماوەی چوار ساڵ[1] لەكاتی بەرزكردنەوەی داواكاریەكـەوە بۆ دادگا یاخود بۆ كۆمـەلێك لەموسـلمانان لـەكاتی نـەبوونی دادوەردا ژنەكـەی وەك مێرد مردوو دەست بەماوەی چاوەڕوانی دەكات.

٢-ونبووی ولاتی ئیسلام لەكاتی بلاوبوونەوەی تاعون یاخود هـەر نەخۆشـینێكی تری لەناوبەر: ژنەكەی پاش بلاوبوونەوەی بەتاكە مـاوەی چـاوەڕوانی دەسـت پێدەكات لەبەر ئەوەی زیاتر گومانی مردنی هەیە.

٣-ونبووی كاتی ئاژاوە(معترك) لەنێوان موسلمانانـدا: ژنەكەی مـاوەی چـاوەڕوانی مردن بەسەر دەبات پاش جیاكردنەوەی هەر دوو دەستەكە ئەگەر دەركـەوت بەشداری شەڕی كردووە، دەنا حوكمەكەی وەك حـوكمی ونبـوو وایـە لـەولاتی موسلماناندا هەروەك باسكرا.

٤-ونبووی جـەنگی نێـوان موسـلمانانو بێبـاوەڕان: ژنەكـەی مـاوەی چـاوەڕوانی مردوو دەست پێـدەكات پـاش سـالێك لەبـەرواری بەرزكردنـەوەی كارەكـە بـۆ دادگا لای هەندێكو، پاش تێڕوانینی دادوەر بۆ بابەتەكەیو پرسیارو پشـكنین لێـی بـەجۆرێك زیـاتر گومـانی ئـەوە ببـات كەلەژیانـدا نـەماوەلای هەنـدێكی دیكەیان.

---

[1] ئـەم دیاریكردنـە لـەدواوەی عومـەری كـوڕی خـەتاب وەرگـیراوە یـاخود لەدرێـژترین مـاوەی سـكپڕی بەبۆچوونی ئەوان یان بەكەمترین ماوەی چوونی پۆستە چوونو گەڕانەوە لەو سەردەمەدا.

ە– ونبوو لەخاكی هاویەشی بڕیاردەرو بێباوەڕان (الشرك والكفر): حوكمەكەی حوكمی بەدیل گیراوە كەلەم بڕگەیەی دواتردایە.

ب– دیارنەماوی دیل (الغائب الاسیر): ژنەكەی چاوەڕوان دەكات تا هاوتەمەنەكانی دەمرن، ئەمجا دادوەر بڕیاری مردنی دەردەكات چونكە ناتوانێت بەشوێنیدا بگەڕێتو چارەنووسی بزانێت.

ئاشكرایە كەئەمە بۆ سەردەمی ئەوان بووە، بەڵام لەم سەردەمەدا لەتوانای دادوەردایە لەڕێگەی ڕێكخراوە نێودەوڵەتیەكانەوە لەوانە خاچی سووری نێودەوڵەتی چارەنووسی دیل بزانێت.

ج – ئەو دیارنەماوەی كەشوێنو هەواڵی زانراوەو دەتوانرێت لەڕێگەی هۆكارەكانی پەیوەندییەوە پەیوەندی پێوە بكرێت، لەسەر داوای ژنەكەی دادوەر فەرمانی پێدەكات یان ئەوەتا بگەڕێتەوە بۆلای ژنەكەی یاخود ژنەكەی ببات بۆلای خۆی یان تەڵاقی بدات، بۆی هەیە بەپێی ئیجتیهادی خۆی دەرفەتێكی بداتێ، ئەگەر بەهەموو ئەوانە رازی نەبوو ئەوا پاش كۆتاییهاتنی ماوەی دەرفەتەكە دادوەر هەڵدەستێت بەتەڵاقدانی بەڵام دەبێت ماوەی دیارنەمانەكە لای هەندێك لەزانایان لەساڵێك كەمتر نەبێتو لەسێ ساڵ زیاتر نەبێت لای هەندێكی تر لەزانایانی مالیكی.

دواخستن لەهەموو شێوەكاندا كەخرانە ڕوو دەبێت ئەم دوو مەرجەی تێدا بێت:

**یەكەم:** دەبێت بژێوی ژنەكە دابین بكات، ئەگەرنا ئەوا بۆی هەیە داوای تەڵاق وەرگرتن تۆمار بكات لەبەر بژێوی نەكێشانی.

**دووەم:** ژنەكە ترسی ئەوەی نەبێت بكەوێتە هەڵەو گوناهەوە بەهۆی بێبەشبوونی لەپێكەوەبوونی ژنو مێردایەتی ئەگەرنا ئەوا دادوەر دەستەڵاتی هەڵسەنگاندنی هەیە لەجیاكردنەوە بەبێ خۆبەستنەوە بەماوەیەكی دیاریكراو بۆ دواخستن.

داواكاری ژن لەمەترسی تووشبوونی بەزیناو، لە داواكاری دیاریكردنی شوێنی مێردو، توانای پەیوەندی پێوەكردنی لەرێگەی پۆستەو راگەیاندنەوەو، لەدوای زیانلێكەوتنی لەدیارنەمانی مێردەكەی پەسەند دەكرێت چونكە هەموو ئەو كارانە تەنها لەرێگەی ئەوەوە دەزانرێت.

د- ئەو پیاوەی ئامادەیەو بەبێ بیانوو لەژنەكەی‌و سەرجێی هاوسەرێتی لەگەڵی دوور كەوتۆتەوەو مەبەستی زیانگەیاندنە بەژنەكەی: هەمان حوكمی سوێندخواردنی نەچوونەلای ژن (الایلاء)ی لای مالكیەكان بەسەردا جێبەجێ دەكرێت با ئەوە نەبەسترابێتەوە بەسوێندەوە، بۆ دادوەر هەیە فەرمانی پێبكات لەگەڵ ژنەكەی سەرجێی بكات یاخود تەڵاقی بدات ئەگەر بەوە رازی نەبوو ئەوا لەسەر داوای ژنەكە پاش تێپەڕبوونی چوار مانگ تەڵاقی دەدات[1].

هـ- ئەو كەسەی خۆی بۆ پەرستش یەكلا كردۆتەوەو وازیهێناوە لەپێكەوەنووستن لەگەڵ ژنەكەی بەشێوەیەكی تەواو: ئەگەر رازی نەبوو بگەرێتەوە بۆ هاوژیانی لەگەڵی یان تەڵاقی بدات بۆ دادوەر هەیە لەسەر داوای ژنەكەی تەڵاقی بدات.

لە (مختصر خلیل)دا هاتووە: (راستتر ئەوەیە كە ئیجتیهادی كردوە[2] و تەڵاقی خستووە بە وتنی سەرجێیی لەگەڵ ژنەكەی ناكەم، یان نامێنمەوە، یاخود بۆ زیانگەیاندن وازی لەچوونەلای ژنەكەی هێنا، لەوێش نەبێت، یان لەپەرستشی هەمیشەییدا بێت كەوادەی كۆتاییهاتنی دیار نەبوو.)[3].

---

(1) سەبارەت بەسوێند خواردن كەنەچێتە لای ژنەكەی ماوەكەی لەكاتی وازهێنانی لەچوونەلای ژنەكەیەوە ئەژمار دەكرێت، وایدەبینم لەم بابەتەدا ماوەكەی لەكاتی بەرزكردنەوەی داواكاریەكەوە لەلایەن ژنەكەوە ئەژماربكرێت.
بۆ زیاتر ئاگاداربوون لەدرێژەی بەشەكانی ونبووو دیار نەماو بگەرێوە بۆ كتێبی (الخرشی) ٤/١٤٩ - ١٥٣ هەروەها بروانە: (الشرح الصغير مع الصاوي) ٢ / ٤٦٩.

(2) واتە دادوەر لەبەر رۆشنایی رەوشەكەو پێویستی ژنەكەدا ئیجتیهادی كردو دەسەڵاتی خۆی بەكارهێنا.

(3) مختصر خليل وشرحه الخرشي ٤/٩٣.

و- ئەگەر مێردەکە دەرمانی نەهێشتنی هێزی سێکسی دەخوارد، یاخود بۆ چارەسەری نەخۆشین لەکاتێکدا دەیزانی کەئەو دەرمانە توانای ناهێڵێت یاخود لەوانەیە نەیهێڵێت پاشان ئەو ئەنجامە دەردەکەوێت ئەوا مافی ژنەکەیە داوای جیابوونەوە بکات[1].

**جەعفەریەکان:**

وتوویانە: لەدوو حاڵەتدا بژاردە لەبەردەم مێردی دیارنەماودا نیە:

یەکەمیان: ئەگەر دیار نەبووەکە هەواڵی دەزانرا وەك ئەوەی بزانرێت کەتائێستا لەژیاندایە.

دووەمیان: هەواڵی نەزانراو بێت بەڵام بەخێوکار (ولی) هەبێت بژێوی خێزانەکەی بکێشێت.

ئەگەر هەواڵی نەزانراو کەس نەبوو بژێوی ژنەکە بکێشێت: ئەگەر ئارامی نەگرت ئەوا داواکەی بۆ دادوەر بەرز دەکاتەوەو لەسەری پێویستە جیاکردنەوەکە بۆ چوارساڵ دوابخاتو، بەدوایدا بگەڕێتو لەبارەی چارەنووسیەوە پرسیار بکات:

أ- ئەگەر زانیی لەژیاندایە ئەوا لەسەری پێویستەهەردەم ئارام بگرێت و لەسەر فەرمانڕەواش پێویستە لە گەنجینەی گشتی (بيت المال) بژێوی دابین بکات.

ب- ئەگەر چارەنووسی نەزانرا کەلەژیاندایە یاخود مردووە فەرمانی پێدەکات کەماوەی چاوەڕوانی مردوو دەست پێبکاتو پاش کۆتایهاتنی ماوەکە (چوار ساڵ) پاشان بۆی هەیە شوو بکاتەوە.

---

[1] انظر شرح الخرشي ٤ / ٩٣، ٩٤، ١٤٩، ١٥٠، ١٥٢، ١٥٣. الشرح الصغير مع حاشية الصاوي ٢/٤٦٩ – ٤٧١.

ئەگەر شووی نەکردەوەو مێردەکەی هاتەوە پاش ئەوە ئەوا دوو بۆچوونیان هەیە دیارترینیان ئەوەیە هیچ پەیوەندییەکی پێوەی نەماوە بەهۆی پچڕانی پەیوەندی هاوسەرێتیەوە بەفەرمانی دادوەر[1].

**حەنبەلیەکان:**

زانایانی حەنبەلی لەبارەی جیاکردنەوە بەهۆی دیارنەمانەوە ئەم درێژەیان باسکردووە:

أ. دیارنەماوی ونبوو لەرەوشێکدا کەئەگەری تیاچوونی زیاتر بێت وەك رەوشی جەنگ، ئەوا ژنەکە چوار ساڵ چاوەڕوان دەکات پاشان ماوەی چاوەڕوانی مردن بەسەردەبات، (مرداوی) دەڵێت[2]: ئەمەش مەزهەبیانەو کۆمەڵی هاوەڵان لەسەر ئەمە رۆشتوونو، ماوەی چاوەڕوانیەکەی دەستبەجێ لەونبوونیەوە دەست پێدەکات بەبێ پێویستبوونی پەنابردن بۆ دادگا لەگێڕانەوەیەکدا کەهەندێك لەزانایانی حەنبەلی بەهەر راستیان داناوە.[3] لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا لەکاتی بەرزکردنەوەی داواکاریەکەیەوە بۆ دادوەر دەست پێدەکات تا فەرمان بەچاوەڕوانی بکاتو پاش مردنیو چاوەڕوانی چوار ساڵ.

ب. دیارنەماوێك ونبوونەکەی لەحاڵەتێکدا بوو کەسەلامەتی زیاتر چاوەڕوانکراوبوو ئەوا لەسەر ژنەکە پێویستە کەچاوەڕوانی بکات تا مردنی دەسەلمێت، جیاکردنەوەی بۆ نیە لەکاتێکدا دەتوانرا بژێوی بکێشرێت ئەگەرنا ئەو مافە بۆ ژنەکە هەیە لەبەر بژێوی نەکێشان نەك لەبەر دیارنەمان[4].

---

(1) ایضاح الفوائد شرح اشكالات القواعد ٣/٣٥٢. المختصر النافع ص ٢٢٥.

(2) الانصاف ٩/٢٨٨.

(3) سەرچاوەی پێشوو ٩/٢٨٩.

(4) سەرچاوەی پێشوو ٩/٢٨٨.

ج. هاوسەری دیلکراو هەمان حوکمی هاوسەری ونبووی هەیە لەرەوشە سروشتیەکاندا[1].

د. ئەگەر دیارنەمانەکە هەواڵ براو نەبوو ئەوا ژنەکە جیاکردنەوەی بۆ نیە مەگەر نەتوانێت لەسامانەکەی بژێوی بکێشێت.[2]

هـ. لەئیمامی ئەحمەد دەگێڕنەوە وتوویەتی: ژنی دیارنەماوەکە کەشوێنی دیارنەماوەکەو چارەنووسی دەزانرێ جیاکردنەوەی بۆ هەیە ئەگەر هاتوو دیارنەمانەکە بەبێ بیانوو بوو پاش هۆشداری پێدرانی لەلایەن دادوەرەوە کەبگەڕێتەوە یان ژنەکەی ببات بۆ لای خۆی یاخود تەلاقی بدات بەپشت بەستن بەدادگاکەی عومەر کەپێویستە مێردە دیارنەماوەکە بگەڕێتەوە بۆی ژنەکەی پاش تێپەڕبوونی چوار مانگ یا بۆ دیارنەمانەکەی پاساویشی هەبێت.

**هەندێك لەزانایانی زەیدی:**

هەندێك لەزانایانی زەیدی بۆ ئەوەچوون ئەگەر ماوەی دیارنەمانەکە زۆری خایاندو ژنەکەش بەهۆی زاهێنانی لەشووەکەی زیانی پێدەگەیشت ئەوا هەڵوەشاندنەوە لەوێدا دروستە چونکە ئەگەر بۆ شلەپەتکی(عنه) دروست بێت ئەوا بۆ دیارنەمانی ماوە درێژ دروستیەکەی لەپێشترە، چونکە لەدەقی قورئانو فەرموودەوە زانراوە حەرامە دەستگرتن بەزیانەوە.[3]

نەهیکراوە لەهاوسەران کەزیانگەیاندن لەجێی خۆیدا نیە لەبەر ئەوە پێویستە زیانەکە بەهەرشتێك کەلەتوانادا بێت هەڵبگیرێت[4].

---

(1) سەرچاوەی پێشوو.

(2) المغني لابن قدامة ٤٨٨/٧.

(3) هەروەك لەم فەرمایشتەدا: (ولا تمسوهن ضرارا لتعتدوا) سورة البقرة: ٢٣١.

(4) بڕوانە: الروضة الندية ٥٦/٢.

تێبینی دەکرێت ئەم ئاراستەیەی زەیدیەکان ماوەی دیاری نەکردووە بەڵکو کارەکەی بۆ هەڵسەنگاندنی دادوەر بەجێ هێشتووە بەپێی رەوشی ژنەکە لەبەر رۆشنایی هۆکارەکانی دیارنەمانیدا.

**شافعی لەوتەی کۆنیدا:**

شافیعی لەوتەی کۆنیدا وتوویەتی جیاکردنەوەو هەڵوەشاندنەوە بۆ ژنی مێرد ونبوو تەنها پاش چوارساڵ چاوەڕوانی هەیە، لەبەر ئەوەی عەمری کوڕی دینار گێڕاویەتیەوە کەئافرەتێك پیاوەکەی ونبوبوو هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب ئەویش فەرمانی پێکرد کەچوار ساڵ چاوەڕوانی بکات پێش ئەوە فەرمانی پێکرد ماوەی چاوەڕوانی (عدە) بەسەر ببات و دوای ئەوە شوو بکاتەوە[1]. لەم بەڵگەیەی شافیعیەوە ئەوە دەخوێنرێتەوە کەچاوەڕوانی کردن لەکاتی بەرزکردنەوەی کارەکەوە بۆ دادگا دەست پێدەکات، هەروەها شافیعی بەهەمان شێوە پشتی بەپێوانەش بەستووەو وتوویەتی: ئەگەر هەڵوەشاندنەوە لەبەر نەتوانینی لاقەکردن دروست بێت و لەبەر نەبوونی نەدەتوانرا بژێوی بکێشێت، جا ەلەپێشترە لەوێدا دروست بێت کە هەرهەمووی لەتواناذا نییە.[2]).

**سەعیدی کوڕی موسەیب:**

سەعیدی کوڕی موسەیب وتوویەتی: ئەگەر لەریزدا[3] ونبوو ئەوا ژنەکەی ساڵێك دوا دەخرێت پاشان لێك جیا دەکرێنەوەو لەرەوشی دیکەدا واتە لەرەوشێکدا کەئەگەری سەلامەتی زاڵتر بوو ئەوا چوار ساڵ دوا دەخرێت پاشان لێك جیادەکرێنەوە[4].

---

(1) المهذب ٢/١٤٦.

(2) المهذب سەرچاوەی پێشوو.

(3) واتە ریزی جەنگ.

(4) المغني لابن قدامة ٧/٤٩٠، المحلى لابن حزم ١٠ / ١٤٠.

**دەرئە نجام:**

لـەم خسـتنە رووەوە بۆمـان دەردەكـەوێت سەرچـاوەی راجیـایی نێـوان زانایـان لەجیاكردنـەوەی دیارنـەماو بریتیـە لەدژیـەكی هەنـدێك لەشـوێنەوار لەگـەڵ رووكـاری دەقەكانی قورئانی پیرۆزدا، وەك دژیـەكی ئـەوەی لەپێغەمبـەرەوە (ﷺ) دەیگێڕنـەوە كەلەبارەی ژنی ونبوویەكـەوە فەرموویـەتی: (انهـا امراتـه حتـی یأتیهـا البیـان) واتـە: ژنیەتی تا ئەو كاتەی هەواڵی دروستی دەزانرێت، لەگـەڵ رووكـاری ئـەم فەرمایشـتەی خوای گەورەدا: (فامسكوهن بمعروف) [1].

لەلایەكی دیكەوە دژیەكی دادوەری هاوەڵان، وەك جیاوازی دادوەری عـەلی كـوڕی ئەبوتاڵب بەپێچەوانەی ئەوەو هی دیكەیەوە.

بەهەمان شێوە دژیەكی پێوانەیـە لەسـەر پەككەوتەیی(عنـە)و بـڕێوی نەكێشـانو سوێندی نەچوونەلا(الایلاء) لەگەڵ بەباشزانین (استصحاب) (الثابت بالیقین لا یزول الا بالیقین) واتە: ئەوەی بەیەقین چەسپا بێت ئەوا تەنها بەیەقین لادەبرێت.

پاشـان دژایـەتی تێڕوانینـی خـودی ئـەو زانایانـە لەسـەیركردنی زیـانی مەعنـەوی (بێبەشبوونی ژن لەچێژی پێكەوە بوون) دا، هەیانە بەهەنـدی وەرگرتـووەو جیـاوازی نەكردووە لەنێوان ئەو زیانە مەعنەویەو زیانی مادی (بێبەشبوون لەبـڕێوی)دا، هەیانـە تــەنها زیــانی مــادی لەبەرچــاوگرتووەو هەریەكــەیان ئاراســتەیەكی هەیــەو خــۆی خاوەنیەتیو خوای گەورە ئاگادارترە بەبۆچوونی راستو دروست.

**پەسەندزانین (الترجیح):**

تێگەیشتوترینیان ئەوەیانە كەئیمام سەعیدی كوڕی موسـەیب (رەحمـەتی خـوای لێبێت) بۆی چووە كە مێرد ئەگەر لەرەوشێكدا دیارنەما كەئەگەری مردنـی زیـاتر بـوو

---

[1] (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً)(الطلاق: ٢).

ئەوا دادوەر پاش ساڵێك لەبەرواری دیارنەمانەوە نەك لەبەرواری بەرزکردنـەوەی دلوای جیاکردنەوەکەوە فەرمان دەکات بەجیاکردنەوە هەتا ژنەکـە زیـانی پێـنـەگات، ئەگـەر ویستی لەسەر جیاکردنەوە بوو لەسەر داوای خۆی یاخود لەرێی بریکاریەوە، ئەگـەرنا دیارنەمان لەرەوشی ئاساییدا دەبێت پاش چوارساڵ لەبـەرواری دیارنەمانیـەوە بێـت، ئەسیریش ئەگەر چارەنووسی زانرا ئەوا ئەگەر مەترسی ئەوە نـەبوو ژنەکـەی تووشـی ئاشووب ببێت ئەوا چوارساڵ دوادەخرێت ئەگەرنا دادوەر بـۆی هەیـە لەبـەر رۆشـنایی ئەو رەوشەی ژنەکەی تێدایە بڕیار دەربکات.

ئـەو کەسەشـی بەنـدکراوە بـۆ مـاوەی زیـاتر لەچوارسـاڵ ئەگـەر ژنەکـەی داوای جیاکردنەوەی کرد ئەوا لەبەرواری جێبەجێکردنی حوکمەکـەوە سـاڵێك دوا دەخرێـت، ئەو دیارنەماو (غائب)ەشی کەچارەنووس‌و شوێنی دیارەو پاسـاو بـۆ دیارنەمانەکـەی هەیـەو پاسـاوی دیارنەمانەکـەی ئـەوە دەخوازێـت کـەزیاتر لەچـوار سـاڵ نـەتوانێت بێتـەوە، ئـەوا ژنەکـەی حـوکمی بەنـدکراو و ئـەو کەسـەی پێـدەدرێت کـە دیارنیـەو چارەنووس‌و شوێنی دیارەو هیچ پاساوێکی نیـەی پێـدەدرێت، پـاش هۆشـداریدان و تێپەڕبوونی ساڵێك بەسـەر دیارنەمانیـدا مـافی جیاکردنـەوە بـۆ ژنەکـەی هەیـە، وەك کارکردن بەوەی هەندێك لەزانایانی مالکی بـۆی چـوون ئەمـەش بەچاوپۆشـی لـەوەی ماوەی دیارنەمانەکەی چەندی پێدەچێت.

ئەو مێردەشی ئامادەیەو بەبێ پاساو ژنەکەی بەجێهێشتووو بەوهۆیـەوە ژنەکـەی زیانی پێگەیشتووە، بەهەمان شێوەی سوێندخۆر(المولی) مامەڵەی لەگـەڵ دەکرێـت، بۆ دادوەر هەیە پاش پێدانی هۆشداری‌و دەرفەت کەبەپێی ئیجیتهادی خۆی ماوەکەی دیاری دەکات پاش ئەوە لەیەکیان جیابکاتەوە، بەو مەرجەی مـاوەی سـوێندخوارنی کەنەچێتەلای(مدة الایـلاء) چـوار مـانگ تێپـەڕێت بـەپێی ئـەوەی مـالیکی لـەبارەی حوکمەکانی سوێندخۆر (المولی) وتوویەتی‌و بەسەر ئەو کەسەشـدا جێبـەجێ دەبێـت کەبەئەنقەست ژنەکەی بەجێهێشتووەو پەیوەست نیە بـە سـوێندخوارن (یمـین)ەوە،

وەك كـاركردن بەگشـتێتی دەقەكـە كەفـەرمان دەكـات بەهـەڵگرتنی ناڕەحـەتیو نەهێشتنی سـتەمو، بەرەنگاربوونـەوەی سـتەمو، هـەڵگرتنی بەشـخوراوی (الغـبن)و، جیاوازیش ناكرێت لەنێوان زیانی مادیو زیانی مەعنەوی زیان لێكەوتوودا.

هەروەها لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز كەمترین ماوەی داواكردنی ژنەكـەی بـەمافی سەرجێی ئەگەر لێی بەبەشبوو بەچوار مانگ دیاری كردووە لەم فەرمایشتەدا: (لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ، وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) [1].

هـەروەها لەبـەر ئـەوەی عومـەری كـوڕی خـەتاب (ڕەزای خـوای لێبێـت) لـەكاتی جێنشـینیدا پرسـیاری لـەئافرەتانێك ( دەگوترێـت كەپرسـیاری لەحەفصـەی كچـی كردووە) كرد: ژن چـەند ئـارام دەگرێـت لەسـەر مێـرد. وتیـان: دوو مـانگ، لەسـێیەم مانگدا ئارامگریەكەی كەم دەبێتەوە، لەچوارەم مانگـدا ئـارامی نامێنێـت، ئـەویش بـۆ بەرپرسـانی سـەربازی نووسـی: هـیچ پیاوێـك زیـاتر لەچـوار مـانگ لەژنەكـەی دوور مەخەنەوە.

ئەمەی كاتێك بڕیار لەسەردا پاش ئەوەی شەوێك لەشاری مەدینە دەگـەڕاو گـوێی لەژنێك بوو دەیووت:

تطاول هذا الليل وازورَّ جانبه [2] وليس الى جنبي خليل أُلاعبه [3]
فوالله لو لا الله لا شيئ غيره [4] لزعزع [5] من هذا السرير جوانبه
مخافة ربي والحياء يكُفّني واكرِمُ بَعلي ان تُنال مراكبه [1]

---

(1) سورة البقرة: ٢٢٦، ٢٢٧.

(2) أي انحرف وعدل. لەگێڕانەوەیەكی تردا: واسود جانبه.

(3) لەگێڕانەوەیەكی تردا: وطال علي ان لا خليل الاعبه.

(4) لەگێڕانەوەیەكی تردا: فو الله لو لا خشية الله وحده.

(5) زعزعه: جوڵەیەكی توندە.

## سێیەم - جیاکردنەوە لەبەر سەرپێچییەک کە ژن و مێرد یەکێکیان ئەنجامی بدات (التفریق لمعصیة یرتکبها احد الزوجین):

ئەم سەرپێچییە نمونەی زۆرە لەفیقهی ئیسلامیدا، لەوانە: سوێندخواردنی مێرد بەنەچوونەلای ژن(الایلاء)و نەفرین (اللعان) [2] و هەڵگەڕانەوەی ژن‌و مێرد یەکێکیان‌و ئامادەنەبوونی یەکێکیان بۆ موسڵمان بوون پاش ئەوەی ئەوی دیکەیان موسڵمان بوو...

پێشتر بەدرێژی حوکمەکانی سوێندخواردن بەنەچوونەلا (الایلاء)مان خستە روو، هیچ پێویستە بەدووبارەکردنەوە ناکات، سەبارەت بەوانەی دیکە ئەمانە دەخەینە روو:

### ١- نەفرینلێکرد (اللعان) [3]:

لەوانەیە روویدات کەمێرد بەشێوەیەکی راستەوخۆ یاخود بەناڕاستەوخۆ ژنەکەی بەناپاکیکردن تاوانبار بکات، وەك ئەوەی رەتی بکاتە ئەو سکەی ژنەکەی لەم بێت‌و بڵێت: ئەم سکەت یاخود ئەو منداڵەت لەمن نیە، ئەم تاوانبارکردنە ناوزڕاندن (قذف)ە،

---

(١) بڕوانە: (المغني)ی ابن قدامة ٧ / ٣٠١.

(٢) سوێندخواردن بەنەچوونەلای ژن (الایلاء)و پێویستکاری نەفرین لەسەرپێیەکانن، لەکاتێکدا سوێندخواردن بەنەچوونەلای ژن لەبەر ئەو ستەمەیە کەبەبێ پاساو دژ بەژنەکە تێیدایە، بەڵام نەفرینلێکردن چونکە ژن‌ومێردەکە یەکێکیان لەسەر تاوانی ئەنجام دلوە، تاوانی درۆ یاخود زینا هەروەك ئەوەی پێغەمبەرﷺ بەدوو نەفرین لێکەرەکەی فەرموو: (وحسابکما علی الله احدکما کاذب لا سبیل لك علیها). واتە: لێپێچینەوەتان لای خوایە یەکێکیتان درۆی کردووەو رێگەیەکی تری لەبەردەمدا نیە. نیل الاوطار ٦ / ٣٠٤.

(٣) نەفرین (اللعان): چاوگەی وشەکە لەزمانی عەرەبیدا (لاعن یلاعن ملاعنة)یەو لە (اللعن) وەرگیراوە کەمانای دەرکردن‌و دوورخستنەوە دەدات، رووکاری گونجان لەنێوان واتا زمانەوانی‌و شەرعیەکەیدا ئەوەیە ژن‌و مێردەکە لەبەزەیی دوور دەکەونەوە یاخود هەریەکەیان لەویتریان دووردەکەوێتەوە بەجۆرێك هەرگیز بەیەکەوە کۆنابنەوە. عمدة القاریٔ شرح صحیح البخاري ٢٠/ ٢٨٩.

وا پێویستە حوکمەکانی کەلەئایەتەدا هاتووە بەسەریدا جێبەجێ بکرێت: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)[1].

بەڵام حیکمەتی خوای گەورە وایە کەسزاکە بەرێگەیەکی تر بێت بەجۆرێك کە گومان رووبکردۆتە بونیاتی خێزان، لەبەر ئەوە بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتی دەرئەنجامی خراپی لێدەکەوێتەوە کەشوێنەوارەکانی بەخراپ بشکێتەوە بەسەر منداڵەکانیانداو لەوانیشەوە بەسەر کۆمەڵگادا.

لەسەر بنەمای ئەم راستیەو جگە لەمەش خوای گەورە دەفەرموێت: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلاَّ أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنْ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنْ الْكَاذِبِينَ، وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنْ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنْ الصَّادِقِينَ)[2]، بەپێی ئەم ئایەتانە کەچۆنیەتی نەفرینلێکرانی خستۆتە روو پێویستە ئەم رێکارانە بگیرێتە بەر:

١- پێویستە نەفرینلێکردنەکە لەبەردەم دادوەر یاخود جێگرەکەیدا بێت، چونکە سوێنددانو شایەتیەکان نابنە بەڵگە ئەگەر لەبەردەم دادگادا نەبێت.

٢- دادوەر یاخود جێگرەکەی فەرمان بکات بەهەردوولا نەفرین لێککارەکە کەئەو دەربڕینەی لەو ئایەتانەدا هاتووە بڵێنەوە، مێردەکە چوارجار دەڵێت: خوا شاهێدە لەو تۆمەتەی دەیدەمە پاڵ ژنەکەم راستگۆ بم، دوای ئەوە لەجاری پێنجەمدا دەڵێت: نەفرین (لەعنەت)ی خوام لێم بێت ئەگەر درۆ بکەم، ژنەکەشی چوارجار دەڵێت: خوا شاهێدەی ئەوەی دەیداتە پاڵم درۆ دەکاتو، لەجاری

---

[1] سورة النور: ٤.

[2] سورة النور: ٩،٨،٧،٦.

پێنجەمدا دەڵێت: بەر تورەیی خوا بکەوم ئەگەر ئەو راست بکات.

٣- پێویستە نەفرین لێکردنی مێرد بخرێتە پێش نەفرینی ژنەکەیەوەو بەشوێن یەکدا بێت وەك ئەوەی لەقورئاندا هاتووەو، وەك ئەوەی پێغەمبەری مەزن (ﷺ) ئەنجامی داوە، لەبەر ئەوەی نەفرینکردنی ژنەکە بۆ دوورخستنەوەی ئەشکەنجەیە لێیو ئەمەش پاش نەفرینی مێردەکەی لێی دەبێت.

٤- وشەکانی نەفرینلێکردنەکە هەموویان بەدوای یەکدا بێت.

٥- هەریەك لەنەفرینلێککارەکان بەرانبەرەکەی بەئاماژە یاخود رووبەڕوو یان بەناونیشانی تەواو دیاری بکات.

شوێنەواری نەفرین (آثار اللعان):

**زانایانی موسڵمان هیچ را جیاییەکیان[1] نیە کەنەفرین لێکردنی ژنو مێرد پاش کۆتایهاتنی ئەم شوێنەوارانەی لێدەکەوێتەوە:**

أ- حەرامبوونی ژنەکە بەدرێژای ژیان لەمێردەکەی.

ب- سزای سوکایەتی پێکردن (قذف) ناکەوێتە سەر مێردەکەو، سزای زیناش ناکەوێتە سەر ژنەکە چونکە بەبەڵگە تۆمەتەکە نەسەلمێنراوە.

ج- بەفەرمانی دادوەر رەچەڵکی مناڵەکە یان سکەکە نادرێتە پاڵ باوکەکە.

د- جیاکردنەوەی ژنو مێردەکە بەبڕیاری دادوەر.

را جیایی لەم دوو شوێنەوارەی کۆتایدایە کەئایا دەکەوێتە سەر نەفرینکار (اللعان)و ئەگەر حوکمی دادوەر پێی نەگەیشتبوو یاخود نا؟ هەر وەك لێرەدا باسی دەکەین:

---

[1] واتە بەپێچەوانەوە ماوەی چاوەڕوانی جدەبێت ئەگەرنا عوسمانی بەتی لەمبارەیەوە بۆ ئەوە چووە کە بەنەفرینکردنو دادوەر جیاکردنەوە روونادات بەڵکو مێردەکە دەیخات، ئەبو عوبەیدەش دەڵێت جیاکردنەوە روودەدات بەهەمان ناوزڕاندن با نەفرینیش نەبێت. بڕوانە: عمدة القاریء شرح صحیح البخاري ٢٠/٢٩٥.

١- حەنەفیەکان[1]- جگە لەزوفەر- و زەیدیەکان[2]و، حەنبەلییەکان لەیەکێ لەدوو گێڕانەوەی ئیمام ئەحمەددا[3]، وتوویانە: نەفرین هەرکاتێ پێویست بوو لەنێوان ژن‌و مێرددا بەشێوەیەکی راست ئەنجامدراو ئەوەی دەبێتە مایەی بەتاڵکردنەوەی ئەگەر روویدا ئەوا دەستبەجێ لێك جیاناکرێنەوەو رەچەڵەکەکەی ناپچڕێت پاش ئەوە نەبێت دادگەری دادوەری تێیدا ئەنجام درابێت، پێش ئەو بڕیارە هاوسەرگیریتی بەردەوامەو، رەچەڵەك ماوەو، بەم پێیە ئەگەر فەرمانی دادوەر دوا کەوت یاخود نەتوانرا بەهۆی کەوتنی نەفرینەکەوە، ئەوا تەڵاقی مێردەکەو، وتنی ئەوەی ژنەکەی وەك دایك‌و خوشکی وایە (ظهار)و، سوێندخواردنی کەنەچێتە لای ژنەکەی(الایلاء) تا ئەو رادەیە راست دەبێت‌و، میرات لێك وەردەگرن‌و بۆ ئەمەش بەڵگەیان بەفەرموودەی پیرۆزو، پێوەر (قیاس)و، بەباشزانین (استصحاب) هێناوەتەوە.

**فەرموودە:**

گێڕانەوەی زۆر هەیە بەڵگەیە کەپێغەمبەر (ﷺ) خۆی بڕیاری جیاکردنەوەی ژن‌و مێردی نەفرینکاری داوە پاش نەفرینەکەیان، لەوانە:

ئەوەی دەیگێڕنەوە لەنافع ئەویش لە ئیبن عومەر (رەزای خوایان لێبێت) کەپێغەمبەر (ﷺ) نەفرینی نێوان ژن‌و مێردێکی کردو رەچەڵەکی مناڵەکەی لێ پچڕی‌و لێکی جیا کردنەوەو مناڵەکە درایە پاڵ ژنەکە[4]. ئەوەشی لە ئیبن عومەر(رەزای خوای لێبێت) دەیگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (ﷺ)نەفرینی نێوان ژن‌و مێردێکی ئەنصاری ئەنجامداو لێکی جیا کردنەوە[5].

---

(١) بداية المبتدى وشرحه الهداية مع فتح القدير ٤/٢٨٥-٢٨٦.

(٢) التاج المنهب ٢/٢٦٣-٢٦٤.

(٣) المغني لابن قدامة ٧/٤١٠.

(٤) عمدة القارئ شرح صحيح البخاري للعيني ٢٠/٣٠١ نيل الاوطار ٦/٢٩٩.

(٥) عمدة القارئ سەرچاوەی پێشوو ٢٠/ ٢٩٥، فتح الباري شرح صحيح البخاري ٩/٤٥٨.

هەروەها لەو فەرموودەی کەلە عبیداللە ئەویش لەنافیعەوە گێڕاویانەتەوە کەئیبن عومەر هەواڵی پێداوە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ)ژن و مێردێکی لێك جیاکردەوە کە سوکایەتی پێکردبوو و سوێندیشی دان[1]. ئەوەش کە عویمری عەجلانی پاش نەفرین وتی: درۆم لەگەڵدا کرد ئەی پێغەمبەری خوا، (کذبت علیها یا رسول الله ان امسکتها فطلقها ثلاثاً) سێ بەسێ تەڵاقی دا پێش ئەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پێبکات[2].

رووکاری بەبەڵگەبوونی (وجه الاستدلال):

سێ گێڕانەوەکەی یەکەم بەراشکاوی بەڵگەیە کەپێغەمبەر (ﷺ) خۆی بڕیاری جیاکردنەوەی ژن و مێردە نەفرینکارەکەی پاش نەفرینەکە دەرکردووە، ئەمەش بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەی جیاکردنەوە پاش دادگایکرانی لەلایەن دادوەرەوە دەبێت.

لە تەڵاقدانەکەی عومەیرەوە پاش نەفرین و بێدەنگبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لێی ئەوە تێدەگەین کەجیاکردنەوەکە تەنها بەنەفرینیان نەبووە ئەگەر وابوایە ئەوا هیچ پاساوێك بۆ تەڵاقەکە نەدەمایەوە.

پێوانە (القیاس):

وتوویانە: نەفرین یان ئەوەتا شایەتیەکی تەواو دڵنیایە بەسوێند یان ئەوەتا سوێندەو، هەردووکیشیان هیچ شوێنەوارێکی نیە لەنەهێشتنی مافدا ئەگەر هاتوو لەدادگا نەبوو، ئەمەش وەك پێوانە لەسەر شایەتی و سوێنددان لەبابەتەکانی تردا کەهیچ شوێنەوارێکیان لێناکەوێتەوە پاش بڕیاری دادوەر نەبێت.

---

[1] عمدة القاری سەرچاوەی پێشوو.
[2] نیل الاوطار ٦/ ٣٠٠.

**بەباشزانین (الاستصحاب):**

وتوویانە: حوكمی هاوسەرگیریەكە بەهۆكارێكی شەرعی (گرێبەندی هاوسەرێتی) بەیەقینی چەسپاوەو تەنها بەهۆكارێكی شەرعی (تەڵاق) نامێنیت، ئەگەر نەهێشتنی پێویستی كرد، مێردەكەش رێگری كرد، یاخود ئەگەر نەیتوانی ئەوا دادوەر لەبری ئەو بڕیار دەدات.

٢- مالكیەكان[١]و، جەعفەری[٢]و زاهریەكان[٣]و، زوفەر لەحەنەفیەكان[٤]و، گێرانەوەیەكی حەنبەلیەكان[٥]، بۆ ئەوەچوون كەجیاكردنەوە بەتەواوبوونی نەفرینی ژنومێردەكە دەبێتو، بۆ ئەمەش بەفەرموودەو پێوان (قیاس) بەڵگەیان هێناوەتەوە.

---

[١] لە: شرح الخرشي (١٣٤/٤)دا هاتووە: (دەرئەنجامی نەفرین شەشە، سیانیان دەكەوێتە سەر نەفرینی مێرد: هەلگرتنی سزا -حد- لەسەریو، پێویستبوونی سزا -حد- لەسەر ژنەكەو، پچڕاندنی رەچەڵەكی سكەكە، نەفرینی ژنەكەش سێی لێدەكەوێتەوە: هەلگرتنی سزا -حد- لەسەریو، هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەكەیو، هەتا هەتایە حەرامە بۆی).

[٢] لە: ایضاح الفوائد (٤٥١/٣)دا هاتووە: (چوار حوكم پێكەوە پەیوەستە بەنەفرینكردنەكەیانەوە: لێك جیاكردنەوە یان نابنە میراتگری یەكتر، بۆ هەمیشە بۆیەكتر حەرام دەبن، كەوتنی هەردوو سزاكە -الحدین-، دابڕانی منداڵەكە لەباوكیو مانەوەی لای دایكی، جیاكردنەوەیان تەنها بەبڕیاری دادوەر نابێت بەڵكو بەهەمان نەفرین روودەدات، جیاكردنەوەش بەنەفرین هەڵوەشاندنەوەیە نەك تەڵاق).

[٣] لە: المحلى (١٤٣/١٠) دا هاتووە: (ئافرەتەكە بە نەفرینلێكردن لەسزا -حد- دەربازی دەبێتو مارەبڕینەكەی هەڵدەوەشێتەوەو بۆهەمیشە لێی حەرام دەبێتو، هەرگیز بۆی حەڵاڵ نابێتەوەو، بەتەواوبونی نەفرینەكە جیاكردنەوەكە روودەدات).

[٤] لە: الهدایة مع فتح القدیر (٢٨٦/٤) دا هاتووە: (زوفەر وتوویەتی بەنەفرین لێككردنیان جیاكردنەوە روودەدات، چونكە حەرامبوونی هەتاهەتایی بەم فەرموودەیە چەسپاوە: (المتلاعنان لا یجتمعان ابدا).

[٥] لە: المغني ٤١٠/٧ دا هاتووە: (گێرانەوەی دووەم تەنها بەنەفرینیان جیاكردنەوە روودەداتو ئەمەش بۆچوونی مالكو داودو زوفەرە).

**فەرموودە:**

بەهەمان شێوە لەفەرموودەکانی پێغەمبەریشدا گێڕانەوە هەیە پشتگیری ئەوە بکات کەجیاکردنەوە پاش بڕیاری دادوەر دەبێت، هەروەها فەرموودەی دیکەش هەیە ئەوەی لێدەخوێندرێتەوە کەجیاکردنەوە بەهۆی نەفرینی ژنو مێردەوە دەبێتو نەبەستراوەتەوە بەبڕیاری دادوەرەوە، لەوانە: ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): (المتلاعنان لا يجتمعان)[1] واتە: نەفرین لێککاران بەیەکەوە کۆنابنەوە. رووکاری بەڵگە لەم فەرموودەیەدا ئەوەیە پاش نەفرینەکەیان ژنو مێرداەیتیان دەمێنێتەوە ئەمەش دژە لەگەڵ ئەم دەقەدا.

ئەو گوتەیەی پێغەمبەریش (ﷺ) بەو پیاوەی نەفرینی کردبوو –پاش نەفرینەکەی–: (لا سبيل لك عليها) واتە: هیچ رێگایەکت نەماوە بۆلای. وتوویانە دەربڕینی(سبيل) نەکیرەیە لەسیاقی (نفی)دا واتای گشتی دەگەیەنێت، ئەو گوتەیەی عەلی و ئیبن مەسعود(رەزای خوایان لێبێت): (سالێك تێپەڕی بەسەر نەفرینکاراندا ئەوا هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە)[2]، ئەمە بەڵگەیە کەنەفرینی ژنو مێرد حەرامبوونی بۆ هەمیشەی لێدەکەوێتەوەو ئەوەش وا پێویست دەکات دەستبەجێ پاش نەفرینەکە لێك جیا بکرێنەوە.

باجی[3] وتوویەتی: فەرموودەکەی عومەیر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەجیاکردنەوە پاش نەفرینلێککردن روودەداتو نەبەستراوەتەوە بەدادگاوە، بە بەڵگەی ئەوەی تێیدا هاتووە (قبل ان يأمره رسول الله) ئەم قسەیە بەڵگەیە کەجیاکردنەوە بەبێ فەرمانی دادوەر روودەدات.

---

(1) نيل الاوطار ٦/٣٠١.

(2) سەرچاوەی پێشوو ٦/٣٠٤.

(3) المنتقى شرح الموطا للباجي ٤/٧٣.

## پێوان (القياس):

وتوویانە: ئەم جیاکردنەوەیە وەك جیاکردنەوەیە بەهۆی حەرامێتیو شیرخواردنو زنو زنخوازی لەوەی حەرامبوونی هەمیشەیی دەخوازێت، هەروەك چۆن حوکمی پێوانە پێکراو پێویستی بەبڕیاری دادگا نیە بەهەمان شێوە پێوانە لەسەرکراویش[1].

٣- شافعیەکان وتوویانە: جیاکردنەوەکە بەتەواوبوونی نەفرینی مێرد کۆتایی دێت با ژنەکەش[2] نەفرینی لێ نەکات، دادوەریش[3] بڕیاری لەسەر نەدابێت، ناشبینین - وەك من ئاگادار بم- هیچ کام لەزانایان هاودەنگی شافیعیەکان بێت لەو بۆچوونەیاندا کەجیاکردنەوەکە تەنها بەنەفرینی مێرد روودەدات.

مامۆستا فەرەج سەنهوری (رەحمەتی خوای لێبێت) لەمەدا لێی تێکچووەو وتوویەتی: (وتوویانە هەروەها جیاکردنەوە بەتەواوبوونی نەفرینی مێرد روودەدات با ژنەکەش نەفرینی لێنەکات ئەمەش رووکاری بۆچوونی مالکیە لە کتێبی (الموطأ)داو بۆچوونی (اصبغ)یشە)[4].

---

[1] المنتقى شرح الموطا ٧٣/٤.

[2] لە: قليوبي وعميرة (٣٧/٤)دا هاتووە: (جیاکردنەوە پەیوەندی هەیە بەنەنەفرینی مێردەکەوە با درۆش بکات یاخود ژنەکە نەفرینیشی نەکردبێت یاخود حاکم فەرمانی دەرنەکردبێت).

[3] لە: شرح التحرير مع الشرقاوي (٣٠٨/٢ - ٣٠٩) دا هاتووە: ( بەنەفرین لێکردنی شەش حوکم دێتە ئارا: نەمانی ئەو رەچەڵەکەی رەتی کردۆتەوە لەو بێت، نەهێشتنی سزا -حد- لەسەری، ژنەکە بۆ هەتا هەتایە لێی حەرام دەبێتو، سزا -حد- لەسەر ژنەکە پێویست دەبێتو، هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕینەکەی بەرووکارو ناولخن (ظاهرا وباطنا) هەروەك شیرخواردن (رضاع)و، نەمانی مافی دلیەنێتی بۆی) شەرقاوی لەسەر دەربڕینی (بلعانه) قسەی هەیەو دەڵێت: واتە پاش دابڕانی لێی بەبێ وەستان لەسەر نەفرینو دادگاو دادوەر.

[4] مامۆستامان شێخ (فرج السنهوري)، چەند وانەیەك لەبابەت (النسب) کەپێشکەشی قوتابیانی خوێندنی باڵای -کۆلێژی یاسا-ی زانکۆی قاهیرەی کردووە ١٩٧٢ لاپەڕە ٦٢ منیش یەکێك بووم لەقوتابیەکان لەوکاتەدا خوای گەورە بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

ئەمەش بەتەواوەتی پێچەوانەی ئەوەیە کەلەکتێبی(الموطأ وشرحه المنتقى)دا هاتووە کەئەمە دەقەکەیەتی: (ولا تقع الفرقة بالتعان الزوج حتى تكمل المراة الالتعان)، واتە: (بەنەفرینی مێرد جیاکردنەوە روونادات تا ژنەکەش نەفرین تەواو نەکات)، بەپێچەوانەی شافعیەوە لەو بۆچوونەیدا کەدەڵێت بەنەفرینی مێرد جیاکردنەوەکە دەبێتو (اصبغ) لە ئیبن قاسم لە(العتبية)دا گێڕاویەتیەوە کەجیاکردنەوە بەنەفرینی مێرد دەکەوێت بەڵام بەنەفرینی ژنەکە تەواو دەبێت، ئەم بۆچوونە پێچەوانەش لەمەزهەبەکەدا ناکۆکیە لەدەربڕیندا، چونکە جیاکردنەوەکە پارچەپارچە ناکرێت، لای هاوەڵانمان جیاوازی نیە ئەگەر ژنەکەش نەفرین نەکات ئەوا جیاکردنەوە روونادات، هەروەها ئەگەر خۆشی بەدرۆ خستەوە پێش نەفرین لێککردنیان، مالیك وای وتووە)[1].

لەم قسانەوە ئەمانەمان بۆ روون دەبێتەوە:

١-هیچ کەس لەمالکیەکان هاوڕا نەبووە لەگەڵ شافیعی چونکە ئەوەی وتوویەتی جیاکردنەوە بەنەفرینی مێرد روودەدات، ئەوەشی وتووە نەفرینەکە تەواو نابێت تا ژنەکەش نەفرین نەکات.

٢-ئەوەی وتوویەتی بەنەفرینی پیاوەکە تەواو دەبێت ئەگەر نەفرینی ژنەکە پاش ئەوە روویدا لەرووی واتاوە هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ ئەوەی وتوویەتی کەبەبێ نەفرینی ژنەکە کۆتایی نایەت، چونکە ناکۆکی لەدەربڕیندایە، هەروەك (باجی) وتوویەتی: (ناکۆکی تەنها لەدەربڕیندایە).

٣-هیچ کەس لەمالکیەکان نەیوتووە ئەگەر ژنەکە نەفرینی نەکرد ئەوا جیاکردنەوە روودەدات، بەپێچەوانەی ئەوەی شافعیەکان لەسەری کۆدەنگن کەنەفرینی مێرد دەبێتە هۆی جیاکردنەوە باژنەکەش نەفرینی نەکردبێت یاخود دادوەریش بڕیاری تێدا نەدابێت.

---

[1] بڕوانە: المنتقى شرح الموطا ٤ / ٧٣.

٤–(باجی) کە وتوویەتی: (مالیك ئەمەی وتووە) واتا وتوویەتی هەرکەس خۆی بەدرۆ خستەوە پێش تەواوبوونی نەفرینی ژنەکەی ئەوا جیاکردنەوەکە روونادات.

**پەسندکردن (الترجیح):**

وایدەبینم تێگەیشتوانەترینیان لەبەر دوو هۆ ئەوەیانە کەحەنەفیەکانو ئەوانەی وەك ئەوان بۆی چوون:

یەکەم – چەسپاندنی دادگای پێغەمبەر (ﷺ) بەجیاکردنەوە پاش نەفرینی ژنو مێردەکە هەردووکیان ئەمەش لەچەندین گێڕانەوەدا هاتووە وەك باسمان کرد.

دووەم – کۆدەنگی زانایانی موسڵمان لەسەر ئەوەی کەنەفرین پێویستە لەبەردەم داوەردا یاخود بریکاریدا بێت، بەڵگە نەویستە کەهەموو رێکارێکی دادگا پێویستە بەبڕیاری داوەر کۆتایی بێت.

**٢- هەڵگەڕانەوەی ژن و مێرد یەکێکیان (ردة احد الزوجین):**

**هەڵگەڕاوە (المرتد):** بریتیە لەو کەسەی پاش موسڵمانبوونی بێباوەڕ دەبێت ئیدی ئایا بێباوەڕبوون پێش موسڵمان بوونی کەوتبێت یان نا، یان هەڵگەڕانەوەکە بەکردار بێت وەك کڕنووشوپەرستشی بۆ بوونەوەر (مخلوق)ێك لەبێ گیانەکان یاخود رووەك یان گیانلەبەر یاخود مرۆڤ، یان قورئان فڕێدانە ئاودەستخانەو، هەر کارێکی تر بەئاشکرا مانای سوکایەتی بگەیەنێت بەئاینی ئیسلام، یاخود بەوتن بێت وەك دەربڕینێك کە بەراشکاوی گوزارشت بێت لەنکوڵی لەشتێك کەبەئاشکرا بزانرێت لەئیسلامدا چەسپابێت، یاخود حەرامکردنی شتێك کەئیسلام حەڵاڵی کردبێت، یاخود حەڵاڵکردنی شتێك کە ئیسلام حەرامی کردبێت... ئیدی هەموو ئەوانە لەبەر مکوڕ (عیناد)ی بێت یاخود بەبیروباوەڕەوە یان بەگاڵتەکردن بێت....

مەرجە هەڵگەڕاوە باڵغو عاقڵو سەرپشك (الاختیار)و، بەمەبەست (القصد) بێت.

هەڵگەڕاوە حوکمی زۆر لەبارەیەوە هەیە، ئەوەی بەلای ئێمەوە گرنگ بێت لێرەدا حوکمی هاوسەرگیریەکەیەتی ئەگەر هاتوو هاوسەرگیری کردبوو.

هیچ ناکۆکی نیە لەنێو زانایانی موسڵمان –جگە لەزهریەکان– کە هەڵگەڕانەوەی ژن و مێرد یەکێکیان پێش چوونەلا ئەوا دەستبەجێ جیاکردنەوەی لێدەکەوێتەوە[1].

هیچ ناکۆکی نیە کەهەڵگەڕانەوەی یەکێکیان بەدڵنیاییەوە دەبێتە هۆی جیاکردنەوە پاش تەواوبوونی ماوەی چاوەڕوانی ئەگەر هاتوو لەو ماوەیەدا نەیگێڕایەوە لای خۆی لەحاڵەتێکدا هەڵگەڕانەوەکە پاش چوونەلا روویدابوو.

بەڵکو ناکۆکی لەوەدایە ئایا جیاکردنەوە پاش هەڵگەڕانەوە روودەدات بەبێ چاوەڕوانی کۆتایهاتنی تەواوبوونی ماوەی چاوەڕوانی ئەگەر هاتوو پاش چوونەلا بوو یاخود نا؟ بەپێی ئەم درێژەیە:

أ. حەنەفی[2] و مالکی[3] و حەنبەلیەکان لە بۆچوونێکیاندا[4] و زەیدیەکان بۆ ئەوە چوون کە: هەڵگەڕانەوەی ژن و مێرد یەکێکیان جیاکردنەوەی لێدەکەوێتەوە ئیدی

---

(1) لە: ایضاح الفوائد شرح القواعد (٣/١٠٤)دا هاتووە: (زانایانی موسڵمان –جگە لەدلودی زاهری– کۆدەنگن کەئەگەر ژن و مێرد یەکێکیان پێش چوونەلا هەڵگەڕانەوە ئەوا مارەبڕینەکە هەڵدەوەشێتەوە).

(2) لە: الاختيار لتعليل المختار (٣/١٦٢ – ١٦٣) دا هاتووە: (ئەگەر ژن و مێرد یەکێکیان هەڵگەڕانەوە ئەوا بەبێ تەلاقدان جیاکردنەوەکە روودەدات، محمد وتوویەتی: ئەگەر هەڵگەڕاوەکە مێردەکە بوو ئەوا جیاکردنەوەکە تەلاقە، ئەگەر هەڵگەڕانەوەکە پاش چوونەلا بوو ئەوا مارەیی هاوشێوەی بۆ هەیە و پێش چوونەلاش بێت ئەوا هیچ بەژنەکە نادرێت و بژێویشی نادرێت، ئەگەر هەڵگەڕاوەکەش مێردەکە بوو ئەوا پاش چوونەلا بوو هەموو مارەییەکەی دەدلتێ، پێش چوونەلاش نیوەی دەداتێ.

(3) لە: الشرح الصغير مع الصاوي (٢ / ٣٨٨) دا هاتووە: (ئەگەر (المحصن) (المحصانە) ئەگەر موسڵمانبوو زینای کرد ئەوا بەردباران (رجم) ناکرێت) هەروەها تێیدا هاتووە: (ئەگەر کەسەکەی بۆ حەڵاڵ بوو پاشان هەڵگەڕایەوە پاشان گەڕایەوە و موسڵمان بوو ئەوا حەڵاڵ نابێتەوە بۆی تا شوو بەپیاوێکی تر نەکات چونکە ئەو مارەبڕینەی حەڵاڵی کردبوو بۆی کۆتایی هاتووە)، لە: شرح الحطاب (٣/٤٧٩) دا هاتووە: (هەڵگەڕانەوەی ژن و مێرد یەکێکیان یەك تەلاقی لێکترازان (بائن)ە).

(4) لە: التاج المذهب (٢/٨) دا هاتووە: (ئەگەر ناکۆکی لەوەدا بوو کەیەکێکیان هەڵگەڕایەوە ئەوا مارەبڕیەکە هەڵدەوەشێتەوە و یەکسەر تەلاقی ژنەکەی لێکترازان(بائن) دەبێت، ئیدی چووبێتە لای یان نەچووبێتە

←

هەڵگەڕانەوەکە پێش چوونەلا بێت یاخود پاش چوونەلا، بەڵام حەنەفیەکان وتوویانە ئەگەر پێکەوە هەڵگەڕانەوەو پاشان بەیەکەوە موسڵمانبوونەوە ئەوا مارەبڕینەکەیان هەر دەمێنێت، چونکە (بنی حەنیفە) لەسەردەمی ئەبوبەکردا هەڵگەڕانەوەو پاشان موسڵمان بوونەوەو ئەویش مابڕینەکەی هێشتنەوەو فەرمانی پێنەکردن کەمارەبڕینەکەیان نوێ بکەنەوە، ئەمەش بەئامادەبوونی هاوەڵان بووەوکەسیان نکوڵی لەوە نەکردووەو کۆدەنگی بێدەنگبوون (الاجماع السکوتی) بووە[1].

ئەم بۆچوونە پێچەوانەی ئەوەیە کەئیبن حەزم (ڕەزای خوای لێبێت) وتوویەتی پێڕی هەڵگەڕاوان دوویەش بوون: بەشێکیان لەبنەڕەتدا باوەڕیان نەهێنابوو وەك هاوەڵانی موسەیلەمەو سەجاح ئەوانە جەنگاوان بوونو هەر باوەڕیان نەهێنابوو، کەس لەوەدا جیاوازی نیە کەئەوانە تەوبەکردنو موسڵمانبوونیان قبوڵ دەکرێت، بەشی دووەمیشیان: کەسانێکن موسڵمانبوونو پاش موسڵمانبوونەکەیان بێباوەڕنەبوونەتەوە بەڵام ئامادەنەبوون زەکات بەئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێبێت) بدەن لەسەر ئەوە کوژران[2]، لەبەر ئەوە حەنەفیەکان لەمەدا هیچ بەڵگەیەکیان نیە.

**ب.** شافعی[3] و جەعفەری[4]و، حەنبەلیەکان لەیەکێك لەدوو گێڕانەوەکەی ئیمام ئەحمەددا[1] وتوویانە: هەڵگەڕانەوەی ژنو مێرد یەکێکیان یاخود هەردووکیان پێش

---

لای، ئیمام (سەلامی خوای لێبێت) وتوویەتی: ئەوەیە مەبەستمان لەو وتەیەمان مارەبڕینەکە هەڵدەگیرێت بە جیابوونەوەی ئاینی هەردوولا وانە جیاوازی ئاینی ژنو مێرد.

(1) الاختیار لتعلیل المختار ٣ / ١٦٣.

(2) المحلی ١١ / ١٩٣.

(3) لە: المهذب (٢ / ٥٤)دا هاتووە:(ئەگەر ژنو مێرد یەکێکیان یاخود هەردووکیان هەڵگەڕانەوە: ئەگەر پێش چوونەلا بوو ئەوا جیاکردنەوە ڕوودەدات، ئەگەر پاش چوونەلا بوو ئەوا پاش کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانی جیاکردنەوە ڕوودەدات، ئەگەر پێش کۆتایهاتنی ماوەکە لەسەر موسڵمانێتی بەیەك گەیشتنەوە ئەوا مارەبڕینەکەیان ماوە.

(4) لە: شرائع الاسلام (٣ / ١٠٦) دا هاتووە:(ئەگەر موسڵمان بوو پاشان هەڵگەڕایەوەو ماوەی چاوەڕوانی لەکاتی موسڵمانبوونیەوە تا بێباوەڕبوونی تەواو بوو ئەوا هەڵوەشاندنەوەکە لەکاتی موسڵمانێتیەکەیەوە ←

چوونەلا ئەوا دەستبەجێ جیاکردنەوەی لێدەکەوێتەوە، بەڵام پاش چوونەلا ئەوا پەیوەندییەکی هاوسەرێتیی کۆتایی پێهاتوو دانانرێت تا ئەو کاتەی ماوەی چاوەڕوانیەکە کۆتایی دێتو هەڵگەڕاوەکەش لەسەر هەڵگەڕانەوەی بەردەوام بێت، لەسەر ئەو بنەمایە ئەگەر هاتەوە بۆلای ئیسلام پێش کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانی ئەوا هاوسەرێتیان بەردەوام دەبێت بەبێ پێویستبوون بەنوێکردنەوەی هاوسەرگیری، بەڵام زانایانی جەعفەری بەشێوەیەکی وا درێژ باسیان لێکردووە کەلەهیچ مەزهەبێکی دیکەی ئیسلامیدا نەمبینیوە، ئەویش جیاوازیکردنە لەنێوان ئەو هەڵگەڕاوەی کەبەسروشتی خۆی موسڵمان بووە، وەك ئەوەی لەدایكو باوکێکی موسڵمان بووبێتو بەموسڵمانێتی لەدایك بووبێتو بەموسڵمانێتی پەروەردە بووبێت، پاشان هەڵگەڕابێتەوە لەکاتێکدا باڵغو عاقڵو سەرپشك بێت لەگەڵ هەڵگەڕاوەیەك کەپێشتر موسڵمان نەبووەو دواتر باوەڕی هێناوە، زانیانی جەعفەری توندن بەرانبەر ئەو هەڵگەڕاوەی بەسروشتی موسڵمان بووەو وتوویانە: ئەگەر هەڵگەڕایەوە ئەوا مارەبڕینەکەیان دەستبەجێ هەڵدەوەشێتەوە با پاش چوونەلاش بێت، چونکە گەڕانەوەی بۆ ناو ئیسلام قبوڵ ناکرێتو جیاوازیکردن لەنێوان حاڵەتی چوونەلاو نەچوونەلا بۆ ئەو هەڵگەڕاوەیە کەلەناموسڵمانێتیەوە هاتۆتە ناو ئیسلام[2].

---

دەبێتو ئەگەر لەکاتی ماوەی چاوەڕوانیەکەدا موسڵمان بوو ئەوا لەکاتی موسڵمانبوونەکەدا هەڵناوەشێنرێتەوەو ماوەی چاوەڕوانیەکە لەکاتی هەڵگەڕانەوەکەوە بۆی ئەژمار دەکرێت، ئەگەر گەڕایەوە بۆ لای ئەوا ڕەواترە بۆی ئەگەرنا لەکاتی هەڵگەڕانەوەکەیەوە جیابووەوە لێی.

[1] لە: المغني (٦ / ٦٣٩) دا هاتووە: ئەحمەد لەگێڕانەوەی منصوردا وتوویەتی ئەگەر بەیەکەوە هەڵگەڕانەوە یاخود یەکێکیان هەڵگەڕایەوە پاشان تەوبەیان کرد ئەوا لەپێشترە بۆی کە ماوەی چاوەڕوانیەکەی کۆتایی نەهاتبێت) تێبینی ئەوە دەکرێت ئەگەر هەڵگەڕانەوەکە پاش چوونەلا بوو.

[2] لە: شرائع الاسلام (٢ / ٢٥٩)دا هاتووە: (ئەو هەڵگەڕاوەی پاش موسڵمانبوون بێباوەڕ دەبێت دوو بەشن: یەکەم- ئەو کەسەی بەموسڵمانێتی لەدایك دەبێت، ئەمەیان موسڵمانبوونەوەی قبوڵ ناکرێت، ئەگەر بشگەڕێتەوە هەر دەبێت بکوژرێتو ژنەکەشی لێ جیادەکرێتەوە...بەشی دووەمیان: ئەو کەسەی پێشتر بێباوەڕ بوویتو دواتر موسڵمان ببێت دوای ئەوە هەڵبگەڕێتەوە ئەمەیان تەوبەی پێدەکرێت، ←

سەرچاوەی ئەم ناکۆکیەی زانایان لەوەدایە کەبەهۆی هەڵگەڕانەوەی ژنو مێرد یەکێکیانەوە یاخود هەردووکیانەوە دێتە ئارا، ئەویش جیاوازیانە لەراڤەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلاَ تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لاَ هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلاَ هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُمْ مَا أَنفَقُوا وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلاَ تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ... الاية...[1]).

ج- ئامادەنەبوونی ژنو مێرد یەکێکیان بەموسڵمان نەبوون پاش موسڵمانبونی ئەویتریان:

موسڵمانبوونی ژنو مێرد یەکێکیان یاخود هەردووکیان ئەم حوکمانەی لێدەکەوێتەوە کەپەیوەستە بەپەیوەندیٚ هاوسەرێتیانەوە، هەیانە هاودەنگی لەسەرەو هەیانە ناکۆکی لەسەرە:

**ئەو حوکمانەی هاودەنگی لەسەرە:**

١- ناکۆکی نیە لەوەدا ئەگەر ژنو مێردەکە هەردووکیان ناموسڵمان بووبنو پێکەوە موسڵمانبووبنو لەسەر هاوسەرگیرێتی پێشوویان مابوونەوە ئەگەر هیچ رێگریەك لەرێگریەکانی هاوسەرگیری نەبوو وەك رەچەڵەكو شیرپێدان، ئەگەر پێشتر

---

ئەگەر ئامادەنەبوو ئەوا دەکوژرێت و تەوبە پێکردنی واجبەو، گرێبەندی نێوان ئەوو هاوسەرەکەی هەڵدەوەشێتەوەو مارەبرینەکەیان لەسەر کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەی رادەوەستێتو ئەوەش وەك ماوەی چاوەڕوانی تەڵاقدراوە).

[1] (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُمْ مَا أَنْفَقُوا وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنْكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنْفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنْفَقُوا ذَلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ)(الممتحنة: ١٠). بۆ ئاگاداربوون لەجیاوازی بۆچوونی زانایان لەراڤەی ئەم ئایەتەدا بڕوانە تەفسیری قورتبی(الجامع لاحكام القران لابي عبد الله محمد بن احمد الانصاري القرطبي ١٨ / ٦٠-٦٨).

گرێبەنـدی هاوسـەرێتیان بـەبێ بـەخێوکار (ولی)و شـایەت ئەنجامـدرابوو ئـەوا هاوسـەرێتیەکەیان دەمێنێتـەوە، چـونکە لەسـەردەمی پەیامـدا کەسـانێکی زۆر موسـڵمانبون و پێغەمبـەریش(ﷺ) بڕیـاری لەسـەر مارەبڕینەکەیانـداو پرسـیاری لێدەکردن لەبارەی ئەو مەرجانەوە.

٢- ناکۆکی نیە لـەنێوان زانایـان -جگـە لەزەیدیـەکان[١]- لـەوەدا لەپـەیڕەوانی ئاینـە ئاسمانیـەکان بـوون وەك مەسـیحی و جولەکـە ئـەوا هاوسـەرگیرێتیەکەیان بەبەردەوام دادەنرێت ئەگەر مێردەکە موسـڵمانبوو ژنەکـەش لەسـەر ئاینەکـەی خۆی مایەوە، چونکە موسڵمان بۆی هەیە ژنی پـەیڕەوی ئـاینێکی ئاسمـانی تـر بهێنێـت ئەوەشی لەسەرەتاوە دروست بێت ئەوا مانەوەشی دروستە.

٣- ناکۆکی لەوەدا نیە ئەگـەر بەتـەنها ژنەکـە موسـڵمانبوو، مێردەکـە پـاش ئـەوەی موسڵمانبوونی خرایە بەردەم و رازی نەبوو ئەوا لێـك جیادەکرێنـەوە، لەبـەر ئـەم فەرمایشتەی خوای گـەورە: (يَاأَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا إِذَا جَـاءَكُمْ الْمُؤْمِنَـاتُ مُهَـاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ......).

٤- نـاکۆکی لـەوەدا نیـە ئەگـەر بەیەکـەوە موسـڵمانبوون و لەنێوانیانـدا رێگریـەك لەرێگریەکانی هاوسەرگیری بەپێی پێوەری شەریعەتی ئیسلام هـەبوو ئـەوا لێـك جیادەکرێنەوە.

---

[١] هەنـدێك لـەزانایانی زەیـدی وایـدەبینن کـە هاوسـەرگیری تـەنها بەموسـڵمانبوونی ژن و مێـرد یـەکێکیان هەڵدەوەشێتەوە، ئیـدی ئـەوە پـێش چوونەلا یـاخود پـاش چوونەلا بێـت لەبـەر ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبەر (ﷺ): (لا نكاح بين اهل ملتين) واتە: مـارەبڕین لـەنێوان پـەیڕەوانی دوو ئاینـدا نیـە، بڕوانـە: البحر الزخار ٢/٧٢.

جگە لەوانە ناکۆکیان هەیە لەسەری بەم شێوەیە:

شافعیەکان[1] و، جەعفەری[2] و، حەنبەلیەکان تەنها لەگێڕانەویەکی ئەحمەددا[3] نەبێت وتوویانە: ژن و مێردەکە یان ئەوەتا هەردووکیان ئەهلی کیتاب بن یاخود نا، بۆ هەریەکەشیان حوکمی تایبەت بەخۆی هەیە:

١- ئەگەر ژن و مێردەکە هەردووکیان ئەهلی کیتاب بن یاخود ژنەکە ئەهلی کیتاب بوو:

أ- ئەگەر تەنها مێردەکە موسڵمان بوو ژنەکەی موسڵمان نەبوو ئەوا هاوسەرێتیەکەیان بەردەوام دەبێت، ئیدی ئەوە پێش چوونە لابێت یاخود پاش چوونەلا، ئەگەر هاتوو رێگریەك لەرێگریەکانی هاوسەرێتی لەنێوانیاندا لەئارادا نەبوو.

ب- ئەگەر تەنها ژنەکەی موسڵمان بوو ئەوا دەستبەجێ جیادەکرێنەوە لەکاتێکدا چوونەلا روونەدابوو، پاش کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەیان دەکەوێت ئەگەر هاتوو چوونەلا روویدابوو، موسڵمان بوونەکەش پاش چوونەلا بوو، ئەگەر مێردەکە لەماوەی چاوەڕوانیدا موسڵمانبوو ئەوا هاوسەرێتیەکەیان بەردەوام دەبێت لەکاتێکدا رێگریەك لەرێگریە شەرعیەکان لەئارادا نەبوو.

---

(١) المهذب ٢ / ٥٢.

(٢) بڕوانە: ایضاح الفوائد ٣ / ١٠٥، شرائع الاسلام ٢ / ١٩.

(٣) لە: المغني (٦ / ٦١٤)دا هاتووە: ئەگەر ژن و مێردێك كەلەپەیڕەوانی کتێبە ئاسمانیەکان نەبوون یاخود مێردەکە لەپەیڕەوی ئاینی ئاسمانی بوو ژنەکە لەپەیڕەوی ئاینی ئاسمانی نەبوو یەکێکیان پێش چوونەلا موسڵمان بوو ئەوا جیاکردنەوە دەستبەجێ روودەداتو ئەوەش هەڵوەشاندنەوەیە نەك تەلاق، ئیمام ئەحمەد لەمبارەیەوە گێڕانەوەیەکی هەیە جیاکردنەوەکە رادەگیرێت تاکۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانی (واتە وەك ئەو حاڵەتەی یەکێکیان پاش چونەلا موسڵمان بوویێت).

٢–ئەگەر لەپەیڕەوانی ئاینە ئاسمانیەکان نەبوون و یەکێکیان پێش ئەوی دیکەیان موسڵمان بوو:

أ– ئەگەر موسڵمان بوونەکە پێش چوونەلا بوو ئەوا دەستبەجێ جیادەکرێنەوە.

ب– ئەگەر پاش چوونەلا بوو ئەوا جیاناکرێنەوە لەکاتێکدا ماوەیەك کەهێندەی ماوەی چاوەڕوانی بێت تێنەپەڕیبوو لەگەڵ سووربوونی لایەکەی تر کەناموسڵمانە لەسەر رازینەبوونی بەموسڵمانبوون.

بەڵکو وتوویانە پێش چوونەلا لەهەموو شێوازەکانیدا دەستبەجێ جیادەکرێنەوە، چونکە هاوسەرگیری پێش چوونەلا تەواو دڵنیا نیە (غیر متاکد) بەپێچەوانەی پاش چوونەلاوە.

حەنەفیەکان جیاوازیان کردووە لەنێوان خانەی ئیسلام(دار الأسلام)و خانەی جەنگ(دار الحرب):

أ– ئەگەر موسڵمانبوو ژن و مێرد یەکێکیان لە خانەی ئیسلامدا بوو:

١– ئەگەر ژنەکە موسڵمانبوو ئەوا موسڵمانبوون دەخرێتە بەردەم مێردەکە ئەگەر موسڵمانبوو ئەوە ژنیەتی، ئەگەر موسڵمانیش نەبوو ئەوا دادوەر لێکیان جیادەکاتەوە، جیاکردنەوە لەسەر ئامادەنەبوون بۆ موسڵمانبوون رادەوەستێت کەسەرپێچیەتی بەبێ ئیسلام کەپەرستش و گوێڕایەڵیە، جیابوونەوەش لای ئەبو حەنیفەو محمد تەڵاقە، چونکە لەسەر نارازیبوونی مێردەکە وەستاوە، لای ئەبو یوسف هەڵوەشاندنەوەیە چونکە لەسەر هۆکارێکی هاوبەش وەستاوە.

٢– ئەگەر ژن و مێردەکە کەلەپەیڕەوانی ئاینی ئاسمانی نەبوون و موسڵمان بوون: ئەگەر ژنەکە پاش ئەوەی باسی ئیسلامی بۆ کرا موسڵمانبوو ئەوا هاوسەرێتیەکەیان بەردەوام دەبێت ئەگەرنا دادوەر لێکیان جیا دەکاتەوە.

ب- ئەگەر موسڵمان بوونەکە لەخانەی جەنگ (دار الحرب)دا بوو:

١- ئەگەر هەردووکیان لەپەیرەوانی ئاینی ئاسمانی بوون یاخود ژنەکە لەپەیرەوی ئاینی ئاسمانی بوو مێردەکەی موسڵمانبوو ئەوا هاوسەرێتیەکەیان بەردەوام دەبێت ئەگەر ڕێگریەکە لەئارادا نەبوو.

٢- ئەگەر ژنەکە لەپەیرەوی ئاینی ئاسمانی نەبوو یەکێکیان موسڵمانبوو، یاخود ژنەکە لەپەیرەوی ئاینی ئاسمانی بوو موسڵمان بوو مێردەکەی موسڵمان نەبوو ئەوا لەهەردوو شێوەکەدا جیاکردنەوەکەیان لەسەر تەواوبوونی ماوەی چاوەڕوانیو موسڵمان نەبوونی ئەوی دیکەیان دەوەستێت لەو ماوەیەدا، چونکە پاش خستنە ڕووی ئیسلام بۆ لایەکەی دیکەیان کەناموسڵمانە ئەوا لێك جیا دەکرێنەوە، لەخانەی جەنگیشدا توانای ئەوە نیە موسڵمانبوونی بخرێتە بەردەم لەبەر ئەوە ماوەی چاوەڕوانی جێی دەگرێتەوە، ئیدی ئەوە پێش چوونەلا بێت یان پاش چوونەلا[1].

## مالکیەکان:

زانایانی مالیکی بەجۆرێکی تر بەدرێژی لێی دووان:

أ- ئەگەر ژنو مێردەکە لەپەیرەی ئاینی ئاسمانی نەبوون موسڵمان بوون:

١- ئەگەر پێش چوونەلا بوو: لە مالیکەوە جیاکردنەوەکە رادەگیرێت لەسەر هەڵوێستێك کەژنەکە جیا بکاتەوە، ئەگەر موسڵمان بوو ئەگەرنا ئەوا جیا دەکرێنەوە، ئەمەش هاوڕایە لەگەڵ بۆچوونی حەنەفیەکانو، ئەشهەبو ئەصبەغ لەزانایانی مالیکی وتوویانە دەستبەجێ پەیوەندی نێوانیان دەپچڕێت، ئەمەش هاوڕایە لەگەڵ شافیعیو حەنبەلیو زەیدیەکان.

---

(1) الاختيار لتعليل المختار ٣ / ١٦٠. شرح فتح القدير ٣/ ٤١٨ – ٤٢٢.

رووکاری بۆچوونەکەی مالکیەکان: موسڵمانبوونی مێرد دەبێتە رێگر لەبەردەوامی مارەبڕینی نێوانیانو جیاکردنەوە ناگرێتەوە، ئەوەی جیاکردنەوەکە پێویست دەکات بەدەمەوە نەهاتنی لایەنی بەرانبەرە، رووکاری بۆچوونەکەی ئەشهەبو ئەصبەغ: رێگری بەردەوامی مارەبڕینەکەیان بریتیە لەموسڵمانبوونی لایەکیانو موسڵمان نەبوونی ئەویتریان، ئەگەر پێش دەستپێکردن روویدا ئەوا پەیوەندی نێوانیان دەپچڕێنرێت وەك ئەوەی ژنەکە موسڵمان بووبێت یان نا.

٢- ئەگەر موسڵمانبوونی مێردەکە پاش چوونەلا بێت، مالیك وتوویەتی داوای موسڵمانبوون لەژنەکە دەکرێت ئەگەر موسڵمان بوو ئەوە باشە ئەگەرنا ئەوا مارەبڕینەکەیان هەڵدەوەشێتەوە، ئەمەش هاودەنگە لەگەڵ بۆچوونی حەنەفیەکان، لە ئیبن قاسم دەگێڕنەوە: داوا لەژنەکە دەکرێت موسڵمان ببێتو، دەرفەتی لەنێوان رۆژێك تا سێ رۆژ پێدەدرێت.

ئەشهەب وتوویەتی داوا لەژنەکە دەکرێت موسڵمان ببێت، لەحاڵەتی داوا لێکردندا هیچ دەرفەتی نادرێتێ، ئەگەر موسڵمان بوو ئەوا باشە ئەگەرنا ئەوا هیچ رێگایەکی دیکەی لەبەردەمدا نیە جگە لەجیاکردنەوە، ئەمەش لەسەر ئەو بنەمایەیە کەموسڵمانبوونی مێرد لەگەڵیدا جیاکردنەوە روونادات بەڵکو جیاکردنەوە بەحوکم پاش داوای موسڵمانبوونە لەژنەکە یاخود بەچاوپۆشی (اغفال)، لەحاڵەتی داوا لێنەکردن(اغفال) لەژنەکە ئەوا لای ئیبن قاسم ماوەی یەك مانگ دەرفەتی لەبەردەمدایەو پاش ئەوە لێك جیادەکرێنەوە، لای ئەشهەب جیاکردنەوە بەنارازیبوونیەتی لەموسڵمان بوونو تەواو بوونی ماوەی چاوەڕوانی.

بەمەش جیاوازیان کردووە لەنێوان حاڵەتی خستنە رووی موسڵمان بوون بۆ بەردەم ژنەکەو حاڵەتی نەخستنە بەردەمی ئەو داوایەو وازلێهێنانی بۆ ویستی خۆیو بژاردەی خۆی ئەگەر مەیلی لێبوو موسڵمان ئەبێتو ئەگەر مەیلیشی لێنەبوو نابێت.

ب- ئەگەر ژنەکە پێش مێردەکەی موسڵمان بوو:

١- ئەگەر موسڵمانبوونەکە پێش چونەلا بوو مێردەکەش دوای ئـەو موسـڵمان نەبوو ئەوا دەستبەجێ جیاکردنەوە روودەدات.

٢- ئەگـەر موسـڵمان بوونەکـە پـاش چـوونەلا بـوو ئـەوا ئەگـەر مێردەکـەش موسڵمان بوو لەماوەی چاوەڕوانیدا یـاخود پێکـەوە موسـڵمان بـوون ئـەوا بڕیـاری مانـەوەی هاوسـەرێتیان دەدرێـت، ئەگـەر پـاش مـاوەی چاوەڕوانیشیان موسڵمان بوو ئەوا بەکۆدەنگی لێك جیا دەکرێنەوە[1].

زیمیەکان:

جیاوازیان کردووە لەنێوان حوکمی ئەوانەی لەژێر حـوکمی ئیسـلامدان (الـذمیین)و ئەوانەی لەخانەی جەنگ (دار الحرب)دان، بەمشێوەیە:

أ- ئەگەر هەردووکیان جەنگی (حربی)و یەکێکیان موسڵمان بوو:

١- پێش چوونەلا تەنها بەموسڵمان بـوونی ژنەکـە یـان مێردەکـە جیاکردنـەوە دەبێت.

٢- چاش چـوونەلا بـەجیاوازی ئـاین لەگـەڵ تـەواو بـوونی مـاوەی چـاوەڕوانی جیادەبنەوە.

ب- ئەگەر هەردووکیان زمی بوونو یەکێکیان موسڵمان بوو: بەیەکێك لەم دوو کارە تەڵاقەکە دەکەوێت:

١- بەتێپەڕبوونی ماوەیەك هاوتای ماوەی چاوەڕوانی بێـت ئیـدی چـووبێتەلای یاخود نەچووبێتە لای ئەگەر لەو ماوەیەدا لایەنی بەرانبەر موسڵمان نەبوو.

٢- یان داوای موسڵمان بوون لەوەیان دەکرێت کەموسڵمان نەبووە ئەگەر رازی نەبوو ئەوا بەو رازی نەبووە جیاکردنەوە روودەدات با ماوەی چـاوەڕوانیش

---

[1] بڕوانە: المنتقى شرح الموطا ٣/٣٤٦. الشرح الصغير مع الصاوي ١/٣٧٧ - ٣٧٨.

تەواو نەبوویێت[1].

وایدەبینم تێگەیشتوانەترینیان ئەوەیانە کەحەنەفیەکان بۆی چوون لەبەر ئەمانە:

١- جیاوازیکردن لەنێوان حوکمی ئەوەی چوونەلا تێیدا روویداوەو ئەوەی چوونەلای تێدا نیە بۆچوونێکی ئیجتیهادی رووتەو هیچ دەقو پێوانەیەك پشتگیری ناکات.

٢- جیاکردنەوە وەك سزا وایە لەسەر سەرپێچی، ئەمەش لەسەر موسڵمان بوونی ژنو مێرد یەکێکیان دروست نابێت، بەڵکو لەسەر نارازیبوونی لایەکەی تر دروست دەبێت پاش ئەوەی دەخرێتە بەردەمیو رەتی دەکاتەوە، چونکە داوای موسڵمان بوون هاوسەرەکەی تر رەگەزێکە پێویستە هەبێت ئەگەر توانرا.

٣- دانانی تێپەڕبوونی ماوەی چاوەڕوانی –لەحاڵەتی نەتوانینی داوای موسڵمان بوون لێی– نیشانە(قرینە)یەکە لەبری داوای موسڵمان بوونەکە تا بەراشکاری ئەوە دەربخات کەرازی نیە.

٤- بۆ سەلماندنی موسڵمان بوونی ژنو مێرد یەکێکیانو دڵنیابوون لەئامادەنەبوونی ئەوەی بەرانبەر پێویستە جیاکردنەوەکە بەبڕیاری دادگا بێت.

٥- دانانی جیاکردنەوە لەدادگا کەلەسەر بنەمای نارازیبوون بێت پاش داوای موسڵمان بوون لێی بەتەڵاق ئەگەر هاتوو نارازییەکە مێردەکە بوو، بەهەڵوەشاندنەوە دابنرێت ئەگەر هاتوو نارازییەکە ژنەکە بوو، وەك ئەوەی ئەبو حەنیفەو محمد رەحمەتی خوایان لێبێت بۆی چوون: جیاوازیکردنێکی وردە لەقوڵی تێگەیشتنی ئەو دوو زانا مەزنەوە سەرچاوەی گرتووە.

---

[1] التاج المذهب ٢ / ٨٠ – ٨١. البحر الزخار ٣/٧٢.

## چوارەم – دەستدرێژی ژن و مێرد یەکێکیان بۆ سەر ئەویتریان (اعتداء احد الزوجين على الاخر):

سەرچاوەی چوارەمی زیانی خۆویستانە بریتیە لەناکۆکیو دەستدرێژی ژنو مێرد یەکێکیان بۆسەر ئەویتریان بەکردار وەك لێدان یاخود قسە وەك جنێو یان بەهەردووکیان وەك سوکایەتی...

بۆ هەلگرتنی ئەو زیانەی بەهۆی بەهەڵە تێگەیشتنو بەیەکداپڕژانو ناکۆکی دێتە ئاراو لەپێناوی دوورخستنەوەی بەردەوامی ئەوەو، تا رێگری لەدەرئەنجامە خراپەکانی لەسەر ژنو مێردو منداڵەکان بەراستەوخۆو لەسەر کۆمەڵگاش وەك هۆکار بکرێت، قورئان فەرمانی کردووە بەدەستنیشانکردنی ناوبژیوانی هاوبەش، ناوبژیوانێك لەکەسو کاری ژنەکەو ناوبژیوانێك لەکەسو کاری مێردەکە خوای گەورە دەفەرموێت: (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِنْ يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقْ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا)[1].

پێشتر ئەوەمان روونکردەوە کەپەیوەندارە بەو مەرجانەی کەپێویستە لەدوو ناوبژیوانەکەدا هەبێت، ئەوەی لێرەدا گرنگە بۆمان بریتیە لە رادەی دەسەڵاتیان لەجیاکردنەوەی ژنو مێردەکە لەحاڵەتێکدا بواری چاکسازی نەبوو، وەك لێرەدا لێی دەدوێین:

١- راجیایی نیە لەنێوان زانایانی شەریعەت لەدروستی ناردنی دوو ناوبژیوان بۆلای ژنو مێردەکە ئەگەر ناکۆکی لەنێوانیاندا دروست بوو دیار نەبوو هۆیەکەی چیەو نەدەزانرا هۆکارەکەی چیەو کێ کەمتەرخەمە، ئەمەش لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا.....).

---

[1] سورة النساء: ٣٥.

٢- راجیایی نیە لەوەدا کەدوو ناوبژیوانەکە دەبێت لەکەس‌وکاری ژن‌و مێردەکە بن ئەگەر لەتوانادا هەبوو، یەکێکیان خزمی ژنەکەو یەکێکیان خزمی مێردەکە، ئەمەش بەمەبەستی پاراستنی نهێنیەکانی خێزانەکە لەلایەکو، لەپێناوی ئەوەی سوورین لەسەر چاکسازی بەهۆی ئەو خزمایەتیەی هەیانە لەلایەکی تر.

٣- راجیایی نیە کەهەردوو ناوبژیوانەکە ئەگەر بیروڕایان جیا بوو لەوەی پێی گەیشتوون دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەیان لەباری حاڵی ژن‌و مێردەکە پێی گەیشتوون ئەوا جێبەجێ ناکرێت‌و دەگۆڕدرێن بەدوو ناوبژیوانی تر، یاخود ناوبژیوانی سێیەمیان بۆ زیاد دەکرێت.

بەڵکو جیا رایی لەرادەی دەستەڵاتی دوو ناوبژیوانەکەدایە لەجیاکردنەوەدا لەسەر بنەمای ئەو ناکۆکیەی هەیە لەسروشتی ئەو دوو بەرژەوەندیەدا، ئایا خەسڵەتی ناوبژیوانیان بەمانا شەرعیە راستەقینەکەی ئەو دەستەواژەیە هەیە؟، لەو کاتەداٌ مافی جیاکردنەوەیان هەیە ئەگەرهاتوو هەوڵی چاکسازی بێ ئاکام بوو، یان ئەوەتا بریکارن‌و لەسەریان پێویستە پابەند بن‌و لەسنووری بریکارێتیەکەدا بجولێنەوەو جیاکردنەوەی تێدا نیە ئەگەر پێشتر مێردەکە مۆڵەتی ئەوەی نەدابێت؟

لەسۆنەگەی ئەم واقیعەوە زانایان بۆ دوو دەستە دابەش بوون: دەستەیەك لەگەڵ پێدانی دەستەڵات‌و دەستەیەك لەگەڵ رەتکردنەوەیدان.

**دەستەی یەکەم** – پێکدێت لەزانایانی مالکی‌و، زەیدی‌و، شافعی لەبۆچوونێکیداو، ئیمام ئەحمەد لەگێڕانەوەیەکیدا:

**مالکیەکان:**

وتوویانە: پێویستە لەسەر دوو ناوبژیوانەکە ئەوەندەی لەتوانایاندایە چاکسازی بکەن ئەگەر ئاکامی نەبوو بڕیار بدەن بەجیاکردنەوەو، بڕیارەکەیان بەئاشکراو ناوەکی (ظاهرا وباطنا) لەلایەن دادوەرەوە جێبەجێ دەکرێت، ئەگەر ژن‌و مێردەکەو دادوەریش پێی رازی نەبوون، یاخود ناوبژیوانەکە پێچەوانەی مەزهەبی دادوەر بوو،

مـەرج نیـە هـەمان مەزهـەبی ئـەویان هـەبێت، ئیـدی دوو ناوبژیوانەکـە لەلایـەنی ژن‌و مێردەکەوە بن یان لە لایەنی دادوەرەوە، بەلاّم لەسەریان پێویستە لەسەریان کەتەنها یەك تـەلاّق بخـەن، چـونکە ئـەم جیاکردنەوەیـە لەبـەر پێویسـتیەو پێویسـتیەکانیش بەرادەی پێویستبوونیان مەزندە دەکرێن، بەلاّم ئەوەی تەلاّقەکە بەبێ بەرانبـەر بێـت یان بەقەرەبوو (خلع) ئەوەش پەیوەستە بەو ئەنجامەی دوو ناوبژیوانەکە پێی دەگەن لەلێکۆڵینەوەی حاڵی ژن‌و مێردەکەو، زانینی بنەڕەتی ناکۆکی‌و لایـەنی کەمتەرخـەم، لەوکاتەدا ئەگەر خراپەکاریەکە لەمێردەکەوە بوو ئەوا تەلاّقەکە بەبێ قەرەبوو دەبێت، ئەگەریش خراپەکاریەکـە لەژنەکـەوە بـوو بـە قـەرەبوو دەبێـت، ئەگـەر هـەردوولایان پێکەوە خراپەیان هەبوو وەك ئەوەی هەریەکـەیان زیـانی بەبەرانبەرەکـەی دەگەیانـد لای زۆرینەی زانایانی مـالکی تەلاّقەکـە بـێ قـەرەبوو دەبێـت، مالکیـەکان وایـدەبینن کەلەسـەر دادوەر پێویسـتە بڕیارەکـەیان بەجیاکردنـەوەو تـەلاّق جێبـەجێ بکـاتو، دروست نیە بەدواداچـوونی بـۆ بکـات یـان تێهەڵچـوونەوەی بـۆ بکـات یـا پێچـەوانەی مەزهەبیشی بێت لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا...) قورئانی پیرۆز ناوی لێناون دوو ناوبژیوان[1].

## زەیدیەکان:

هەنـدێك لـەزانایانی زەیـدی وایـدەبینن کـە: لەسـەر دوو ناوبژیوانەکەیـە پـاش ڕووبەڕووبوونەوەی هەریەك لەژن‌و مێردەکە هەوڵ بـدەن بـەرازیکردنیان ئەگـەر ئـەوە نەکرا ئەوا جیاکردنەوەیان بەقەرەبوو یان جگە لەوە بەو جۆرەی کەبەباشی دەبینن[2].

---

[1] بڕوانە: المنتقى شرح الموطا ٤/ ١١٣ – ١١٥. شرح الخرشي ٤/٨–١٠. الشرح الصغير مع الصاوي ١/٤٠٨ – ٤٠٩، بداية المجتهد ٢/٨١ – ٨٢.

[2] البحر الزخار ٣/٩٠.

**شافعی لە یەکێك لە دوو بۆچوونەکەیدا:**

بۆچوونی شـافعیەکان لەخەسـڵەتی دووناوبژیوانەکـەدا جیـاوازەو دوای ئـەوەش لەدەسەڵاتیانداو لەیەکێك لەدوو بۆچوونەکەیدا وتوویەتی: ئەوا دووانە ناوبژیوانن بۆیان هەیە ئەوەی بەباشی دەزانن لەکۆکردنەوەیان یـان جیاکردنـەوەیان جێبـەجێی بکـەن بەقەرەبوو بێت یان بیٚ قەرەبوو لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (فابعثوا حكما من اهله وحكما من اهلها...).

بەجۆرێك قورئان رەزامەندی ژن‌و مێردەکەی بەبەها نەگرتووە [1].

**ئیمام ئەحمەد لە یەکێك لەدوو گێڕانەوەیدا:**

لە ئیمام ئەحمەدەوە (رەحمەتی خـوای لێبێـت) دوو گێڕانـەوە هەیـە: یـەکێکیان ئـەوە کـەدوو ناوبـژیوانن‌و، بۆیـان هەیـە ئـەوەی دەیانـەوێت لەکۆکردنـەوەیان یـان جیاکردنەوەیان بەقەرەبوو یان بیٚ قەرەبوو ئەنجامی بدەن‌و پێویستیان بە بریکارێتی ژن‌و مێردەکە یان رەزامەنـدیان نیـە، ئـەم بۆچـوونە لەعـەلی کـوڕی ئـەبوتاڵب (رەزای خـوای لێبێـت)و، ئـیبن عـەباس(رەزای خـوای لێبێـت)و، ئـەبی سـەلەمەی کـوڕی عبدالرحمن‌و، شەعبی‌و، نەخەعی‌و، سەعیدی کوڕی حەبیب‌و، ئەوزاعی‌و، ئیسحاق‌و، ئیبن مونزیر، لەبەر ئم فەرمایشتەی خوای گەورە: (فابعثوا حكما من اهله ....) [2].

وادیارە کـە گـرنگترین بەڵگەیـەك بـۆ ئـەم بۆچـوونە پشـتیان پـیٚ بەسـتبێت ئـەم ئایەتـەی قورئـانی پـیرۆزە کەبـەو جـۆرەی لەگـەڵ ئیجتیهادیانـدا بگونجێـت راڤـەیان کردووە بەوە دوو ناوبژیوانن نەك دوو بریکارو دەستەڵاتی چاکسازی‌و جیاکردنەوەیان هەیە لەهەمان کاتدا.

---

[1] المهذب ٢/ ٧٠، المغنی لابن قدامة ٤٩/٧.

[2] (وان خفتم شقاق بينهما فابعثوا حكما من اهله وحكما من اهلها ان يريدا اصلاحا يوفق الله بينهما ان الله كان عليما خبيرا)(النساء: ٣٥). المغني لابن قدامة ٤٩/٧.

**دەستەی دووەم–** وتوویانە: دوو ناوبژیوانەکە بریکارن‌و تەنها دەستەڵاتی چاکساز یاخود پێشکەشکردنی راپۆرتێك بەدادوەریان هەیە کەتێدا ئەو دەرئەنجامە هەبێت کەپێی گەیشتوون لەبارەی حاڵی ژن‌و مێردەکەوە، هەروەها مافی راسپێری (توصیه)یان سەبارەت بەمانەوەیان بەیەکەوەو بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتیان پاش چارەسەری کێشەکان یان پێشنیارکردنی تەڵاقیان بۆ ژن‌ومێردەکە هەیە، خۆ ئەگەر ملی نەدا ئەوا لەلایەن دادوەرەوە جیا دەکرێنەوە بەپێی بۆچوونی ئەوانەی وایدەبینن کەدادوەر دەستەڵاتی ئەوەی هەیە، هەریەك لەزانایانی حەنەفی‌و جەعفەری‌و، زاهری‌و، شافعی لەیەکێك لە دوو بۆچوونەکەیداو، ئیمامی ئەحمەد لەیەکێك لەدوو ریواتەکەیدا ئەم ئاراستەیەیان گرتووەو وایان وتووە، هەروەك بەدرێژی دەیخەینە روو:

**حەنەفیەکان:**

جەصاص وتوویەتی: دوو ناوبژیوانەکە لای ئەبو حەنیفەو، هاوەڵانی بریکارن، یەکێکیان بریکاری مێردەکەیەو، ئەویتریان بریکاری ژنەکەیە، بەبەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (ان یریدا اصلاحا یوفق الله بینهما) نەیوتووە ئەگەر ویستیان جیا ببنەوە[1].

**جەعفەریەکان:**

زانایانی جەعفەری وتوویانە: دوو ناوبژیوانەکە بریکارن دەستەڵاتی جیاکردنەوەیان نیە، بەڵکو کارەکەیان تەنها هەوڵی چاکسازییە، پاشان پێشکەشکردنی راپۆرتێك بەدادوەر ئەگەر هەوڵی چاکسازی بێ ئاکام بوو، ئەگەر لەلایەن ژن‌و مێردەکەوە دەسەڵاتی تەڵاقدان (یان جیاکردنەوە)یان پێ نەدرابێت ئەوا ئەوەیان بۆ نیە[2].

---

[1] احکام القران للجصاص ۲/۱۵۱– ۱۵٤.

[2] شرائع الاسلام ۲/٤۲، المختصر النافع ص ۲۷۱.

**زاهریەکان:**

ئـیبن حـەزمی زاهـری (رەحمـەتی خـوای لێبێـت) وتوویـەتی: نەلـەو ئایەتـەدا نەلەسوننەتدا شتێك نیە کە دوو ناوبژیوانەکە بۆیان هەبێت جیایان بکەنەوە، ئەوە بۆ دادوەریش نیە، خوای گەورە فەرموویەتی: (وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا).

راست وایە کەدروست نیە کـەس لـەبری کـەس تـەلاق بخـاتو، ژنو مێـرد لەیـەك جیابکاتەوە مەگەر دەقێك هەبێت کەتـەنها هەڵوەشـاندنەوەی مارەبڕینەکـە پێویسـت بکاتو، قسەی هیچ کەس جگە لەفەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) نابێتە بەڵگە[1].

**شافعی لەیەکێك لەدوو بۆچوونەکەیدا:**

ئـەبو ئیسـحاقی شـیرازی (رەحمـەتی خـوای لێبێـت) وتوویـەتی: (بۆچـوونەکانی لـەبارەی دوو ناوبژیوانەکـەوە جیـاوازە، لەیـەکێك لـەدوو بۆچـوونەکەیدا دەڵێـت: ئـەو دووانە بریکارن بەمۆڵەتی ژنو مێردەکە نەبێـت ناتوانن جیایان بکەنەوە چونکە تـەڵاق بەدەست مێردەو، بـەوەش مـاڵ بـۆ ژنەکەیـە لەبـەر ئـەوە دروسـت نیـە بەمۆڵـەتیان نەبێت)[2].

**ئیمام ئەحمەد لەیەکێك لەدوو بۆچوونەکەیدا:**

ئـــیبن قودامـــە (رەحمـــەتی خـــوای لێبێـــت) وتوویـــەتی: (گێڕانـــەوەکان لەئەحمەدەوە(رەحمـەتی خـوای لێبێـت) لـەبارەی دوو ناوبژیوانەکـەوە جیـاوازن، لەیەکێك لەدوو گێڕانەوەکەدا لێیەوە ئەو دووانە بریکاریـانو بەمۆڵـەتی ژنو مێردەکـە نەبێت ناتوانن جیایان بکەنەوە)[3].

خاوەنانی ئەم بۆچوونە چەند بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە کەگرنگترینیان ئەمانەیە:

---

(1) المحلی لابن حزم ۸۸/۱۰.

(2) (المهذب)ی (ابی اسحاق الشیرازی) ۲ / ۷۰. قاربن المجموع شرح المهذب ۳۲۹/۱۵.

(3) (المعنی)ی (ابن قدامة ۷/۴۹).

١- قورئان ئەرکی دوو ناوبژیوانەکەی بەچاکسازی دیاری کردووەو دەفەرمووێت: (إِنْ يُرِيدَا إِصْلاَحًا يُوَفِّقْ اللَّهُ بَيْنَهُمَا).

٢- لەبنەڕەتدا تەڵاق تەنها بەدەست مێردە، یان ئەو کەسەی کە خۆی ئەو دەستەڵاتەی بداتێ.

٣- جیاکردنەوە دەرکردنی موڵکە لەژێردەستی خاوەنەکەی بەبێ ڕەزامەندی خاوەنەکە،ی ئەمەش دروست نیە چونکە حەڵاڵبوونی چێژ بینن لەژنەکە موڵکی مێردەکەیە، مارەیی دواخراویش موڵکی ژنەکەیەو ئەگەر هەیە بەجیاکردنەوە لەدەستی بدات ئەگەر دەرکەوت کەمتەرخەمی لەمەوەیە.

٤- لە عەلی کوڕی ئەبوتاڵب (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کە دوو ناوبژیوانی ڕەوانە کردووەو وتوویەتی: ئایا ئەزانن چیتان لەسەرە؟ ئەگەر بینیتان بەیەکەوە دەکرێت کۆ ببنەوە ئەوا کۆیان بکەنەوە، ئەگەر بینیتان جیان ئەوا جیایان بکەنەوە، ژنەکە وتوویەتی ڕازیم بەقورئانی پیرۆزو ئەوەی تێیدایە بۆ منو لەسەر من، پیاوەکە وتوویەتی بەڵام جیاکردنەوە نا، عەلی وتوویەتی سوێند بەخوا لەدەستم دەربازت نابێت تا ئەوەی ژنەکە بڕیاری لەسەردا تۆش بڕیاری لەسەر دەدەیت)[1]. وتوویانە ئەم قسانە لەنێوان عەلی کوڕی ئەبو تاڵبو ئەو مێردەدا ئەوە دەگەیەنێت کە دوو ناوبژیوانەکە بەبێ ڕەزامەندی مێردەکە ناتوانن جیایان بکەنەوە.

وایدەبینم کەهەردوو ئاراستەکە بەدەر نیە لەجۆرێك لەجۆرەکانی توندڕەوی، لەبۆچوونی یەکەمدا زیادەڕەوی هەیەو دەستەڵاتی زیاتر لەپێویست دەداتە دوو

[1] لەگێڕانەوەیەکدا: (درۆت کرد تا کتێبی خوا حوکمت بۆ بداتو بدات لەسەرت) لەیەکێکی دیکەشدا: (تا بەکتێبی خوای گەورە ڕازی بیت) بڕوانە: بداية المجتهد ٢/٨٢. احكام القران للجصاص ٣/ ١٥٢. بەڵام ئەم بەڵگەیەی کۆتایی هەروەك ئەوەی دەگونجێت ببێتە بەڵگە بۆ بۆچوونی دووەم هەروەها خاوەنانی بۆچوونی یەکەم بەهەمان شێوە دەتوانن بیکەنە بەڵگە.

ناوبژیوانەکە، لەئاراستەی دووەمیشدا کەمرەوی هەیەو لەبەهای کرداری کاری دوو ناوبژیوانەکە کەمدەکاتەوە کەقورئانی پیرۆز بڕیاری لەسەر داوە

وایدەبینم کە دوو ناوبژیوانەکە دەستەڵاتیان بەهێزترە لەدەستەڵاتی دوو بریکار، بەبەڵگەی ئەوەی قورئان ناوی ناون دوو ناوبژیوان (حکمین)و داوای کردووە جیاواز بن لەبریکاری ئاسایی بەوەی لەخزمانی ژن‌و مێرد بن، بەڵام ئەم دەستەڵاتە ئەو مافەیان نـاداتێ کـەبتوانن جیایـان بکەنـەوە بـەبێ ئـەوەی دادوەر حـوکم‌و دەسـتەڵاتی لەبابەتەکەدا هەبێت.

لەسەر ئەم بنەمایە دوو ناوبژیوانەکە بە ئەڵقەی بەیەکەوە بەستنەوەی نێوان دادگاو ئەو خێزانە دادەنرێت کەکێشەو ناکۆکی‌و نەهامەتیەکەی تێدا دروست بووە، جـا ئـەوان ئەگـەر رێککـەوتن کەچارەسـەر بریتیـە لـەکۆتای پێهێنـانی پەیوەنـدی هاوسـەرێتیان ئـەوا دادوەر پابەنـد دەبێـت کـەکار بەبۆچوونەکەیان بکـات، لەسـەری پێویستە کەپێشـنیاری تـەڵاق بکـات بـۆ مێردەکـە ئەگـەر رازی نـەبوو ئـەوا جێـی دەگرێتەوەو لێکیان جیا دەکاتەوە.

# دەروازەی سێیەم:
# هەڵوێستی یاسا لەجیاکردنەوە لەدادگا
# (موقف القانون من التفريق قضاءً)

مەبەست لەیاسا بریتیە لەیاسای باری کەسی وڵاتانی ئیسلامیی.

یاسا لەوڵاتانی عەرەبیدا کاری بە فرە هۆکاری (تعدد الاسباب) کردووەو، دەرئەنجامی کارنەکردن بەپێوەری زیان ناکۆکی (خلاف) زۆر روویدا لەسروشتی هۆکارو مەرجەکان لەیاسای ئەو وڵاتانەدا، لەم دەروازەیەدا هەوڵ دەدەم هەموو ئەو هۆکارانە بگێڕمەوە بۆ زیانی خۆویستو خۆنەویست.

## یەکەم- زیانی خۆنەویست (الضرر اللا ارادي):

مەبەست لەزیانی خۆنەویست بریتیە لەو زیانەی کە ویستی هیچ یەکێك لەژنو مێرد بەراستەوخۆ یاخود وەك هۆکار رۆڵیان نەبێت لەدروستبوونیدا، وەك نەخۆشی زاوزێ (امراض التناسلية)و نازاوزێ (غير التناسلية)و ئەو نەخۆشیە جەستەییانەی درێژخایەن (المعدية)و بێزراوەکان (المنفرة)، یاخود نەخۆشینە عەقڵیەکانو، یان درم(عاهە)ێکی گواستراوە (مستديم)و هی تری هەبێت کەئەگەری چاکبوونەوەیان نیەو ناتوانرێت ژیانی هاوسەرێتی لەگەڵیدا بەو جۆرە کەزیانی دەبێت بۆی بەردەوام بێت، یاسای وڵاتانی ئیسلامی-ئەوانەی من بینیومن- یەکدەنگن لەسەر دروستی جیاکردنەوەیان لەدادگا لەکاتی سەلماندنی نەخۆشیەك لەو نەخۆشینانە پاش ئەوەی مەرجە پێویستەکانی تێدا هاتەدی، وەك عێراقی(م ٤٣/٤-٦)و، ئوردنی مادەکانی(١١٣ – ١٢٢)و، سوری مادەکانی(١٠٥ – ١٠٨)و، میسری مادەکانی(٩ – ١١) و، مەغریبی(ف : ٥٤ –٥٥).

**بەلام وەك يەك نين، هەورەك لەم دڕێژەيەدا دەيخەينە روو:**

١- مافى داواى جياكردنەوە بۆ ژنەكە چەسپاوەو بۆ مێرد نيە -چونكە تـەلاقى بەدەسـتە- وەك عێراقـى(م ٤٣)و، ميسـرى (م٩)و، سـورى (م ١٠٥)و كاريـان بەمەزهەبى حەنەفى كردووە، لەياسـاى ولاتـانى ئـوردن (م ١١٣، م ١١٧)و، مـەغريبى (ف - ٥٤) مێرديش ئەو مافەى هەيە.

ئاراسـتەى دووەم تێگەيشـتوانەترە چـونكە لەگـەڵ بۆچـوونى كۆمـەڵى زانايـانى موسڵماندا يەكدەگرێتەوەو، دادپەروەرىو يەكسانى دێنێتە دى لەو شوێنەوارە ئەرێنى (ايجابى)و نەرێنى (سلبى)يانەى دەكەوێتە سەر مێرد، شايانى باسـە جياوازيـەكى زۆر هەيە لەنێوان تەلاقو جياكردنەوە (تفريق)دا لـەرووى شـوێنەوارەوە چـونكە لەتەلاقـدا مێرد پابەندە بەدانەوەى مافە دواخراوەكانى ژنەكەىو با خراپەكاريەكەش لەژنەكـەوە بێت بەپێچەوانەى جياكردنەوەوە كەپابەند نابێت پێيـەوە ئەگـەرهاتوو ژنەكـە هۆكـار بوو.

٢- لەحاڵەتى ئاگاداربوونى زيان لێكەوتوو بەخەوش (عيب) (سەرچاوەى زيانەكە) پێش ئەنجامدانى گرێبەندى هاوسەرێتـى ياخود پاش ئەوە بـەلام بەراشـكاوى يـاخود ئامارە (ضمنا) ئەوا مافى داواى جياكردنەوە لەدەست دەدات، لەياساى ئوردنى تەنها لە شلەپەتك (العنة) نەبێت (م ١١٤)، سورى (م ١٠٦)، ميسرى (م ٩)، مـەغريبى (ف- ٥٤/ ١) بـەلام عێراقـى لـە (م ٤٣/٤-٦)دەقەكـە بـەرەهايى هـاتووە، رەهـاش كـار بەرەهايەتيەكەى دەكرێت ئەگەر بەڵگەيەك نەبێت لەسەر كۆت كردنىو بەڵگەش نيە.

وايدەبينم ياسادانەرى عێراقى پێكاويەتى چونكەبيانو (علە)ى حوكمەكە بريتيە لەو زيانەى كەلەتوانا بەدەرە ئيدى پێش گرێبەندەكە پێى زانرابێـت يـاخود پـاش ئـەوە، زيـان لێكـەوتوو لەماوەيەكـدا پێـى رازى بووبێـت يـاخود نـا، پاشـان دروسـت نيـە ناچاركردنى زيان لێكەوتوو لەسـەر ئـارامگرتن بەدرێـژايى ژيـان لەبـەر ئـەوەى رۆژێك لەرۆژان ئەو زيانەى قبوڵ كردووە، رێساى ئوصـوليش وادەخوازێـت كـەحوكم لەگـەڵ

بیانو (علە)کەیدا بەبوون‌و نەبوونِ بسوڕێتەوە، لەبەر ئەوە پێشنیار دەکەم یاسای وڵاتانی ئیسلامیش هەمان شێوە پەیڕەو بکەن.

٣- ئوردنی (م ١١٣) کردویەتیە مەرج کەداواکاری جیابوونەوە تووشی هەمان نەخۆشی بووبێت یاخود بەوەی کەنزیك بێت لەو نەخۆشیە لەرووی زیانەوە ئەگەرنا ئەوا ئەو مافەی نامێنێت کەداوای جیابوونەوە بکات، ژنێك بەهۆی بوونی گرێ یاخود ئێسك لەشەرمگەیدا (الرتقاء او القرناء) بۆی نیە داوای جیاکردنەوە بکات لەبەر شلەپەتك(عنە)ی مێردەکەی‌و هەمان شت وتراوە سەبارەت بەنەخۆشینەکانی تر.

پێشنیار دەکەم ئەو مەرجە فەرامۆش بکرێت چونکە بەرهەمی ژیانی هاوسەرێتی دیار نیە بەهۆی نەخۆشی یەکێکیانەوە ئیدی ئەویتریان هەمان نەخۆشینی هەبێت یاخود هاوشێوەی ئەو نەخۆشینەی هەبێت یاخود نەیبێت ئەگەر ئومێدی چاکبوونەوەی‌و ئارامگرتن لەسەر نەخۆشینەکە نەبوو.

٤- بەپێی تێڕوانینی یاسادانەری ئوردنی(م ١١٧، م١١٨) جیاکردنەوە نابێت ئەگەر نەخۆشینەکە پاش چونە لا تووشی بوو با بۆ تەنها یەکجاریش چووبێتەلای ئیدی ئەو زیان لێکەوتووە رازی بێت یاخود نا، ئەم بۆچوونەش هەرچەندە هەندێك لەزانایان -وەك حەنەفیەکان- وتوویانە بەڵام پێچەوانەیە لەگەڵ ڕێسا گشتیەکان لەشەریعەتی ئیسلامیدا، لەوانە: (لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا)و (وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ)و، (لا ضرر ولا ضرار) لەبەر ئەوە پێشنیار دەکەم فەرامۆش بکرێت.

٥- یاسادانەری سوری(م ١٠٥ / ٢) لەنەخۆشینە نازاوزێیەکان تەنها شێتی لەخۆگرتووە کە ئەگەر پاش گرێبەند روویدا، ئەم دیاری کردنە یەکناگرێتەوە لەگەڵ ڕێسا گشتیە ئیسلامیەکاندا کەفەرمان دەکات بەلادانی زیان ئیتر سەرچاوەکەی هەرچی بێت ئەگەرهاتوو زیانلێکەوتوو بەراشکاوی یاخود ناراشکاوی (ضمنا) پێی رازی نەبوو بەشێوەیەکی بەردەوام، تێبینی ئەوە دەکرێت ئەو یاسایانەی باسکران لەمانەدا هاودەنگن:

أ- دانانی جیاکردنەوە بەهۆی زیانی خۆنەویستیی (اللا ارادي)یەوە بەتەلاقی لێکترازان (طلقة بائنة).

ب- دواخستنی جیاکردنەوەکە بۆ ساڵێك لەهەموو هۆکارێکدا کەئەگەری چاکبوونەوەی هەبێت.

هەروەها حوکمەکەش لەگەڵ رۆحی شەریعەتی ئیسلامیو دادپەروەریدا دەگونجێت.

**دووەم- زیانی خۆویست (الضرر الارادي):**

زیان بەخۆویست دادەنرێت ئەگەر هاتوو ویستی ژنو مێرد یەکێکیان رۆڵی هەبوو لەرووداني -راستەوخۆ یان هۆکار-، دەکرێت سەرچاوەی ئەمجۆرە زیانە بگێڕینەوە بۆ ئەمانە:

أ-بێبەشکردنی ژن لەبژێوی.

ب- بێبەشکردنی ژن لەسەرجێی (المعاشرة).

ج- دەستدرێژی یەکێکیان بۆسەر ئەویتریان.

د- یەکێکیان سەرپێچیەك (معصية) ئەنجام بدات کەزیانی بۆ ئەویتریان هەبێت.

لێرەوە هەڵوێستی یاسا لەم حاڵەتانە روون دەکەینەوە:

**أ- بێبەشکردن لەبژێوی (الحرمان من النفقه):**

مافی ژنە لەدادگا داوای جیاکردنەوە بکات ئەگەر بەهۆی بێبەشکردنی لەبژێوی زیانی پێگەیشت، یاسای: عێراقی(م ٤٣ / ٧، ٨، ٩)، ئوردنی لەمادەکانی(١٢٧ – ١٣٠)، سوری لەمادەکانی(١١٠ – ١١١)، میسری لەمادەکانی(٤-٦)، مەغریبی(ف – ٥٣)، تونسی (ف – ٣٨ – ٤٠)، یاسادانەری کوەیتی لەمادەکانی(١٠٨ – ١٠٩) بڕیاریان لێداوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم یاسایانە لەم حوکمانەدا جیاوازن:

١- بەتەنها یاسای عێراقی (م٤٥)جیاکردنەوەی بەتەڵاقێکی لێکترازان(بائن) داناوە بەپێچەوانەی هەموو یاساکانەوە کەبەتەڵاقی گەڕانەوەیی (رجعی) داناوە: ئوردنی(م ١٢٨)، سوری(م ١١١)، میسری (م ٦)، مەغریبی(ف – ٢/٥٣)، کوەیتی(م ١٠٩).

پێشنیار دەکەم یاسای عێراقیش بەهەمان شێوەی ئەوان بڕیار بدات لەپێناوی پاڵپشتی بەردەوامی خێزانو چاودێری بەرژەوەندی مناڵەکانیان ئەگەر هەبوو، زۆرجار ئەو مێردەی بەئەنقەست بژێوی نەکێشاوە هەست بەنیگەرانی دەکات، یان ئەوەتا لەپاش تەڵاقەکەو لەکاتی ماوەی چاوەڕوانیدا خوا بەرەکەت دەرێژێت بەسەر ئەو مێردەدا کەتوانای بژێوی کێشانی نیە، پێدانی دەرفەت بۆ گەڕانەوە لەپێشترە لەداخستنی دەروازە بەرووی دەستپێکردنەوەی ژیانی هاوسەرێتیدا لەگەڵ بەڵێندان کەبەردەوام بێت لەبژێوی کێشانی.

٢- یاسادانەری تونسی(ف-٣٩) بەپێچەوانەی یاساکانی دیکەوە کردویەتیە مەرج کەژنەکە ئاگاداری نەداری مێردەکەی نەبێت لەکاتی گرێبەندەکەدا ئەگەرنا مافی داواکردنی جیابوونەوەی دەفەوتێت با زیانیشی پێبگات بەهۆی بژێوی نەکێشانیەوە.

پێشنیار دەکەم ئەم مەرجە لابرێت چونکە شەرعو یاسا مەرجەکەیان بەستۆتەوە بەهۆکارەکەوە لەبەر ئەوەی سەرچاوەی زیانەکەیەو ئەوەش لەگەڵیدا دەسوڕێتەوە بەبوونو نەبوون، لەبەر ئەوە ڕەزامەندی ژن لەکاتێکدا لەبەر هەندێ پێودانگ (اعتبار)و پێشبینی کەنەهاتوونەتە دی دروست نیە بێبەشی بکات لەداوای جیاکردنەوەو تا ماوە لەژیاندا نەهامەتی ئەو زیانە قبوڵ بکات.

٣- لەحاڵەتی سەلماندنی ئەوەی مێرد توانای بژێوی نەبوو ئەوا جیاکردنەوەکە بۆ ماوەیەك دوا دەخرێت کەزیاتر نەبێت لەیەك مانگ بەپێی یاسای میسری (م٤)و، بەپێی یاسای تونسیش لەدوو مانگ زیاتر نەبێت (ف-٣٩)و، سێ مانگ لەیاسای ئوردنی(م١٢٧)و، سوری(م١١٠)و، مەغریبی (ف-٥٣)و، یاسادانەری عێراقی لەحاڵەتی بژێوی نەکێشاندا بەهۆی نەداریەوە دەرفەتی نەداوە، بەڵکو ئەو کەسەی

هیچ پاساوێكی نیە ماوەی (٦٠) ڕۆژی پێداوە، وەك ئەو مێردەی توانای هەیەو لەسەر سەرسەختی بـژێوی ناكێشـێت(م ٤٠/ ٧، ٨)، پێشـنیارم بـۆ یاسـادانەران لـەجیهانی ئیسلامیدا ئەوەیە كەزانای پایەبەرز ئیبن حەزمی زاهری پێش سەدان ساڵ بۆی چووە كە: (بژێوی مێرد كەتوانای نەبێت لەسەر ژنەكەی پێویسـتە كەهـەبوو بێـت) هـەروەك باسمان كرد[١]، وایدەبینم ئەو مێردەی هەبووەو بژێوی ناكێشێت شایستەی هـیچ ڕێـزو دواخستنێك نیە چونكە ئـەو كـارەی لـەڕووی ئـاینو یاسـاو ڕەوشـتەوە تاوانـە لەبـەر ئـەوەی بـژێوی پێویسـتە لەسـەریو ئـەویش لەتوانایدایـەو ژنەكـەش گوێڕایەڵیـەتیو كارێكی ئەنجام نەداوە كەلەڕووی شەرعەوە لەبژێوی بێبەشی بكـات، لەسـەر دادوەرە ئەو ستەمەی دەستبەجێ لەسـەر لاببـات بەجیابوونـەوەیان ئەگـەر سـووربوو لەسـەر بژێوی نەكێشانو ژنەكەش سوور بوو لەسەر داوای جیاكردنەوە.

٤- بەتەنها یاسای عێراقی(٩/٤٣) حاڵەتێكی باسكردووە كە نەلەفیقهی ئیسلامیو نەلە هیچ یاسایەكدا -ئەوەندەی من بینیبێتم- بوونی هەبێت، بریتیـە لـەوەی ژنەكـە داوای جیاكردنەوەی بۆ هەیە (ئەگەر مێرد ڕێگر بوو لەدانەوەی بـژێوی كەڵەكـەبووەی كـەحوكمی درانـەوەی لەسـەر دراوە بەپێـدانی دەرفـەتێك پێـی لەلایـەن فەرمانگـەی جێبەجێكردنەوە (دائرة التنفیذ) كەلە شەست ڕۆژ زیاتر نەبێت).

پێشنیار دەكەم ئەم برگەیە لاببرێت چونكە یاسادانەری عێراقی بڕیاریداوە ڕێگـای یاساییو دادگایی بگیرێتە بەر بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەكە، لەبەر ئـەوە هـیچ پاسـاوێك نیە كەقەرزی ژنەكە لەسەر مێردەكەی بكرێتە هۆی جیاكردنـەوە لەكاتێكدا مێردەكـە بەردەوامە لەبژێوی كێشانی.

[١] ص ٢٠٧. بڕوانە: المحلی ٩٢/١٠.

**ب- بێبەشکردنی لەسەرجێی (الحرمان من المعاشره)،**

جیاکردنەوە لەدادگا لەبەر زیانی خۆویست کەبەهۆی بێبەشکردنی ژنەوە لەسەرجێی هاوسەرێتی (المعاشرة الزوجية) یاسا بڕیاری لێداوە: عێراقی(م ٤٣/١، ٢، ٣) ، ئوردنی مادەکانی(١٢٣ — ١٢٥) ، سوری(م ١٠٩)، میسری مادەکانی(١٢–١٤)، مەغریبی(ف — ٥٧، ٥٨)، لەگەڵ ئەوەشدا لەمانەدا جیاوازن:

١–بێبەش بوون بەهۆی دەرچوونی حوکمێك لەسەر مێردەکە بەسزایەکی بێبەشکار لەسەریەستی (بەندکران) ماوەیەك کە کەمتر نەبێت لەسێ ساڵ ئەو مافە بەژنەکە دەدات پاش تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ئەو سزایەدا لەهەموو یاساکاندا داوای جیاکردنەوە بکات: ئوردنی (م١٣٠)، سوری (م١٠٩)، میسری (م١٤)، بەپێچەوانەی عێراقی(م ٤٣/ ١) کە پاش دەرچوونی حوکمەکە دەستبەجێ ئەو مافە دەداتە ژنەکەو ئەمەم لەهیچ یاسایەکی تردا —ئەوەندەی پێ بزانم— نەبینیوە جگەلەیاسای یەکێتی سۆڤیەتی کارپێکراوی ئێستا، هەموو یاسا ئیسلامیو نائیسلامیەکان ڕێگە نادات بەجیابوونەوە پاش تێپەڕبوونی ساڵێك نەبێت بەسەر دەستپێکردنی جێبەجێکرانی سزاکەدا.

داواکارم یاسادانەری عێراقیش هەمان ئاراستە بگرێت چونکە لەعێراقدا بەندیخانە بەدەزگای چاکسازی دادەنرێتو لەبەر ئەوەی زۆرێك لەبەندکراوان ماوە ماوە مۆڵەتیان پێدەدرێت تا سەردانی خێزانەکانیان بکەن لەماڵەوە.

٢– یاسادانەری سوری (م ١٠٩ / ١)جیاکردنەوە لەبەر حوکمی بەندکران بەتەڵاقی گەڕانەوەیی (رجعي) داناوە، پێشنیار دەکەم یاسادانەرانی جیهانی ئیسلامی هەمان هەنگاو بنێن بەهۆی ئەو پشتگیریەی تێیدایەو بۆ بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتی.

٣– لەحاڵەتی بێبەشبوونی ژن لەسەرجێی (المعاشرة)بەهۆی ڕۆشتن (هجر)ی مێردەکەیەوە بەبێ پاساو یاسادانەری عێراقی(م ٤٣ /٢) ڕێگەی نەداوە

بەجیاکردنەوە ئەگەر دوو ساڵ بەردەوام نەبێت، وایدەبینم کەئەم ماوەیە زۆرەو زیان دەگەیەنێت بەبەرژەوەندی ژنەکە بەشێوەیەکی تایبەت ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو بکەوێتە هەڵەوە، لەبەر ئەوە پێشنیار دەکەم ماوەکە بگۆڕدرێت بۆ ساڵێك چونکە مێردەکە پاساوی نیە.

٤- تەنها یاسای مەغریبی (ف-٥٨) باسی سوێندی نەچونەلا(الایلاء)ی کردووەو تێیدا هاتووە: (ئەگەر مێردەکە سوێندی خوارد نەچێتە لای ژنەکەی یاخود سوێندی خوارد لەسەر جێهێشتنی و وازهێنا لە سەرجێی (پێکەوەبوونی جنسی) بۆ ژنەکە هەیە داواکەی بۆ دادوەر بەرز بکاتەوە کەئەویش چوار مانگ دوای دەخات، ئەگەر پابەند نەبوو (نەگەڕایەوە بۆ سەرجێی) پاش ئەو ماوەیە تەڵاقی دەدات و ئەم تەڵاقەش گەڕانەوەیی (رجعی)یە).

پێشنیار دەکەم یاسادانەری هەموو وڵاتانی ئیسلامی چاو لەو بکەن چونکە حوکمێکی دادپەروەرانەیەو قورئانی پیرۆز بڕیاری لێداوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَآؤُوا فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ، وَإِنْ عَزَمُواْ الطَّلاَقَ فَإِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) [1]، پێشتر حوکمەکانی سوێندخواردنی نەچوونەلا(الایلاء)مان باسکرد.

٥- یاسای ئوردنی(م ١٢٣ - ١٢٥)و، میسری(م ١٢ - ١٣)و، مەغریبی(ف- ٥٧) بڕیاریان داوە: ژنەکە بۆی نیە داوای جیاکردنەوە بکات پاش تێپەڕبوونی ساڵێك نەبێت لەسەر دیار نەمانەکەو پاش ئەوە:

أ- ئەگەر شوێنی دیار نەبووەکە دەزانراو دەتوانرا پەیوەندی پێوە بکرێت ئەوا دادوەر ماوەیەکی بۆ دیاری دەکات و هۆشداری دەداتێ کەتەڵاقی دەدات ئەگەر نەهاتەوە بۆ مانەوە لەگەڵی یاخود ژنەکەی ببات بۆلای خۆی یان

[1] سورة البقرة: ٢٢٦، ٢٢٧.

تەڵاقی بدات، ئەگەر ماوەکە تەواو بوو پاساوێکی قبوڵکراوی نەبوو دادوەر دڵنیا بوو لەسووربوونی ژنەکە لەسەر جیاکردنەوە ئەگەر سووربوو ئەوا جیایان دەکاتەوە بەتەڵاقێکی لێکترازان(بائن).

ب- ئەگەر نەتوانرا پەیوەندی پێوە بکرێت ئەوا دادوەر ئیجتیهاد دەکاتو ماوەیەك دیاری دەکات بۆ چاوەڕوانی هەواڵی ئەگەر هاتەوە ئەگەر نا ئەوا تەڵاقی دەدات بەبێ دواخستن یاخود پاساو یاخود بیانوبڕین (اعذار).

تێبینی دەکرێت کەیاسای مەغریبی بەتەنها کردویەتیە مەرج ژنەکە دیارنەمانی (غیاب)ی مێردەکەی بسەلمێنێتو ئەو زیانەی بەو هۆیەوە لێی کەوتووە یان بەبەڵگە یاخود بەسوێندخواردن، پێشنیار دەکەم یاساکانی دیکەش هەمان مەرج وەربگرن چونکە ئەو سەلماندنە لەداخوازیەکانی دادگای داپەروەرە، هەورەها پێشنیار دەکەم دەستەواژەی نامەکەی پێبگاتو نامەکەی پێنەگات (تصله الرسالة، لا تصله الرسالة) بە دەتوانرا پەیوەندی پێوە بکرێتو، نەدەتوانرا پەیوەندی پێوە بکرێت (یمکن الاتصال بە، ولایمکن الاتصال بە) لەمادەکانی یاسای میسریو ئوردنیو مەغریبی بگۆڕێت هەتا دەربڕینەکە هەموو هۆکارەکانی پەیوەندی هاوچەرخی ئەم سەردەمە بگرێتەوە.

هەروەها پێشنیار دەکەم بۆ یاسادانەری ئوردنی کە دەستەواژەی شوێنی مانەوەی زانراو بوو (وکان معروف محل الاقامە) لەمادە (١٢٣)دا بسڕێتەوە چونکە هەردوو مادەی (١٢٤و ١٢٥) بەدرێژکراوەی دادەنرێنو پێویستە ئەو کۆتە لەدرێژەدا بهاتایە.

٦- یاسای میسری (م٢١و ٢٢)، ئوردنی (م١٧٧)، تونسی (ف-٨٢) باسی بابەتی جیاکردنەوەیان کردووە لەبەر ونبوونی مێرد، بەڵام ئەم جیاوازیانەیان هەیە:

أ- تونسی ماوەکەی بەدوو ساڵ دیاری کردووە ئەگەر ونبوونەکە لەرەوشێکی

نائاسـاییدا بـوو، پـاش گـەڕان و بێئومێـدبوونی لەدەرکـەوتنی چارەنووسـی، لەرەوشی ئاساییدا مەزەندەی ماوەکە وازی لێهێنراوە بۆ دەستەڵاتی دادوەر.

ب- میسری لەوەدا هاودەنگە لەگەڵ تونسی کەمەزندەی ماوەکە واز لێبهێنرێـت بۆ دەستەڵاتی دادوەر لەکاتی ونبوون لەرەوشی ئاساییدا، جیاوازیشە لەگـەڵی لەدیاریکردنی ماوەکە ئەگەر لەرەوشی نائاساییدا بوو وەك جـەنگ ئـەوا چـوار ساڵ دەبێت.

ج- ئوردنی لەدیاریکردنی ماوەکە بەچوار ساڵ هاودەنگە لەگەڵ میسـری، بـەڵام جیاوازە لەگەڵ ئەوو تونسی لەدیاریکردنی ماوەکـە بەسـاڵێك ئەگـەر بـەهۆی کارەساتێکەوە وەك زەمین لەرزە یاخود بۆردومانی ئاسمانی ونبوو.

پێشنیار دەکەم لەهەموو رەوش و حاڵەتەکاندا مەزندەی ماوەکە بۆ دەستەڵاتی دادوەر لێبگەڕێت و ئەویش سوود لەهۆکارە هاوچەرخەکان ببینێـت بـۆ زانینـی چارەنووسی.

یاسادانەری عێراقی باسی ئەو درێژەیەی نەکردووە بەوپێیـەی کەقسـەکردنەکە تایبەتە بەجیاکردنەوە لەدادگا نەك حوکمدان بەمردن.

٧- بەتەنها یاسادانەری عێراقی (م ٤٣ / ٩) مافی داوای جیاکردنەوەی داوەتە ژن بەبێ ئەوەی زیانی خۆویسـت یـان خۆنەویسـت هـەبێت، ژن بـۆی هەیـە داوای جیاکردنەوە بکات لەماوەی نێوان گرێبەندی هاوسەری و چوونەلا.

تـەڵاق پـێش چـوونەلا هەرچـەندە قورئـان رێگـەی پێـداوە (اباحـة) لـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورەدا: (لاَّ جُنَـاحَ عَلَـيْكُمْ إِن طَلَّقْـتُمُ النِّسَـاء مَـا لَـمْ تَمَسُّـوهُنُّ...)[1] بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا وایـدەبینم دادوەر پەلـە نـەکات

[1] (لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدْرُهُ مَتَاعاً بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُحْسِنِينَ)(البقرة: ٢٣٦).

لەبەدەمەوەچوونی دلوای جیاکردنەوە تا نهێنی ئەو دلوایەی بۆ دەردەکەوێت‌و رادەی سەرکەوتن‌و شکستی ئەو هاوسەرگیریەی بۆ دەریکەوێت‌وسوود لەئەزموونی دادوەری خۆی‌و دووناوبژیوانەکەو توێژەری کۆمەلآیەتی ببینێت، ئەمەش لەپێناو پاراستنی بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتی‌و ناوبانگی خێزانەکە، چونکەهیچ تەلآق یان جیاکردنەوەیەك نیە کەخراپی ناوبانگی ژن‌و مێردەکە هەردووکیان یان لانی کەم یەکێکیانی بەشوێندا نەهاتبێت.

**ج- دەستدرێژی ژن و مێرد یەکێکیان بەقسە یان کردار بۆسەر ئەویتریان (اعتداء احد الزوجين على الاخر بالكلام او الفعل):**

یاسای باری کەسی ولآتانی عەرەبی کەمن بینیومن –جگە لەمیسری– هاودەنگن لەسەر ئەوەی هەریەك لەژن‌و مێرد بۆی هەیە دلوای جیاکردنەوە لەدادگا بکات ئەگەر سەلماندی لایەنی بەرانبەر بەقسە یاخود کردەوە زیانی پێگەیاندووە بەجۆرێك کەناتوانرێت لەگەلْ ئەو زیانەدا ژیانی هاوسەرێتی بەردەوام بێت، عێراق(١/٤٠)، ئوردنی (١٣٢)، سوری (م ١١٢)، مەغریبی(ف – ٥٦)، تونسی(ف – ٣٢)، کوەیتی (م١١١).

بەلآم یاسادانەری میسری لە(م٦)دا ئەو مافەی تەنها بەژن داوە لەسەر ئەو بنەمایەی مێرد تەلآقی بەدەستە، هەندێك جیاوازی بچوکیش هەیە لەوانە:

١– دەستەواژەی (لا يُستطاع)[1] لەهەموویاندا هاتووە جگە لەعێراقی، لەبری ئەوە عێراقی وشەی (يتعذر)ی بەکارهێناوە، دەربڕینی یەکەمیان باشترە چونکە وشەی (يتعذر) واتە (يستحيل) ئەم پلەیەش لەحوکمی جیابووندا پێویست نیە.

٢– یاسادانەری میسری وایدەبینێت کەئەم مافە بەبەسەرچوون (تقادم) دەکەوێت‌و

---

(١) واتە لەتوانادا نیە لەگەلْ ئەو زیانەدا ژیانی ژن‌و مێردایەتی بەردەوام بێت.

بۆ زیان لێکەوتوو نیە دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر زانینی زیانەکەدا بۆی نیە داوای جیاکردنەوە بەرز بکاتەوە، پێشنیار دەکەم ئەم مەرجە لابرێت چونکە پاساو (علە)ی حوکمەکە بریتیە لەزیانو ڕێساش ئەوە دەخوازێت کەحوکم لەگەڵ پاساوەکەیدا بەبوونو نەبوون دەسوڕێتەوە.

٣- یاسادانەری عێراقی(م ٤٠/٥) و میسری (م٦ دووبارە) فرە ژنییان لەو زیانانە داناوە کەدەبنە پاساو بۆ جیاکردنەوە، عێراقی ئەو مافەی بەرەهایی داوە بەژنی پێشووو نوێ (تازە) ئەگەر هاوسەرگیرییە نوێیەکە بەبێ مۆڵەتی دادگا بوو. لەکاتێکدا میسری بوونو نەبوونی مۆڵەتی دادگای بەپێویست دانەناوە، هەروەها ئەو مافەی بەژنە نوێیەکە نەداوە لەو کاتەدا ئەو مافەی هەیە کەمێردەکەی لێی شاردبێتەوە کەژنی تری هەیە.

وایدەبینم ڕێبازی میسری لەراستیەوە نزیکترە چونکە ژنی دووەم ئەگەر دەیزانی مێردەکەی ژنی تری هەیە ئەوا بەدەستدرێژیکار بۆ سەر مافی ژنی پێشوو دادەنرێتو واپێویستە کەشایستەی مافی داوای جیاکردنەوە نەبێت، پاشان هیچ پەیوەندیەك نیە لەنێوان ئەو زیانەی جیاکردنەوە پێویست دەکات لەگەڵ وەرنەگرتنی مۆڵەتی دادگا.

٤- هەموویان کۆدەنگن لەسەر دروست نەبوونی پەلەکردنی دادگا لەجیاکردنەوەدا مەگەر پاش ئەنجامدانی هەوڵەکانی چاکسازیو سوود وەرگرتن لەدوو ناوبژیوانەکەو هەروەك قورئانی پیرۆز[1] فەرمانی پێکردووە لەگەڵ ئەوەدا ئەو راجیاییە دروست بووە لەدیاری کردنی سروشتی دەستەڵاتی دوو ناوبژیوانەکە: زۆرینە بۆ ئەوە چوون کە حوکمی بریکار هەیە تەنها رۆڵی لەچاکسازیدا

---

(1) (وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُواْ حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلاَحاً يُوَفِّقِ اللّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً)(النساء: ٣٥).

دەگرێتەوەو جیاکردنەوەی بۆ نیە، هەروەها دادوەر پابەند نیە بەوەی دوو ناوبژیوانەکە پێشنیاری دەکەن یاخود بڕیاری لێدەدەن.

یاسادانەری ئوردنی بۆ ئەوە چووە کە دوو ناوبژیوانەکە دەسەلاتی بڕیاردانیان هەیەو لەسەر دادوەر پێویستە ئەوەی لەبڕگە (ط / م ١٣٢) جێبەجێ بکات کەدەڵێت: (لەسەر دووناوبژیوانەکەیە راپۆرتێك دەربارەی ئەو ئەنجامەی گەیشتوون بەرز بکەنەوە بۆ دادوەر، لەسەر دادوەریش پێویستە بەپێی ئەو ئەنجامەی ئەوان پێی گەیشتوون حوکم بدات ئەگەرهاتوو لەگەڵ حوکمەکانی یاسادا یەکی دەگرتەوە).

ئەوەی بەڕێز شێخ ئەحمەد حەسەن تەها[1] باسی کردووە کە (یاسادانەری میسری بۆ ئەوە چووە دەسەلاتی جیاکردنەوە بدات بەدوو ناوبژیوانەکە بەبێ ئەوەی دادوەر دەستی هەبێت لەجێبەجێکردنیدا، رۆڵی دادوەر هەر رۆڵی راگەیەنەر (مبلغ)ە لەدوو ناوبژیوانەکەوە بەبڕیارلێدان)لەگەڵ واقیعدا یەك ناگرێتەوەو دەقی (م٩) بەهەڵە نقلّ کراوە.

٥- یاسادانەری عێراقی هەندێك حاڵەتی باسکردووە کەژنەکە تێیاندا زیانی پێدەگاتو بۆی هەیە داوای جیاکردنەوە بکات لەکاتێکدا کەسەرچاوەی هۆکاری زیانەکە مێردەکە نیە وەك حاڵەتی هاوسەرگیری پێش تەواو کردنی تەمەنی هەژدە ساڵی بەبێ مۆڵەتی دادوەر (م ٤٠ / ٣)، لەحاڵەتی زۆرلێکردنی ژنەکە بۆ هاوسەرگیری لەدەرەوەی دادگا (م ٤/٤٠)پێشنیار دەکەم دەستەواژەی (پێش تەواو کردنی تەمەنی هەژدە ساڵی) بگۆڕێت بۆ (پێش باڵغبوون) تا لەگەڵ بۆچوونی زانایانی موسڵماندا یەك بگرێتەوە، وایدەبینم حاڵەتی زۆرلێکرادن (اکراه) بسڕێتەوە چونکە هاوسەرگیری زۆرەملێ

---

[1] لەکتێبەکەیدا: مدى حرية الزوجين في التفريق قضاء ط / ١٩٧٥ ص ١١٦.

پوچەڵ(فاسد)ەو جیاكردنەوەش بۆ هاوسەرگیری دروستە هەروەك یاسادانەر لە (م ٩ / ١) باسی بەتاڵبوونی كردووە.

پێغەمبەریش (ﷺ) جەختی لەوە كردۆتەوە كەمۆڵەتی كچی باڵغی عاقڵ مەرجە بۆ دروستی هاوسەرێتیەكەیان لەم فەرموودەیەدا: (لا تُنكح الايم حتى تُستامر ولا تُنكح البكر حتى تُستاذن) [1] واتە: بێوەژن تا بڕیار نەدات مارە نابڕدرێت، كچیش تا مۆڵەتی وەرنەگیرێت بەشوو نادرێت.

د- ئەنجامدانی سەرپێچییەک لەلایەن ژن و مێرد یەکێکیانەوە کەزیانی ئەویتریانی لێبکەویتەوە (ارتکاب معصیە من احد الزوجین یترتب علیها ضرر الاخر):

لەشێوەكانی ئەو سەرپێچیە:

١- هەڵگەڕانەوەی ژن‌و مێرد یەكێكیان.

٢- ئامادەنەبوونی یەكێك لەژن‌و مێرد بۆ موسڵمان بوون پاش ئەوەی ئەویتریان موسڵمان بوو، ئەمە پێویست نیە ئەگەر ژنەكە لەپەیڕەوانی ئاینە ئاسمانیەكان بوو مێردەكەشی موسڵمان بوو، قورئانی پیرۆز بەراشكاوی دروستی هاوسەرگیری لەم حاڵەتەدا باسكردووە ئیتر دروستكردنی بێت یاخود مانەوەی[2].

٣- سوێندی نەچوونەلا (الایلاء)، پێشتر توخمەكان‌و حوكمەكانیان بەدرێژی باس كرد.

٤- نەفرین پاش تۆمەتی ناپاكی هاوسەرێتی، پێشتر حوكمەنیمان روونكردەوە.

یاسا -ئەوەندی من بزانم- هەردوو حاڵەتەكەی یەكەمی چارەسەر نەكردووە.

---

[1] القسطلاني شرح صحيح البخاري ١٤٤/٦.

[2] (وطعام الذين اوتوا الكتاب حل لكم وطعامكم حل لهم والمحصنات من المؤمنات والمحصنات من الذين اوتوا الكتاب من قبلكم)(المائدة الاية: ٥).

بەتـەنها یاسـادانەری مـەغریبی (ف–٥٨) حـوکمی جیاکردنـەوە بـە سـوێندی نەچوونەلا (الایلاء) روونکردۆتەوە هـەروەك باسمـان کـرد، یاسـادانەری عێـراقیش لـە (م٤٣)ی هەموارکراودا حوکمی داوە بەجیاکردنەوە لەبەر خیانـەتی هاوسـەرێتیو، بـۆ نێریـازی (اللواطـة)ش هـەمان حـوکمی داوە، بـەڵام باسـی ئـەو نەفرینـەی نـەکردووە کەتێیـدا مێـرد ژنەکـەی بـەناپاکی تۆمـەتبار دەکـات هـەروەك ئـەوەی لەشـەریعەتی ئیسـلامیدا بڕیـاری لەسـەر دراوە، لەبـەر ئـەوەی پرۆسـەی نـەفرین دەسـتبەجێ جیاکردنەوەی لێدەکەوێتەوە وەك ئەوەی هەندێك لە زانایان باسیان لێکردووە یـاخود پاش حوکمی دادگا هەروەك ئەوانەی تر بۆی چوون، ئـەوەمان بەدرێـژی روونکـردەوە پێشتر[1].

هیـوادارم یاسـا لـەجیهانی ئیسـلامیدا لەرێکخسـتنی حوکمـەکانی هاوسـەرگیریو تەڵاقدا هەستانەوە بەخۆیـەوە ببینێـت، بـەجۆرێك بەختـەوەریو سـەقامیگری ژیـانی خێزانی موسڵمان لەخۆ بگرێتو، بگونجێت لەگەڵ رۆحی شەریعەتی ئیسـلامی بـەرزدا بەبێ پابەندبوون بەهیچ مەزهەبێکی دیاریکراوەوە.

ئـەم لێکۆڵینـەوە خاکەڕایـە دەخەینـە بەردەسـتی یاسـادانەری عێراقـی لەوانەیـە بۆچـوونی پەسـەند لـەنێو بۆچـوونەکانی زانایـانی موسـڵماندا وەربگرێـت کەلـەبارەی تەڵاقو جیاکردنەوەوە خستویانەتە روو.

(خوای گەورە هەموومان سەرکەوتوو بکات بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە)

---

[1] ل ٢٢١ و لاپەڕەکانی دواتر.

جیابوونەوەی ژن‌و مێرد یان بەتەڵاق دەبێت یاخود بەجیاکردنەوە لەرێی دادگاوە یاخود بەهەڵوەشاندنەوە یاخود بەهەڵگەڕانەوەی ژن‌و مێرد یەکێکیان یان مردنی یەکێکیان.

شوێنەواری هەموو هەڵس‌و کەوتێکی شەرعی‌و یاسایی بریتیە لەو ماف‌و پابەندییانەی کەبەهۆی ئەو هەڵس‌وکەوتەوە دروست دەبێت، ئەو شوێنەوارانەش یان ئەوەتا بۆ هەردوو لایەنی هەڵس‌وکەوتکارە وەك پابەندییەکانی هاوسەرێتی بەرانبەر بەیەك کەبەهۆی هاوسەرگیری دروستەوە دێتە ئارا، یاخود تەنها بۆ لایەکیانەو ئەوی تریان ناگرێتەوە وەك پابەندی ژن بەماوەی چاوەڕوانیەوەو مافی مێرد لەخواستنی پور (خوشکی باوك)ی ژنەکە یاخود پور (خوشکی دایك)ی ژنەکەی یاخود خوشکی ژنەکەی پاش جیابوونەوەیان‌و کۆتاییهاتنی ماوەی چاوەڕوانی ژنەکەی.

شوێنەوارەکانی جیابوونەوەش لەهەموو شێوەکانیدا یان ئەوەتا دارایی نیە وەك ماوەی چاوەڕوانی، یان ئەوەتا داراییە، وەك بژێوی کاتی ماوەی چاوەڕوانی‌و مارەیی دواخراو بەخشش (المتعة) یاخود تێکەڵە (دارایی‌و نادارایییە) وەك دایەنی (الحضانة).

لەسەر ئەم بنەمایە لێکۆڵینەوە لەم بابەتە بۆ سێ دەروازە دابەش دەکەین، یەکەمیان تایبەت دەکەین بەشوێنەوارە نادارایییەکان، دووەمیش شوێنەوارە داراییەکان، سێیەمیش شوێنەواری هاوبەشەکان (الاثار المختلطة).

# دەروازەی یەكەم:
# شوێنەوارە نادارایيەكان
# (اثار غير المالية)

گرنگترینی ئەم شوێنەوارانە ماوەی چاوەڕوانی (العدة)یە، ئەویش لەپابەندیەكانی ژن و مافەكانی خوای گەورەیەو دروست نیە ڕێككەوتن لەسەر نەهێشتنی یاخود دستهەڵگرتن لێی.

(العدة) لەزمانی عەرەبیدا بەمانای سەرژمێری (الاحصاء) دێت، دەوترێت (عدّ الشيءَ يعده عداً) واتە: سەرژمێری شتەكەی كردو بەژمارە ژماردی، (وعددت الشيء: احصيته) واتە: شتەكەم ژمارد: سەرژمێرم كرد..

بۆ كۆتایهاتنیش دەوترێت (اعتدت المراة: انقضت ايام عدتها)واتە: ژنەكەی ماوەی چاوەڕوانی كرد: ڕۆژانی ماوەی چاوەڕوانیەكەی تەواو بوو.

لەزاراوەی شەرعیو یاساییشدا ماوەیەكە خوای گەورە داینـاوە بەمەبەستی كۆتایهاتنی شوێنەوارەكانی مێرد پاش جیابوونەوە، بەدەربڕینێكی دیكە چاوەڕوانیەكە دەبێت ژن پابەند بێت پێوەی پاش نەمانی مێردی یاخود ئەوە كەدەچێتە شوێنی وەك چوونەلا لەهاوسەرگیری پوچەڵدا (كالدخول في الزواج الفاسد).

مەبەست لەو چاوەڕوانیەی كەژن پابەند دەبێت پێوەی چاوەڕوانیكردن و شوو نەكردنەوەیە بەپیاوێكی تر تا ئەو كاتەی ئەو ماوەیە كۆتایی دێت كەخوای گەورە دیاری كردووە.

بەڵام مێرد ماوەی چاوەڕوانی نیە، چونكە پاساوی پێویستكاری لەودا نیەو حوكمیش لەگەڵ پاساوەكەیدا دەسوڕێتەوە بەهەبوون و نەبوون.

بەڵام لەوانەیە ماوەی چاوەڕوانی بەهەمان شێوە بۆ مێرد بكرێتە مەرج كاتێ ڕێگریەك لەهاوسەرگیریە نوێیەكەی دروست دەبێت، وەك ئەو پیاوەی ژنەكەی

تەڵاقدراو دەیەوێت خوشکی ژنەکەی بهێنێت، لەسەر ئەو پیاوە پێویستە چاوەڕوان بکات تا ماوەی چاوەڕوانی ژنە تەڵاقدراوەکەی کۆتایی دێت.

## ئەو پاساوانەی ماوەی چاوەڕوانی پێویست دەکەن (العلل الموجبة لوجوب العدة)

لەپاساوە ئامانجدارەکانی ئەمانەن:

أ. دڵنیابوون لەپاکێتی رەحمی ئەو ژنەی لەمێردەکەی جیا بۆتەوە ئەگەر شیاوێتی منداڵبوونی تێدا بوو، بەمەبەستی دوورخستنەوەی تێکەڵبوونی رەچەڵەك لەلایەكو لەلایەکی دیکەوە پێدانی دەرفەتی پەشیمان بوونەوە پاش جیابوونەوە ئەگەر دەرکەوت سکی پڕە.

ب. خوای گەورە دەرفەتێکی داوە بۆ دەستپێکردنەوەی ژیانی هاوسەرێتی لەرێگەی پەلەنەکردن لەسەرلەنوێ شووکردنەوە هەروەك لەتەڵاقدا هەیە پێش جاری سێیەم، بەجۆرێك مێرد بۆی هەیە لەکاتی ماوەی چاوەڕوانیدا بچێتەوە لای ژنەکەی بەبێ گرێبەندی نوێ یاخود بەگرێبەندی نوێ مارەی بکاتەوە لەکاتی ماوەی چاوەڕوانیدا یاخود پاش ئەوە ئەگەر شووی نەکردبووەوە.

ت. ماتەمینی ژنە بۆ مێردەکەی خوای گەورە دیاری کردووە لەحاڵەتی مردنی مێردەکەیدا.

ث. ئاگاداربوون لەمەزنی پایەی هاوسەرێتی کە پاش چاوەڕوانی یان خۆگرتن نەبێت کۆتایی نایەت، لەسەر ئەم بنەمای ئەم پاساوە جۆراوجۆرانە بۆ پێویستی ماوەی چاوەڕوانی هیچ پاساوێك نابینین بۆ ئەو بۆچوونەی زانایانی فیقی ئیمامی وتوویانە کەماوەی چاوەڕوانی پێویست نیە بۆ کچی بووك کەنەگەیشتبێتە تەمەنی بێنوێژیو ئافرەتی بەتەمەن کە چووبێتە تەمەنی بێئومێدی (سن اليأس)، چونکە ئەم ئیجتیهادە لەسەر بنەمای یەك پاساوی (وحدة العلة) هاتووە کەلەبڕگەی (أ)هات.

## هۆکارەکانی پێویستبوونی ماوەی چاوەڕوانی (اسباب وجوب العدة):

بەگشتی بریتیە لەجیابوونەوەی نێوان ژن‌و مێردو چوونەلا لەهاوسەرگیری پوچەڵ یان بەگومان (الـزواج الفاسـد او بالشـبهة)، بەدرێـژیش تـەڵاق‌و جیاکردنـەوە لـەدادگاو هەڵوەشـاندنەوەو هەڵگەڕانـەوە ژن‌و مێـرد یەکێکیانـەو، چـوونەلا لەهاوسـەرگیری (پوچەڵ یان بەگومان‌و مردن).

## مەرجەکانی پێویستبوونی ماوەی چاوەڕوانی (شروط وجوب العدة):

بۆ پێویستبوونی ماوەی چاوەڕوانی دوو مەرج هەیە:

یەکەمیان: دەبێت هۆکارێك لەهۆکارەکانی جیابوونەوە کەباسکران روویدابێت.

دووەمیـان: دەبێـت جیابوونەوەکـە پـاش چـوونەلا بێـت سـەبارەت بـەو ژنـەی مێردەکـەی کـەلێی جیابۆتـەوەو نـەمردووە، چـونکە لەحاڵـەتی دووەمـدا مـاوەی چاوەڕوانی لەسەر ژنەکە بەرەهایی پێویستە ئیدی چووبێتە لای یـان نەچووبێتـە لای جیـاوازی نیـە، مـاوەی چاوەڕوانیەکەشـی چـوارمانگو دەرۆژە لەبـەر گشـتێتی ئـەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا)[1].

میراتیشی بـۆ هەیـە بـەرەهایی ئیـدی چـووبێتەلای یـاخود نەچـووبێتە لای لەبـەر هەمان هۆ، چونکە مـاوەی چـاوەڕوانی لەبـەر مـردن‌و میراتـی ژنـی پیـاوە مردووەکـە نابەسترێنەوە بەچوونەلاوە، چونکە ئایەتەکە گشتیەو جیاوازی ناکـات لـەنێوان ژنێـك مێردەکـەی چـووبێتەلای‌و ئـەوەی نەچـووبێتەلای، لەبـەر ئـەوەی لـەم مـاوەی چاوەڕوانیەدا زیاتر رووی ماتەمینی دیارترە.

---

[1] سورة البقرة / ٢٣٤.

مەرجی چوونەلا بۆ جگە لەمردنی مێرد لەقورئانی پیرۆزدا دەقی لەسەر هاتووە: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ[1] فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً)[2].

## جۆرەکانی ماوەی چاوەڕوانی (انواع العدة):

ماوەی چاوەڕوانی لەرووی سروشتیەوە چوار جۆرە:

### یەکەم: ماوەی چاوەڕوانی بەپاکبوونەوە (العدة بالقرء):

زانایان راجیان لەدیاریکردنی مانای مەبەست لێبوو لەوشەی (القرء) چونکە لەزمانی عەرەبیدا هاوبەشە لەنێوان پاکی و بێنوێژیدا.

ئاشکرایە کەهاوبەشی ئالۆزە ئەگەر نیشانەیەك (قرینە) نەبوو لەسەر دیاریکردنی مانای مەبەستبووی ئەو هاوبەشە، خوای گەورە دەفەرمووێت: (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ)[3]، وشەی (تەڵاقدراوەکان – المطلقات) لەشێوە دەربڕینە گشتگیرەکانە چونکە (جمع مؤنث سالم)ەو (ال)ی (استغراق)ی چۆتە سەر، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم گشتگیریە بەئایەتی دیکە تایبەت کراوە کەباس لەحوکمی ماوەی چاوەڕوانی مردن و ماوەی چاوەڕوانی منالّی کەمتر لەتەمەنی کەوتنە بێنوێژی و ماوەی چاوەڕوانی ئەو ئافرەتەی گەیشتۆتە تەمەنی بێئومێدی و بێنوێژی نەماوە دەکات، لەبەر رۆشنایی ئەمەدا مەبەست لەوشەی (تەڵاقدراوەکان – المطلقات)لەم ئایەتەدا ئەو ئافرەتانەیە کەدەکەونە بێنوێژییەوە.

---

[1] واتە پێش ئەوەی کەبچێتە لای.

[2] سورة الاحزاب / ٤٩.

[3] سورة البقرة / ٢٢٨

هەروەك باسمان كرد زانایان راجیان لەمانی مەبەستبووی وشەی (القرء):

حەنەفی[1] و حەنبەلی[2] و ئەبازیەكان[3] وتوویانە مەبەست لێی بێنوێژییەو، شافعی[4] و مالكی[5] و شیعەی ئیمامی[6] و زاهریەكان[7] وتوویانە مەبەست لێی پاكبوونەوەیە.

بەڵگەكانی هەردوولا: بۆ ئاگاداربوون لەبەڵگەكانی هەردوولا بڕواننە كتێبی (بدایة المجتهد ونهایة المقتصد)ی (ابن رشد)[8].

بەرهەمی راجیاییەكە (ثمرة الخلاف):

بەرهەمی ئەو را جیاییەی باسكرا لەدیاریكردنی مانای مەبەست لێبووی وشەی (القرء) بریتیە لە را جیایی لەم حوكمە فیقهیانەدا:

١- مافی گەڕانەوە هەیە بۆ مێرد لەبێنوێژی سێیەمدا بەپێی بۆچوونی یەكەم كەرایان وایە مەبەست لەوشەی (القرء) بریتیە لەبێنوێژی، بەپێچەوانەی ئەوانەی كەوتوویانە مەبەست لێی پاكبوونەوەیە، چونكە ماوەی چاوەڕوانی لەبۆچوونی دووەمدا بەچوونەلا لەبێنوێژی سێیەمدا كۆتای دێت چونكە وا دادەنێن ئەو بەشەی تەڵاقدانەكەی تێدا بووە لەپاكێتیەكەدا (قرء)ێكی تەواوە.

٢- دروستە خوشكی ژنە تەڵاقدراوەكە بخوازێت لەبێنوێژی سێیەمدا بەپێی بۆچوونی دووەم چونكە ماوەی چاوەڕوانیەكەی بەچوونەلا كۆتایی دێت بەپێچەوانەی بۆچوونی یەكەم.

---

(1) الهدایة وشرح فتح القدیر ٤ / ٣٠٨.

(2) المغني لابن قدامة ٧/ ٤٥١.

(3) كتاب النكاح للجناوني ص ٣١٢.

(4) مغني المحتاج للشربیني ٣ / ٣٨٥.

(5) شرح الخرشي ٤ / ١٣٨

(6) الروضة البهیة واللمعة الدمشقیة ٢ / ١٥٦.

(7) المحلی لابن حزم الظاهریة ١٠ / ٢٥٧

(8) ٢ / ٧٤ وما یلیها.

٣- ژنەكە بۆی هەیە لەبێنوێژی سێیەمدا شوو بكاتەوە بەپێی بۆچوونی دووەم نەك یەكەم.

٤- شایستەی بژێوی‌و شوێنی نیشتەجێبوونە لەبێنوێژی سێیەمدا بەپێی بۆچوونی یەكەم بەبێ دووەم چونكە ئەو بێنوێژییەی كەتێیدا تەلاقدراوە بە (قرء) دانانرێت.

٥- دروستە هێنانی ژنی پێنجەم لەبێنوێژی سێیەم بەپێی بۆچوونی دووەم نەك یەكەم.

٦- ئەگەر یەكێكیان لەكاتی بێنوێژی سێیەمدا مرد، ئەوا ئەویتر میراتی دەكەوێت بەپێی بۆچونی یەكەم نەك دووەم، ئەگەر تەلاقەكە گەڕانەوەیی بوو، چونكە هێشتا ماوەی چاوەڕوانیەكەی كۆتای نەهاتووە.

**دووەم. ماوەی چاوەڕوانی بەمانگ (العدة بالاشهر):**

لەیەكێك لەم دوو حاڵەتەدا ماوەی چاوەڕوانی بەمانگ دەبێت: یەكەمیان ئەگەر ئافرەتەكە لەوانە نەبوو بكەوێتە بێنوێژییەوە لەبەر كەمی تەمەنی، یاخود گەیشتبووە تەمەنی بالغبوون بەڵام نەدەكەوتە بێنوێژی، یاخود گەیشتبووە تەمەنی بێئومێدی‌و لەبێنوێژی كەوتبوو، تەمەنی بێئومێدیش بەپێی جیاوازی كەش‌وهەواو توانای جەستەیی‌و تەندروستی ئافرەت‌و هەرێم‌و ناوچەكان جیاوازە.

لەبەر ئەوە ناتوانرێت پێوەرێكی بابەتی چەسپاو سەبارەت بەهەموو ئافرەتان‌و لەهەموو هەرێم‌و ناوچەكانی جیهان دابنرێت، بەڵام بەزۆری ئافرەت پاش تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵی دەكاتە تەمەنی بێئومێدی، سەرچاوەی ماوەی چاوەڕوانی بەمانگ ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە: (وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنْ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنْ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ)[1].

---

[1] سورة الطلاق / ٤.

حاڵەتی دووەمیش بریتیە لەماوەی چاوەڕوانی مردن سەبارەت بەو ئافرەتەی کەدووگیان نیە ئەگەر مێردەکەی مردو ژنەکە دووگیان نەبوو ئەوا ماوەی چاوەڕوانیەکەی چوار مانگو دە ڕۆژە لەبەرواری مردنی مێردەکەیەوە لەبەر ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا).

**سێیەم. ماوەی چاوەڕوانی بەدانانی سکەکەی (العدة بوضع الحمل):**

ئەگەر ژنەکە دووگیان بوو لەکاتی جیابوونەوەکە کەبەهۆی مردنی مێردەکەیەوە نەبێت، ئەوا ماوەی چاوەڕوانیەکەی بەدانانی سکەکەی تەواو دەبێت لەبەر ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: (وَأُوْلَاتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ) [1].

**چوارەم: ماوەی چاوەڕوانی بە دوورترینی هەردوو کاتەکە (العدة بابعد الاجلين):**

ئەگەر ئەو ژنەی مێردەکەی دەمرێت دووگیان بێت ماوەی چاوەڕوانیەکەی کۆتایی دێت بە دوورترینی دوو ماوەکە لەدانانی مناڵەکە یاخود چوار مانگ و دە ڕۆژ، ئەگەر مناڵەکەی دانا وماوەی چوارمانگ ودە ڕۆژەکە کۆتایی نەهاتبوو چاوەڕوان دەکات تاکو کۆتایی ئەو ماوە چاوەڕوانیەو، ئەگەر ماوەی چاوەڕوانی تەواو بوو و هێشتا مناڵەکەی دانەنا بوو چاوەڕوانی دانانی مناڵەکە دەکات[2]، ئەمەش وەك کۆکردنەوە لەنێوان ئایەتی ماوەی چاوەڕوانی مردن بەمانگ و ئایەتی ماوەی چاوەڕوانی بەدانانی مناڵ، لەبەر ئەوەی ڕێژەی نێوان ئەم دوو ئایەتە لەلایەك گشتی و لەلایەك تایبەتە، چونکە ئایەتی: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا)تایبەتە بەمردنو گشتیشە دووگیان و نادووگیان دەگرێتەوەو ئایەتی: (وَأُوْلَاتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ) تایبەتە بەئافرەتی دووگیانو گشتیە

---

(1) سورة الطلاق /٤ .

(2) یاسادانەری عێراقیش کاری بەمە کردووە لە مادە (٣/٤٨).

تەڵاقدراووئەوەش کەمێردەکەی مردووە دەگرێتەوە، لەسەر ئەم بنەمایە هەردووکیان پێکەوە کۆدەکرێنەوەو کار بەهەردوو ئایەتەکە دەکرێت، ئاشکرایە کەکارکردن بەقورئان دەخرێتە پێش کارکردن بەفەرموودە ئەگەر یەکیان نەدەگرتەوە[1].

**گۆڕانی ماوەی چاوەڕوانی لەجۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر ( تحول العدة من نوع الى نوع آخر)؛**

لەوانەیە ئافرەت بەجۆرێك لەجۆرەکانی چاوەڕوانی کەئاماژەی بۆ کراوە دەست پێ بکات کە لەبنەڕەتدا ئەرکە لەسەری دواتر لەناکاو گۆڕانکاری بەسەردا دێت کەپێویست دەکات لەسەری ماوەی چاوەڕوانی بگۆڕێت بە جۆرێکی تر، لەو حاڵەتانەش:

أ- ئەگەر ژن ماوەی چاوەڕوانی بگرێت بەمانگ لەجگە لەمردن لەبەر بچوکی تەمەنی یاخود چوونە ناو تەمەنی نائومێدیەوە، دواتر بچێتە ناو بێنوێژیەوە لەپێش تەواو بوونی سێ مانگەکە پێویستە لەسەری جارێکی تر دەست پێ بکات بەماوەی چاوەڕوانی نوێ بەسێ بێنوێژی تەواو.

ب- ئەگەر هاتوو لەوانە بێت بێنوێژ دەبوو و ماوەی چاوەڕوانی گرت بەپاکبوونەوە (قرء) و لەپێش کۆتایی هاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەی چووە ناو تەمەنی بێ ئومێدیەوە و بێنوێژیەکەی پچڕا، لەو کاتەدا بەو جۆرە ماوەی چاوەڕوانی دەگرێت کەبێ ئومێد دەیگرێت بەمانگ، هەندێك لەزانایان[2] پێیان وایە هەموو بێ نوێژیەك بەیەك مانگ دادەنرێت، ئەگەر ماوەی چاوەڕوانی بەپاکبوونەوە (قرء ) بگرێت لەدوای یەك بێنوێژی و بچێتە ناو تەمەنی بێ ئومێدیەوە دوو مانگ ماوەی چاوەڕوانی دەگرێت لەداوی بێنوێژیەکەو، ئەگەر دوو بێنوێژی

---

(1) هەروەك لەفەرموودەی: ( سبيعة الاسلمية)دا هاتووە.

(2) وەك ئیمامیەکان. بڕوانە: شرائع الاسلام ٢/ ٦٢.

تەولو بكات و بچێتە ناو تەمەنی بێ ئومێدی یەك مانگ ماوەی چاوەڕوانی دەگرێت.

ت- ئەگەر مێردەكەی لەكاتی ماوەی چاوەڕوانیدا مرد ئەویش تەڵاقدرابوو بەتەڵاقی گێڕانەوەیی، ئەوا ماوەی چاوەڕوانی تەڵاق ئیدی بەمانگ بێت یاخود بەپاكبوونەوە (قرء) ئەگۆڕێت بۆ ماوەی چاوەڕوانی مردن، لەبەر ئەوەی پێش كۆتایی هاتنی ماوەی چاوەڕوانیەكەی وەك ژنی پیاوەكە ئەژمار دەكرێت، بەپێچەوانەی ئەو ژنەی بەلێكترازان(بائن) تەڵاقدراوە كە ماوەی چاوەڕوانیەكەی ناگۆڕێت بۆ ماوەی چاوەڕوانی مردن بەڵكو بەردەوام دەبێت لەسەر ئەو ماوە چاوەڕوانیەی دەستی پێ كردووە ئەگەر هاتوو بەپاكبوونەوە(قرء)بێت یاخود بە مانگ، لەبەر ئەوەی پەیوەندی هاوسەریەتی بەڕاستەقینەیی و بەحوكمیش پچڕاوە لەبەر ئەوەی میراتی لێ ناگرێت ئەگەر مرد لەدوای كەوتنی تەڵاقی جوداكەرەوە (بائن).

ماوەی چاوەڕوانی لەچوونەلا لەهاوسەرگیری پوچەل یاخود بەگومان (عدة الدخول في الزواج الفاسد او بالشبهة):

ئەگەر چوونەلا لەهاوسەرگیریی پوچەڵ یاخود بەگوماندا ڕوویدا، بەوەی پیاوێك چووە لای ژنێك واگومانی دەبرد كەژنەكەی خۆیەتیو ژنەكەشی نەبوو، ئەوا حوكمەكانی چوونەلا لەهاوسەرگیرێتی دروستی بەسەردا جێبەجێ دەكرێت.

ماوەی چاوەڕوانی كەی دەست پێ دەكات و كەی كۆتایی دێت (متى تبدا العدة ومتى تنتهي)؟

ماوەی چاوەڕوانی لەكاتی بوونی هۆكاری جیابوونەوەكە بە تەڵاق و جیابوونەوەی لەڕێی دادگاوە یاخود هەڵوەشاندنەوە یاخود بەمردن دەست پێ دەكات، بەڵام سەبارەت بەماوەی چاوەڕوانی چوونە ناو هاوسەرگیری پوچەڵ(زواج فاسد)، كۆمەڵی زانایان بۆ ئەوە چوون كە لە چوونەلای كۆتاییەوە دەست پێدەكات، بەڵام هەندێك بۆ ئەوە چوون وەك ئیمام زوفەر لەحەنەفیەكان كەدەڵێت: ماوەی چاوەڕوانی لەبەرواری

جیابوونەوە بە هۆی پوچەڵی هاوسەرگیری لەنێوان هاوسەرەکان دەست پێ دەکات، بە بۆچونی ئێمە ئەم بۆچوونە بەڕاست و ڕەوان دەزاندرێت بۆ ئەوەی کاری پێ بکرێت، لەچوونەلای بەگومانیشدا ماوەی چاوەڕوانی لە دوایین چوونەلاوە دەست پێدەکات.

ماوەی چاوەڕوانی کۆتایی دێت بەکۆتایی هاتنی دوایین ڕۆژ ئەگەر هاتوو ماوەی چاوەڕوانی بەمانگ بێت و بەسێ بێنوێژی تەواو لەدوای جیابوونەوە، ئەگەر لەپاکبوونەوەدا تەلاق بدرێت، چونکە ئەو بەشەی تێیدا تەلاقدراوە بە پاکبوونەوە (قرء) بۆی ئەژماردەکرێت، بە پێچەوانەی ئەوەی ئەگەر لەبێنوێژی تەلاق بدرێت لەو کاتەدا ئەو بێنوێژیە بەپاکبوونەوە دانانەدرێتو، لەبەر ئەم جیاوازیە خودای گەورە فەرمویەتی: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)واتە: لەو کاتەی کە ڕاستەوخۆ ماوەی چاوەڕوانی تێیدا دەست پێدەکات.

# دەروازەی دووەم:
# شوێنەوارە داراییەکان
# (اثار المالية)

لەگرنگترین شوێنەوارە داراییەکانی جیابوونەوەی هاوسەرێتی ئەمانەیە:

١-میراتی.

٢- بژێوی ماوەی چاوەڕوانی (نفقة العدة).

٣- بەخششی تەڵاق (متعة الطلاق).

٤- قەرەبووی زیانی تەڵاقی ستەمکارانە(تعويض ضرر الطلاق التعسفي).

٥- وادەی پێدانی مارەیی دواخراوو پێویستی پێدانی بەبێ دواخستن(حلول اجل المهر المؤجل ووجوب دفعه بدون تاخير).

٦-کرێی شیرپێدان (اجرة الرضاعة).

**میراتی:**

ئەگەر هاوسەرگیری بەدروستی بوو یەکێك لەژن و مێردەکەش پاش گرێبەندەکەی مرد با مردنەکەی پاش یەك چرکەساتیش بێت ئەوا ئەوەی دیکەیان میراتی لێدەگرێت، چوونەلاو پێکەوەبوونی پەنهان (الخلوة الصحيحة) مەرج نیە بۆ شایستەبوونی میراتگرتنی لەژن و مێردەکە یەکێکیان لەوی دیکەیان.

میراتیش لەشوێنەوارە داراییەکانی جیابوونەوی هاوسەرێتیە بەهۆی مردنەوە، وەك لێرەدا دەیخەینە روو:

بۆ شایستەبوونی مێرد لەمیراتی ژنە مردووەکەی لەبەر هاوسەرێتی دووحاڵەت هەیە:

یەکەمیان: نیوەی میراتی ژنە مردووەکەی بۆ هەیە ئەگەر هاتوو لقێکی میراتگری نەبوو لەو یاخود لەمێردێکی پێشتری[1].

ئەگەر میراتگرەکانی تەنها مێردەکەی‌و برایەکی دایك‌و باوکی بێت ئەوا نیوەی میراتەکەی بۆ هەیەو نیوەکەی تریش بۆ برا دایك‌و باوکیەکەیە[2].

دووەمیش: چواریەکی میراتیی ژنە مردووەکەی بۆ هەیە ئەگەر لقێکی میراتگر لەخۆی یاخود لەمێردێکی پێشتری هەبێت ئەوا پاش دەرکردنی قەرزەکان‌و راسپاردن (وصیە) ئەگەر هەبوو، ئەگەر مردو میراتگرەکانی مێردەکەی‌و کوڕێکی بوو ئەوا چواریەکی بۆ مێردەکەیەتی‌و ئەوەی مایەوە بۆ کوڕەکەیەتی.

سەرچاوەی ئەم دوو حاڵەتەش قورئانی پیرۆزە، خوای گورە دەفەرموویێت: (وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ[1] فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ)[2].

هەندێکجار مێردکە زیاتر لەهۆکارێکی میراتگری دەبێت (هاوسەرێتی‌و خزمایەتی) بەوەی مێردەکە ئامۆزای ژنەکەی بێت‌و هیچ میراتگرێکی لەم نزیکتری نەبێت لەرووی خزمایەتیەوە، لەم حاڵەتەدا ئەوەی مایەوە وەك خزمایەتی‌و پشت بەری دەکەوێت.

لای هەندێك لەزانایان مێردەکە ئەوەی مایەوە بەگەڕانەوە (رد) بەری دەکەوێت ئەگەر ژنەکەی میراتگرێکی دیکەی نەبوو[3].

---

(١) مەبەست لە لقی میراتگر لای کۆمەڵی زانایان بریتیە لەکوڕو کچ‌و مناڵەکانی کوڕی‌و مناڵەکانی کوڕی کوڕو بەرەوخوارتر نێر بن یان مێ، لای شیعەی ئیمامیش سەرەڕای ئەوانە مناڵی کچی مناڵی کچی کوڕی‌و مناڵی کچی کوڕی کوڕی‌و بەرەوخوارتریش بەمیراتگر دادەنرێن. بڕوانە: ایضاح الفوائد في شرح اشكالات القواعد للشيخ ابي طالب محمد بن الحسن الحلي ط / ١٣٨٩، ٣/٢٣٨.

[2] پاش دەرکردنی قەرزە راسپاردە.

[1] لەزمانی عەرەبیدا وشەی (ولد) نێرو مێ دەگرێتەوەو مەبەست لێی لقەکانی میراتگرە هەروەك پێشتر باسکرا.

[2] سورة النساء / ١٢.

بەبۆچوونی خاکەڕایی (متواضع) ئێمە بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کەئەوەی مایەوە نادرێتە گەنجینەی گشتی (الخزانة العامة).

**بەرکەوتەی ژن لەمیراتی مێردە مردووەکەی (استحقاق الزوجة من میراث زوجها المتوفی):**

ژن ئیدی یەکێك بێت یاخود دووان تا چوار ژن، دوو حاڵەتـی هەیە:

یەکەمیان: ژنەکە ئیدی یەکێك بێت یاخود زیاتر چـواریەکی بـۆ هەیـە ئەگـەرهاتوو لقێکی میراتگری نەبوو لەم ژنە میراتگرە یاخود لـەژنێکی تـری، ئەگـەر پیاوێـك مـردو ژنێك یاخود زیاترو مامێکی دایكو باوکی هەبوو ئەوا ژنەکە چواریەکی بـۆ هەیـە پـاش دەرکردنی قەرزو راسپاردن (وصیە)و ئەوەی مایەوە دەدرێتە مامەکەی.

دووەمیش: ژنەکە ئیدی یەکێك بێت یاخود زیاتر هەشت یەکی بۆ هەیە ئەگەرهاتوو لقێکی میراتگری هەبوو لەم ژنە میراتگـرە یـاخود لـەژنێکی تـری، ئەگـەر مـردو پـاش خۆی ژنەکەیو کوڕ یاخود کوڕی کوڕی لێ بەجێما، ئەوا ژنەکـەی یـەکێك بێـت یـاخود زیاتر هەشت یەکی بەردەکەوێتو ئەوەی مایەوە بەر کوڕ یاخود کوڕی کوڕ دەکەوێت، ئـەو دوو حاڵەتـەش پـاش دەرکردنـی بەشـەکەی لەمیراتیەکـەی بـەرادەی ئـەوەی بەشداربووە لەپێکهێنانیدا چونکە وەك قەرزی پەیوندار بەلێجێماو (ترکە)ەوە وایە.

سەرچاوەی ئەم دوو حاڵەتەش ئەم ئایەتەی قورئـانی پـیرۆزە: (وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ) [1].

---

[2] زانایانی ئیمامی (جەعفەری) جیاوازیان کردووە لـەنێوان ژنو مێـردا لەگەڕانـەوەدا واتـە لەشایسـتەبوونی ئـەوەی لـەمیراتی دەمێنێتـەوە پـاش پێـدانی مـافی هـەموو خـاوەن مافـەکان لەمیراتیەکـە، ئەگـەر میراتگرێکی تر نەبوو ئەوا بۆ مێرد مافی هەیە لەوەی ماوەتەوە بەگەڕانەوە، ئەوە بۆ ژنەکە نیە، بڕوانـە: ایضاح الفوائد – المرجع السابق ٤/٢٣٧.

[1] سورة النساء / ١٢.

کۆمەڵی زانایانی شەریعەت بۆ ئەوە چوون کەژن و مێرد لەکاتی نەبوونی میراتگرێکی دیکەدا ئەوەی دەمێنێتەوە بەگەڕانەوە بەریان ناکەوێت، بەڵکو ئەوەی ماوەتەوە دەدرێتە گەنجینەی گشتی لەسەر ئەو بنەمایەی کە (دەوڵەت میراتگری ئەوانەیە کەمیراتگریان نیە).

جێنشینی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفان (ﷺ) دەڵێت: لەرێگە گەڕانەوە وەك میراتگرەکانی دیکە ئەوەی مایەوە بەریان دەکەوێت بەپێی رێسای (الغنم بالغرم)، چونکە لەحاڵەتی بەرزکردنەوە (عول)دا ئەوا کورتهێنانەکە دەکەوێتە سەربەشی خاوەن پشکە دیاریکراوەکان لەمیراتەکەدا بەبێ جیاوازی لەنێوان ژن و مێردو میراتگرەکانی دیکەی خاوەن پشکی دیاریکراو، لەبەر ئەوە پێویستە بەرزکردنەوەش بیانگرێتەوە[1].

بەبۆچوونی خاکەڕای ئێمە پێویستە کار بەم بۆچوونە بکرێت لەبەر دادپەروەریەکەی و گونجانی لەگەڵ رۆحی شەریعەتی ئیسلامی[2].

**بژێوی ژن لەماوەی چاوەڕوانیدا (نفقة المعتدة):**

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کەهۆکارەکانی ژن لەماوەی چاوەڕوانیدا جۆراوجۆرە لەوانە بەمردن یاخود بەتەڵاق یان بەهەڵوەشاندنەوە یان بەچوونە لای گوماناوی، جۆرەکانی ماوەی چاوڕوانیشمان روونکردەوە کەلەوانەیە بەپاکبوونەوە (قرء) بێت، لەوانەشە بەمانگ بێت یاخود بەدانانی سکەکەی سەبارەت بەژنی دووگیان یاخود دوورترینی ماوەیان وەك ماوەی چاوەڕوانی ئەو ژنەی دووگیانەو مێردەکەی دەمرێت.

---

(1) بەرزکردنەوە (عول) بریتیە لەزیادە لەژمارەی پشکەکان و کەمهێنان لەبڕەکەیدا لەکاتی هەبوونی پاساو بۆی، گەڕانەوەش (رد) پێچەوانەی ئەوە.

(2) بڕوانە دلزلمان: احکام المیراث والوصیة وحق الانتقال ص ٣١-٣٣.

لەهەموو حاڵەتەکاندا بژێوی ژن لەماوەی چاوەڕوانیدا پێویست دەبێت، چونکە وەك حاڵەتی هاوسەرێتی هێشتا پەیوەستە بەمێردەکەیەوە، لەبەر ئەوە پابەند دەبێت بەشوونەکردنەوە بەپیاوێکی دیکە تا پاش کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەی.

شایانی باسە کەماوەی چاوەڕوانی لەمافە تایبەتەکانی خوای گەورەیە، لەبەر ئەوە هەموارکردن‌و دەست لێ هەڵگرتنی نیە، هەروەها لەپابەندییەکانی هاوسەرێتیە کەویست هیچ رۆڵێکی تێدا نیە.

زانایانی شەریعەتی ئیسلامی لەپێویستبوونی بژێوی‌و شوێنی نیشتەجێبوون بۆ ژنی تەڵاقدراو بەتەڵاقێکی گەڕانەوەیی تا کۆتایهاتنی ماوەی چاوەڕوانیەکەی هیچ را جیاییەکیان نیە، چونکە هێشتا لەرووی حوکمیەوە ژنیەتی بۆیە بژێویەکەی وەك بژێوی ژنی راستەقینە وەك تەڵاق پێویستە.

بەهەمان شێوە راجیایی نیە لەپێویستبوونی بژێوی تەڵاقدراوی دووگیاندا تا ئەو کاتەی سکەکەی دادەنێت، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وَإِنْ كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ)[1]، ئیدی تەڵاقەکە گەڕانەوەیی بێت یاخود لێکترازان(بائن).

بەهەمان شێوە را جیایی نیە لەسەر پێویست نەبوونی بژێوی ژن لەماوەی چاوەڕوانیدا پاش جیابوونەوە لەهاوسەرگیری پوچەڵ (زواج الفاسد) یاخود چوونەلای بەگومان (دخول بشبه)، ئیدی ژنەکە دووگیان بێت یان نا، چونکە شایستەی بژێویەکە نیە پێش ئەو جیابوونەوەیە لەبەر ناڕەوابوونی پەیوەندی نێوان ژن‌و مێرد، لەبەر ئەوە لەپێشترە کەپاش جیابوونەوە شایستەی نیە.

---

[1] سورة الطلاق / ٦.

بــەڵام بۆچــوونیان جیــاوازە لــەحوکمی بــژێوی ژنـــی تەڵاقــدراو بەتــەڵاقی لێکترازان(بائن)[1].

زانایــانی شــەریعەت بــەمجۆرە لەبابــەتی بــژێوی ژنـــی تەڵاقــدراو بەتــەڵاقی لێکترازان(بائن) بۆچوونیان جیاوازە:

أ- هەندێك وتوویانە[2]: تەنها شایستەی نیشتەجێبوونە بـەبێ بـژێوی ئەگـەرهاتوو دوگیان نەبوو، بژێوی‌و شوێنی نیشتەجێبوونی بۆ هەیە ئەگەر هـاتوو دووگیـان بوو، لەبەر ئەم ئایەتەی قورئانی پـیرۆز: (وَإِنْ كُنَّ أُولاَتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ)، لەسـەر ئـەو بنەمایـەی کەئـەو مەرجـەی لـەو ئایەتـەدا هاتووە مانای پێچەوانە (مفهوم المخالفه) دەگەیەنێت کەئەویش پێویسـتبوونی بژێویە بۆ تەڵاقدراو بەتەڵاقی لێکترازان (بائن) ئەگەر دووگیان نەبوو.

ب- هەندێکی تر بۆ ئەوە چوون[1]: نەبژێوی بـۆ هەیـە نـە شـوێنی نیشـتەجێبوون ئەگەر دووگیان نەبوو لەبەر فەرموودەکەی فاتمەی کچی قـەیس کەمێردەکـەی سێ تەڵاقەیداو پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەشوێنی نیشتەجێبوونی بۆ بڕیـاردا نـە بژێوی[2].

ت- حەنەفیەکان‌و ئەوانەی هـاو بۆچـوونیانن وایـدەبینن کەژنەکـە نیشـتەجێبوون‌و بژێوی بـۆ هەیـە چـونکە لـەماوەی چـاوەڕوانیەکەدا وابەسـتەی مێردەکەیـەتی لەسەر وابەستەکار (حابس) پێویسته بژێوی وابەستەیەتی (محبوسی) بداتێ.

---

[1] کەس نەیووتووە – وەك بزانم – بەپێویسـتبوونی بـژێوی ژنـی چاوەڕوان لەچاوەڕوانی مـردن لـەمیراتی مێردەکەی لەسەر ئەو بنەمایەی پابەندی هاوسەرێتی مێـردە مردووەکـە بـەو بژێویـە دەبیـچرێت پـاش لەدەستدانی شیاوێتیەکەی بەمردنی.

[2] وەك مالکی و شافعیەکان.

[1] وەك حەنبلەی و ئیمامیەکان.

[2] گەورەمان عومەری کوڕی خەتاب تانەی لەو فەرموودەیە داوەو وتوویەتی: (لا نترك كتاب الله وسنة رسول الله بقول امرأة لا تدري اصدقت ام كذبت) واتە: واز لەقورئان‌و سوننەتی پێغەمبەر ناهێنین لەبـەر قسـەی ژنێك نازانین راست دەکات یان درۆ.

بەبۆچوونی خاکەڕایی ئێمە پێویستە کار بەم بۆچوونەی کۆتایی بکرێت لەبەر ئەم بەڵگانە:

١-خوای گەورە دەفەرمووێت: (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلاَ يَخْرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ)[٣].

تەڵاق لەم ئایەتەدا تەڵاقی گەڕانەوەیی و تەڵاقی لێکترازان دەگرێتەوە.

ئەگەر گەڕانەوەیی بوو ئەوا هیچ ڕێگرییەکی شەرعی نیە بۆ مانەوەی لەگەڵ مێردەکەی لەماڵی هاوسەرێتیان با لەیەك ژووریشدا بێت چونکە ئەو تەڵاقە لەماوەی چاوەڕوانیدا حەرامی ناکات بۆ مێردەکەی.

مانەوەشی لەگەڵ مێردەکەی کەتەڵاقیداوە لەیەك ژووردا[٤] لەکاتی ماوەی چاوەڕوانیدا پاڵنەرێکی باشە بۆ دەستپێکردنەوەی ژیانی هاوسەرێتی، هەروەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کردووە: (لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا).

جێی نیگەرانیە کەنەریت و باوە خراپەکانی کەلەنێو موسڵماناندا بڵاوە بریتیە لەدەرکردنی ژنە تەڵاقدراوەکە دەستبەجێ پاش تەڵاقدانی، ئەمەش پێچەوانەی ئەو ئایەتەی کەباسمان کرد کەبەئاشکرا نەهی دەکات لەدەرکردنی ژنەکە لەماڵەکەی و، خوای گەورە ماڵەکەی داوەتە پاڵیان نەك لای مێردەکان، وەك جەختکردن لەنادروستی وەدەرنانیان پاش تەڵاق و لەکاتی ماوەی چاوەڕوانیدا.

٢-خوای گەورە دەفەرمووێت: (أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ وَلاَ تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِنْ كُنَّ أُولاَتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُمْ بِمَعْرُوفٍ وَإِنْ تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ

---

[٣] سورة الطلاق /١.

[٤] بەڵام ئەگەر تەڵاقەکە لێکترازان (بائن) بوو لەسەر ژنەکە پێویستە لەژوورێکی تری ماڵی هاوسەرەکەی نیشتەجێ ببێت، چونکە پاش تەڵاقی لێکترازان (بائن)دروست نیە بەیەکەوە بن لەیەك ژووردا.

أُخْرَى)[1].

شایانی باسە کە ئەو مەرجەی لەم ئایەتەدا هاتووە: (وَإِنْ كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ) واتـای پێچەوانە ناگەیەنێت بەڵکو بۆ جەختکردنەوە لەسەر بەردەوامی بژێوی تاکاتی دانانی سکەکەی هاتووە.

٣-خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: (وَالَّـذِينَ يُتَوَفَّـوْنَ مِـنْكُمْ وَيَـذَرُونَ أَزْوَاجًـا وَصِـيَّةً لِأَزْوَاجِهِمْ مَتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ فَإِنْ خَـرَجْنَ فَـلاَ جُنَـاحَ عَلَـيْكُمْ فِـي مَـا فَعَلْـنَ فِـي أَنفُسِهِنَّ مِنْ مَعْرُوفٍ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ، وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ)[2].

زۆرێك لەراڤەکاران و زانایانی ئوصولی فیقھ لەکۆن و نوێدا وایان لێکداوەتەوە کە ئەم ئایەتە بۆ پێویستبوونی مـاوەی چـاوەڕوانی مـردن بـۆ مـاوەی سـاڵێك پاشـان نەسـخ بۆتەوە بەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا)[3]، ئـەم بانگەشـەیەش بەتاڵـە لەبـەر نـەبوونی دژیـەکی لەنێوان دوو ئایەتەکەدا هەتا یەکێکیان ئـەوی تریـان نەسـخ بکاتـەوە لەبـەر جیـاوازی بابەتی ئەو دوو ئایەتە.

ئایـەتی (٢٤٠) بابەتەکـەی مـافی مرۆڤـە و مافێـك لەمافـەکانی هاوسـەرێتی ژنـی مردوەکـە پـاش مردنـی مێردەکـەی بەبەڵگـەی فەرمایشـتی خـوای گـەورە لەهـەمان ئایەتدا: (وصية لازواجكم) ئەم مافەش ئایەتی: (مَتَاعًا إِلَى الْحَـوْلِ غَيْـرَ إِخْـرَاجٍ) راڤـەی کردووە.

ناوەڕۆکی ئەم ئایەتەش هەروەك دیارە ژنەکە بۆی هەیە بۆ ماوەی سـاڵێك لـەماڵی هاوسەرێتی بمێنێتەوە و نیشتەجێبوون و بژێوی بۆ هەیە لەگەڵ پێدانی مافی ئازادی بۆ ژنەکـە لەچـوونەدەرەوە و نەمانـەوەی لەگـەڵ خێزانـی مردووەکـەدا، بەبەڵگـەی ئـەم

[1] سورة الطلاق / ٦ .
[2] سورة البقرة / ٢٤٠.
[3] سورة البقرة / ٢٣٤.

فەرمایشتەی خوای گەورە: (فان خرجن فلا جناح علیکم فیما فعلن في انفسهن من معروف).

لەکاتێکدا ئایەتی (٢٣٤) بابەتەکەی مافێکە لەمافەکانی خوای گەورەو پێویستیەك لەپێویستیەکانو پابەندییەکانی هاوسەرێتی روون دەکاتەوەو لەسەر ئەو ژنە پێویستە کەمێردەکەی مردووە لەماڵی مێردەکەی بمێنێتەوەو ماوەی چوارمانگو دەرۆژ لەچاوەڕوانیدا بێت.

وتنی نەسخبوونی ئایەتی (٢٤٠)ی تایبەت بەمافێك لەمافەتایبەتەکانی ژن پاش جیابوونەوە بەمردن بەئایەتی (٢٣٤)ی تایبەت بەمافێك لەمافە تایبەتەکانی خوای گەورە لەبەر ئەم هۆکارانە بەتاڵە:

**یەکەم:** نەبوونی هیچ ناکۆکی یان دژیەکیەك لەنێوان ئەو دوو ئایەتەدا تا یەکێکیان ئەوی تریان نەسخ بکات، چونکە لەمەرجەکانی ناکۆکی (التعارض) یاخود دژیەکی (التناقض) یەکێتی بابەت (وحدة الموضوع)ەو ئەمەش لەم دوو ئایەتەدا نەهاتۆتە دی هەروەك باسمانکرد.

شایانی باسە ئەو نەسخەی لەیاسادا بە هەڵوەشاندنەوە (الالغاء) ناودەبرێت یان راشکاوانەبیە (صریح) یان ناوەکیانە(ضمني)، راشکاو (صریح) بریتیە لەوەی لەقورئاندا دەقێك هەبێت کەئەو ئایەتە بەفلان ئایەت نەسخ بۆتەوەو ئەمەش لەقورئانی پیرۆزدا نابینرێت.

نەسخی ناوەکیش (النسخ الضمني) روودادات پاش دژیەکی (التناقض)ی نێوان ئەو دووئایەتە نەبێت، لەو کاتەدا دەوترێت ئایەتی هاتوو ئایەتی پێشتری نەسخ کردۆتەوە بەمەبەستی هەڵگرتنی دژەیەکی نێوانیان، ئەمەش لەقورئانی پیرۆزدا بوونی نیە، بە کۆدەنگی عاقڵمەندانی موسڵمان دوو ئایەتی دژیەك نیە، چونکە دوو دژیەك بەیەکەوە نایەنو یە هاودەنگی بۆچوونی فەیلەسوفو زانایانی موسڵمانو هی دیکەش

هەڵناگیرێن (ولا یرتفعان) .[1]

**دووەم:** ئەگەر راست بێت ئایەتی (٢٤٠) نەسخی ئایەتی (٢٣٤)ی کردبێت واپێویست دەکات دروست نەبێت ژنی مردووەکە لەماڵی هاوسەریدا زیاتر لەچوارمانگو دە رۆژ بمێنێتەوە چونکە زیاتر لەو ماوەیە بەگوێرەی بانگەشەی ئەوان نەسخ بۆتەوە، ئاشکرایە کە دروست (جوان) نەسخ بوویەوە ئەوا حەرامبوون جێی دەگرێتەوەو پێویستکار (لازم) بەیەکدەنگی هەموو زانایانی موسڵمان بەتاڵە بەهەمان شێوە پێویستبوو (ملزوم).

**سێیەم:** ئایەتە نەسخکارەکە پێش نەسخ بووەکە دەخرێت لەریزبەندی قورئاندا وەك نیشانەیەك(قرینە)ی روون لەسەر بەتاڵبوونی ئەو بانگەشەی نەسخەی باسکرا.

## بەخششی تەلاق (متعة الطلاق):

بەخششی تەلاق بریتیە لەو برە لەماڵ یاخود پارە یان شمەك یان جلو بەرگ یاخود هەر پێویستیەکی دیکەی ماڵی کەژنی تەلاقدراو لێی سوود مەند بێت پاش تەلاقدرانیو مێردە تەلاقدەرەکە پاش تەلاقدانی پابەند دەبێت بەپێدانی.

### حوکمی بەخشش (حکم المتعة):

زانایان لەحوکمەکەیدا بۆچوونیان جیاوازە بەمجۆرە:

أ- هەندێك وتوویانە[1]: بۆ هەموو ژنێکی تەلاقدراو پێویستە لەبەر گشتێتی فەرمانەکان لەئایەتەکانی قورئاندا.

ب-هەندێکی تر وتوویانە[1]: بەرەهایی پێویست نیەو ئەمانە فەرمانەکانی قورئانیان لەویارەیەوە بە (ندب) لێکداوەتەوە نەك پێویست (واجب) بەنیشانە(قرینە)ی

---

[1] بۆ زیاتر ئاگاداربوون بگەڕێرەوە بۆ دلنرلومان: التبیان لرفع غموض النسخ في القران في موضوع شروط النسخ.

[1] وەك زانایانی زاهری.

فەرمایشتی خوای گەورە لەیەكێك لەئایەتە فەرمانكارەكان بەبەخشش (المتعة): (حق على المحسنين)واتە دووباشبووە (المتفضلين) جوانەكە (المتجملين) ئەوەشی لەباسی باشێتیو جوانیدا بێت نابێتە پێویست.

ت-هەندێكی دیكەش وایدەبینن[2]: بۆ ژنێك پێویستە ئەگەر پێش چوونەلاو پێش دیاریكردنی مارەیی دروستی رەوا بۆی تەلاق درابێت، بەلام لەحاڵەتی دیاری نەكردنی مارەیی یاخود ناولێنانی مارەییەكی پوچەڵ (تسمية مهر فاسد) ئەوا بەخشش بۆی پێویست دەبێت بەگەڕانەوە بۆ بەراوردكردنی نێوان ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمْ الْمُؤْمِنَات [3] ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً) [4] لەگەڵ ئەم ئایەتەدا: (وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ) لەم بەراورد كردنەوە لەنێوان ئەو دوو ئایەتەدا ئەوە وەردەگیرێت كە بەخشش لەگەڵ دیاریكردنی مارەییو تەلاق پێش دەستلێدان(المسيس) پێویست نیە [5].

بەبۆچوونی خاكەڕامان بەخشش پێویستە ئەگەر پێش چوونەلاو لەحاڵەتی دیاری نەكردنی مارەیی دروستدا تەلاقیداو (مندوب)ە لەهەموو حاڵەتەكانی تردا وەك كۆكردنەوەی هەموو بەڵگەكانی باسكران، شایانی باسە كەلەحاڵەتی مەزەندەكردنی بەخششكردندا پێویستە رەچاوی پلەی هەریەك لەتەلاقدەرو تەلاقدراو لەرووی كۆمەلایەتیو ئابووریەوە بكرێت.

---

(1) وەك ئیمام مالیك.

(2) وەك ئیمام ئەبو حەنیفە.

(3) واتە ئافرەتانی موسڵمانو پەیرەوانی پەیامە ئاسمانیەكان ( المسلمات والكتابيات).

(4) سورة البقرة / ٤٩.

(5) بڕوانە: (بداية المجتهد ونهاية المقتصد)ی لابن رشد ٢/٨٠ – ٨١.

## قەرەبووی تەلاقی ستەمکارانە (تعويض ضرر الطلاق التعسفي):

ئەگەر لەحاڵەتی نەسەلماندنی کەمتەرخەمیەك لەژنەکەوە، تەلاقدرانەکەی زیانیکی ماددی یاخود مەعنەوی لێکەوتەوە درەئەنجامی ئەو تەلاقدرانە، ئەوا پێویستە بەجۆرێك قەرەبووی بدرێت کە گونجاو بێت لەگەڵ قەبارەی زیانەکە، ئەمەش پاش مەزەندەکردنی لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە.

سەرچاوەی ئەم قەرەبووەش قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرو یاسایە:

أ- **قورئان:** خوای گەورە لەحوکمی تەلاقدراوەکاندا دەفەرموێت: (وَلاَ تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ)[1] ئاشکرایە کەئەو زیانەی نەهی لێکراوە ئەگەر روویدا دەبێت قەرەبوو بکرێتەوە.

ب- **سوننەتی پێغەمبەر:** پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لا ضرر ولا ضرار)، لەگێڕانەوەیەکی تردا: (لا ضرر ولا ضرار في الإسلام)[1].

ت- **یاسا:** لەبڕگەی سێیەمی مادەی سی‌و نۆی یاسای باری کەسی عێراقی بەرکاردا هاتووە کە: ئەگەر مێرد ژنەکەی تەلاقداو دەرکەوت بۆ دادگا کەمێردەکە زیادەڕەو (متعسف)ە لەتەلاقدانەکەدا بەو هۆیەوە ژنەکە زیانی پێگەیشتووە، دادگا لەسەر داوای ژنەکە فەرمان دەکات قەرەبوویەکی بدرێتێ کەگونجاو بێت لەگەڵ حاڵەتی مادی‌و پلەی زیادەڕەوی(تعسف) مێردەکە، بەگشتی وا مەزەندە دەکرێت کەلەبڕی بژێوی بۆ ماوەی دووساڵ زیاتر نەبێت ئەمە سەرە ڕای مافە چەسپاوەکانی دیکەی.

---

[1] سورة الطلاق / ١.

[1] جیاوازی نێوان (الضرر) و(الضرار) ئەوەیە یەکەمیان بریتیە لەرووبلنی زیان بەبێ پاساو (الضرار)یش زیانە بەرانبەر زیان، هەرکەس زیانی بەکەسی تر گەیاند پاداشتەکەی قەرەبووکردنەوەیەتی، دروست نیە پاداشت دانەوەی بەزیان بەپێی ڕێسای شەرعی‌و یاسایی (الضرر لا يزال بمثله).

بەپێی ئەم سەرچاوانە لەسەر مێرد پێویستە قەرەبووی ژنەکەی بکات بۆ هەموو زیانێك کەبەهۆی تەڵاقدرانی بێ پاساویەوە پێی گەیشتووە، بۆ نمونە ئەگەر داوای لێکردبوو واز لەفەرمانبەرێتیەکەی بهێنێت یاخود دەست لەخوێندنەکەی هەڵبگرێت یان دەستبەرداری پرۆژەیەکی دارایی ببێت کەدەیویست ئەنجامی بداتو ئەوەش وایکرد یاخود مارەییە دواخراوەکەی پێبەخشی یان هەر ماڵێکی تر لەپێناوی بەردەوامی ژیانی هاوسەرێتیو پاشان تەڵاقیدا بەبێ کەمتەرخەمی لەئافرەتەکە، لەسەر پیاوەکە پێویستە بەپێی رادەی زیانەکەو پایەی دارایی قەرەبووی بکاتەوە.

**کاتی پێدانی مارەی دواخراو (حلول اجل المهر المؤجل):-**

مارەیی دواخراو بەنزیکترینی ئەم دوو ئاکامە کاتی دێت: تەڵاقو مردن.

بنەڕەت لەمارەییدا ئەوەیە دەستبەجێ بێتو دوانەخرێت، بەڵام دواخستنی هەمووی یاخود هەندێکی پێچەوانەی سیستەمی گشتی نیە، بۆیان هەیە رێکبکەون لەسەر پێدانی هەمووی یاخود دواخستنی هەمووی یان پێدانی بەشێکیو دواخستنی بەشەکەی تری، ئەگەر جیابوونەوە روویدا بەتەڵاق یاخود بەمردن ئەوا مارەییە دواخراوەکە دەبێتە جێبەجێکراوو پێویستە بەبێ دواخستن بدرێت.

## کرێی شیرپێدان (اجرة الرضاعة):-

شیرپێدانی مناڵ لەکاتی بەردەوامی هاوسەرێتیدا لەسەر دایکی پێویستە ئەگەر هیچ رێگریەك لەئارادا نەبوو، ئەم شیرپێدانەش بەبێ بەرانبەر دەبێت لەبەر ئەوەی بەکۆدەنگی زانایان دروست نیە وەرگرتنی کرێ لەسەر ئەنجامدانی ئەرکی سەرشان.

ئەگەر دایکی منداڵەکەش لەژیاندا نەبوو یاخود رێگریەك لەرێگریەکانی شیرپێدانی تێدا بێت، وەك لاوازیو نەخۆشبن ئەوا شیردەرێکی دیکە لەبەرانبەر کرێدا شیری دەداتێ ئەگەر بەخۆبەخش ئەو کارەی نەکرد.

لەهەموو حاڵەتەکاندا کرێیەکە لەسامانی منداڵەکە دەبێت ئەگەرهاتوو سامانی هەبوو، ئەگەر سامانیشی نەبوو ئەوا لەسەر باوکیەتی، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ).

ئەگەر باوکی منداڵەکەش سامانی نەبوو، لەتوانایدا نەبوو کەسابەت بکات یاخود مردبوو ئەوا کرێیەکە لەسەر ئەو کەسە پێویست دەبێت کەمیراتی ئەو منداڵەی بەر دەکەوێت، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ).

سەرچاوەی ئەم حوکمانە ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە: (وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُمْ مَا آتَيْتُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) (1).

شایانی باسە من لەم ئایەتە پیرۆزە شازدە حوکمم دەرهێناوە هەشتیان بە دەربڕین (منطوق) گوزارشت کراوەو هەشتەکەی دیکەیان بە ئاماژە. (2)

**حیکمەتی پێویستبوونی شیرپێدان لەسەر دایک (حكمة وجوب الارضاع على الام):**

ئەم حیکمەتە لەم دوو بڕگەیەوە روون دەبێتەوە:-

١- پزیشکی هاوچەرخ سەلماندویەتی کەشیری دایک یارمەتی زۆری پاراستنی تەندروستی منداڵەکەو گەشەکردنی بەشێوەیەکی دروست دەداتو زیاتر بەسوودە لەشیری ئاژەڵ یاخود لەشیری شیردەرێکی دیکە.

---

(1) سورة البقرة / ٢٣٣

(2) ئەوەی دەیەوێت ئاگاداری ئەو حوکمانە بێت ئەوا بابگەڕێتەوە بۆ دانراومان: اصول الفقه في نسيجه الجديد ٢/٤٠٠-٤٠٥ الطبعة الخامسة عشرة

٢- ئەو کاتەی دایك مەمکی دەخاتە دەمی مناڵەکەی هەست بەسۆزو بەزەیی‌و خۆشەویستی دەکات‌و لێیەوە سۆزو خۆشەویستی لەم دایکەوە بەرانبەر بەکەسانی تر فێردەبێت، کاتێك گەورە دەبێت‌و لەمەیدانی ژیاندا تێکەڵی کەسانی تر دەکات، بەپێچەوانەی ئەو منداڵەی شیری ئاژەڵی پێدراوە لەرێی هۆکاری نوێی شیرپێدانەوە، لەم کاتەدا منداڵەکە هەست بەپشتگوێ خستن‌و تەنیایی‌و نارەحەتی‌و هاوشێوەکانی ئەوانە دەکات، ئەمەش وایی لێدەکات دوور بێت لەبەدەستهێنانی هەموو خۆشەویستیەك بەرانبەر بەرانبەرکەی، لەبەر ئەوە هەندێجار ئاڵۆزو مۆن‌و خراپ دەردەچێت لەکاتی مامەڵە لەگەڵ کەسانی تر.

# دەروازەی سێیەم:
# شوێنەوارە هاوبەشەکان
# (اثار المختلطة)

شوێنەوارە دارایی‌و نادارابیەکان (کرداریيەکان) لەجیابوونەوەی دایەنیدا پێکەوە کۆدەبنەوە.

لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە بەدوو دەروازە دەخەینە روو، یەکەمیان تایبەتە بەپێناسەی دایەنی‌و، دووەمیشیان بەحوکمەکانی دایەنی.

## جێباسی یەکەم:
## پێناسەی دایەنی

### پێناسەی دایەنی:

دایەنی لەرووی واتاوە بەلەخۆ گرتن لەبری دایك دێت.

لەرووی زاراوەی شەرعی‌و یاسایەوە بریتیە لەهەستانی بەکاروباری منداڵێك کەکاری سەقامگیر نیەو، چاودێی داواکاریەکانی ژیانی لەو قۆناغەدا لەپەروەردەو پاکوخاوێنی‌و خواردن‌و جل‌و بەرگو پاراستنی‌و هاوشێوەکانی ئەمانە.

### گونجاندنی دایەنی (تكييف الحضانة):

گونجاندنی شت واتە پێدانی خەسڵەتی شەرعی‌و یاسایی پێی، دایەنیش بەوە ناگونجێنرێت کەمافێکی رووتە بۆ ئەو کەسەی لەخۆی دەگرێت، نە بەوەش کەپابەندیەکی رووت بێت، بەڵکو بریتیە لەخەسڵەتێکی دوولایەنی کەهەردووکیان

پێکەوە کۆدەکاتەوەو مافو پابەندی لەیەك کاتدا، مافە بۆ ئەو کەسەی پێی هەڵدەستێتو بابەتی پابەندبوونەکەشی مافی منداڵەکەیە پێویستە ئەمکدار بێت بەرانبەر ئەوەی لەرووی شەرعو یاساوە لێی داواکراوە.

لەئەنجامەکانی ئەم گونجاندنە:

أ- ئەگەر دایەنەکەی دیاری کرا دایك بوو یان کەسێکی تر پێویستە لەسەری بەوە هەستێت، ئەگەر رازی نەبوو ئەوا لەسەری پێویست دەکرێتو هیچ رێگایەکی تری لەبەردەمدا نیە.

ب- ئەگەر مێردەکە ژنەکەی (خولع)کرد لەسەر وازهێنان لەدایەنێتی بۆی ئەوا (خلع)ەکە دروستەو مەرجەکە بەتاڵە چونکە بەتاڵکردنی مافی منداڵەکەی بەدەست نیە کە بابەتی پابەندیەکەیەو دەبێت بەجێی بگەیەنێت.

ت- ئەگەر لەگەڵ ژنەکەی رێکەوت لەسەر وازهێنان لەمافی دایەنێتیەکەی بەرانبەر بەقەرزێکی لەسەر ژنەکەی ئەوا رێکەوتنەکەیان بەتاڵ دەبێت لەبەر هەمان ئەو هۆیانەی باسمان کرد.

## پێکهێنەرەکانی دایەنی (عناصر الحضانة):-

پیکهێنەری هەر شتێك بریتیە لەوەی شتەکەی لەسەر وەستاوە، ئەگەر بەشێك بوو لێی ئەوا دەبێتە پایەی ئەگەرنا ئەوا مەرجیەتی.

لەم بابەتەدا مەبەست لەپێکهێنەرەکان (عناصر) مەرجەکانی شیاوێتی دایەنێتی یەو، ئەمە گرنگترینیانە:

١- باڵغبوون: مەرجە ئەو کەسەی دایەنیەکە دەکات باڵغ بێت چونکە ئەوەی باڵغ نەبووە ناتوانێت بەکاروباری خۆی هەستێت ئیدی چۆن بریکارێتی هەستان بەکاروباری کەسی تری پێ بسپێردرێت.

٢- عەقڵ: ئەو کەسەی شێت بێت یاخود گێل یان تووشبوو بەهەر نەخۆشینێکی عەقڵی دیکە چاك بەکاروباری خۆی هەڵناسێتو، ئەوا لەپێشترە کە ناتوانێت هەستێت بەجێبەجێکردنی داواکاریەکانی کەسی تر.

٣- توانای هەستانی ئەمکدارانە بەپابەندیەکانی دایەنێتیو جێبەجێکردنی پێویستیەکانی، ئەگەر ئەو کەسەی دایەنێتی لەئەستۆ دەگرێت بەهۆی بەتەمەنیەوە یاخود نەخۆشین یان هەر ناتەواویەکی دیکە کەرێگر بێت لەهەستان بەو ئەمەکداریە، ئەوا ئەرك پێسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتو پێویستە کەسێکی تر هەڵبژێردرێت کەشیاو بێت بە بەجێهێنانی پابەندیەکانی دایەنێتی.

٤- یەکلابوونەوە بۆ هەستان بەکاروبارو داواکاریەکانی دایەنی، ئەگەر ئەو کەسەی لەئەستۆیەتی خاوەن پیشە یاخود فەرمانبەر بوو کارەکەی یان فەرمانبەرێتیەکەی دەبووە رێگر لەبەجێهێنانی ئەرکەکەی لەدایەنێتی ئەوا دیاریکردنی ئەو جۆرە کەسە بەتاڵە، پێویستە کەسێکی دیکە هەڵبژێردرێت کەیەکلا بووبێتەوە بۆ ئەرکەکانی دایەنی.

٥- دەبێت ئەو کەسەی هەڵدەبژێردرێت بۆ دایەنێتی متمانە پێکراو بێت لەسەر پەروەردەو هۆشیاریو رێنمایی بەرەو رەوشت بەرزیو رەفتاری پەسەند، نەبوونی خەسڵەتی متمانەپێکردن رێگریەکە لەرێگریەکانی دامەزرانی دایەنیو هەڵوەشێنەرەوەشیەتی پاش دەستپێکردنی.

٦- ئەو کەسەی بۆتە دایەن نابێت شوو بەکەسێك بکات کەچاوەڕوانی ئەوەی لێ بکرێت زیان بەبەرژەوەندی منداڵەکە بگەیەنێت لەئایندەدا، لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) بەئافرەتێکی تەڵاقدراو کەمێردەکەی دەیویست منداڵەکانی لێی وەربگرێت، پێی فەرموو: (انت احق به ما لم تتزوجي) واتە: تۆ لەپێشتری بۆیان ئەگەر شوونەکەیتەوە).

بەبۆچوونی خاکەڕای ئێمە بەرەهایی شووکردنەوە نابێتە نەهێڵەری دایەنێتی بەڵکو ڕێگریەکە بریتیە لەو هاوسەرگیریەی کەزیان بەبەرژەوەندی منداڵەکە دەگەیەنێت؟

جیاوازیش نیە لەنێوان ئەوەی مێردەکە نزیك یاخود بێگانە (دوور) بێت، بەڵکو پێوەر هاتنەدی بەرژەوەندیەکانی منداڵەکەو بەدی نەهێنانیەتی، ئەگەری هەیە دوورەکە زۆر باشتر بێت لەنزیکەکە، چونکە هەرکەسەو لەڕووی پەروەردەو ڕەوشتەوە تایبەتمەندی خۆی هەیە.

٧- نەگواستنەوەی منداڵەکە لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە ئەگەر ئەو گواستنەوەیە زیانی بەبەرژەوەندی منداڵەکە دەگەیاند لەڕووی تەندروستیو ڕووی دیکەوە.

٨- هەر ڕووداوێکی لەناکاو لەماوەی دایەنێتیدا دەبێتە نەهێڵەری ئەگەر هاتوو زیانی هەبوو بۆ منداڵەکە.

## کێ لەپێشترە بۆ دایەنێتی (من هو احق بالحضانة):-

دایك لەپێشترە بۆ دایەنێتی:

لەڕووی شەرعو عەقڵو یاساوە دایك لەپێشترە بەدایەنێتی.

سەبارەت بەڕووی شەرعی، ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداود لەعەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص دەگێڕنەوە: (ان امراة قالت:- یارسول الله ان ابني هذا كان بطني له وعاء وحِجري له حواء وثدي له سقاء وان اباه طلقني واراد ان ينزعه مني، فقال:- انت احق به ما لم تنكحي) [1]، واتە: ئافرەتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم منداڵەم سکم بۆ لەخۆ گرو کۆشم جێی حەوانەیىو مەمکم شیردەریو باوکی تەڵاقی داومو دەیەوێت لێم وەربگرێتەوە، فەرمووی: تۆ لەپێشتری ئەگەر شوو نەکەیتەوە.

[1] نیل الاوطار ٦/٣٤٩

فەلسەفەی ئەمەش چاودێریکردنی بەرژەوەندی منداڵەکەیە، ئەگەر سەرەڕای شووکردنەوەکە مسۆگەر بوو ئەو بەرژەوەندیە ئەوا ئەو شووکردنەوەیە نابێتە نەهێڵەری دایەنێتی، وەك کارکردنێکی بەرێسای شەرعی: (الحکم یدور مع علته(حکمتە) وجودا وعدما)، وتە: حوکم لەگەڵ پاساوەکەیدا (حیکمەتەکەیدا) بەبوون و نەبوون دەسوڕێتەوە.

لەرووی عەقڵیشەوە چونکە دایك لەهەموو کەس زیاتر بەسۆزەو بەزەییەبۆ منداڵەکەی، لەبەر ئەوە لەکەسانی تر بەباشتر دەزانرێت بۆ دایەنێتی منداڵەکەی.

لەرووی یاسایشەوە چونکە یاساکانی باری کەسی لەوڵاتانی ئیسلامیدا هاودەنگن لەسەر ئەوەی کەدایك لەپێشترە بەدایەنێتی ئەگەر هاتوو رێگریەك نەبوو ببێتە رێگر لەو کارە.

## جێباسی دووەم:
## حوکمەکانی دایەنی
## ( احکام الحضانة )

لە حوکمەکانی دایەنی:

### دیاریکردنی بڕ و جۆری کرێ ( تحدید کمیة ونوعیة الاجرة):

هیچ پێوەرێکی بابەتی نیە بۆ دیاریکردنی بڕی کرێی دایەنی و خستنەرووی چۆنیەتیەکەی بەجۆرێك کەبەپێی کەسەکان و کات و شوێنەکان جیاواز نەبێت، بەڵکو ئەو دیاریکردنە وازلێهێنراوە بۆ رێککەوتنی رەزامەندانە یاخود بڕیاری دادگا لەگەڵ رەچاوکردنی گۆڕانکاریە ئابووریەکان و گۆڕانکاریەکانی ژیان و نەریتە باوەکان.

## بەرپرس لەکرێ (المسؤول عن الاجرة):-

کرێی دایەنی منداڵ لەسەر ئەو کەسە پێویست دەبێت کەبژێوی منداڵەکەی لەسەرە، ئەگەر باوکی لەژیاندا بوو هەبووش بوو یاخود توانای کەسابەتی هەبوو، بەپێچەوانەی ئەوەوە کرێکە لەسەر میراتگری منداڵەکە پێویست دەبێت وەك کرێی شیرپێدان، وەك کارکردن بەم فەرمایشتەی خوای گەورە: (وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ)، هەروەها کارکردن بەرێسای: (الغنم بالغرم) یاخود (الغرم بالغنم)، کرێی دایەنیش کرێی نیشتەجێبوونیش دەگرێتەوە چونکە لەپێشینەی پێویستیەکانی ژیانە ئەگەر دایەنەکە یان بەدایەن دراوەکە شوێنێکی نیشتەجێبوونی نەبوو هەتا تێیدا بژین نزیك لەشوێنی دایەنیەکە.

## بەباشزانین لەنێوان خۆبەخش و داواکاری کرێدا (المفاضلة بين المتبرعة وطالبة الاجرة):

ئەگەر ئافرەتێك بەخۆبەخش ئامادەبوو دایەنێتی بگرێتە خۆی ئەوا دەخرێتە پێش ئەوەی داوای کرێ دەکات لەبەرانبەر دایەنێتیدا بەومەرجەی منداڵەکە لەگۆڕینی ئەوەی خۆبەخشە بەوەی داوای کرێ دەکات زیانی پێنەگات.

## شوێنی دایەنی (مكان الحضانة):

شوێنی دایەنی بریتیە لە جێگای دایەن یان دایەنی کراو ئەگەر ئەوە هەبوو زیانیشی نەدەگەیاند بەبەرژەوەندی دایەنی کراوەکە دەنا پێویستە جێگایەك هەڵبژێردرێت بەپلەی یەکەم بەرژەوەندی منداڵەکەی تێدا بێت بەرژەوەندی دایەنەکەش بەپلەی دووەم.

## گوێزرانەوەی دایەنیکراو (الانتقال بالمحضون):

دروستە منداڵی دایەنی بگوازرێتەوە لەجێگایەك بۆ جێگایەکی دیکەی دوور یاخود نزیك ئەگەر ئەو گوێزرانەوەیە کاریگەری نەدەکردە سەر بەرژەوەندی، پێوەر

لەدروستی گوێزرانەوەداو نادروستیدا بریتیە لەهێنانەدی بەرژەوەندی منداڵەکەو بەدی نەهاتنیدا.

بەبۆچوونی خاکەڕایمان هیچ پاساوێك نیە بۆ راجیایی ئەو جیاوازیەی زانایان تێیدان لەجیاوازی نێوان جێگای نزیكو جێگای دوور و دروستی گوێزرانەوە لەیەکەمیانەوە بۆ دووەمیان، بەجۆرێك لەوانەیە جێگا دوورەکە باشتر بێت لەنزیکەکەو سوودیشی زیاتر بێت بۆ دایەنی کراوەکە، نزیکیو دووری پێوەری دروستیو نادروستی نین، چونکە دایەنی کۆتای دێت بەزیان لێکەوتنی بەرژەوەندی منداڵە دایەنی کراوەکە ئیدی شوێنەکەی بۆی دەگوازرێتەوە دوور بێت یان نزیك.

## بەرپرسیارێتی پابەند بەپێدانی کرێی دایەن (مسؤولية الملتزم بدفع الاجرة تجاه المحضون):-

ئەو کەسەی پابەندە بەپێدانی کرێی ئیدی باوکی بێت یان کەسێکی دیکە بەرپرسیشە لەسەرپەرشتی پەروەردەو فێرکردنو رەوشتیو تەندروستیو هاوشێوەکانی ئەو دایەنی کراوە، لەسەری پێویستە بەبەردەوامی سەردانی بکات تا ئاگاداری تەندروستیو فێربوونو پەروەردەو هۆشیاریو رەوشتی بێت، چونکە بەرپرسیارێتی دایەنگرتوو بەتەنها لەو کاروبارانە بەس نیە، بەڵکو پێویستە بەرپرسیارێتی ئەو کەسەشی بێتە پاڵ کەپابەندە بەپێدانی کرێی دایەنەکە ئیدی ئەو کەسە پلەی خزمایەتی هەرچی بێت، ئەم بەرپرسیارێتیەش تەنها لەسەر باوك نیە بەڵکو دەگوازرێتەوە بۆ هەرکەس کەبچێتە جێگای لەپاش مردن یاخود دیارنەمانی.

## ماوەی دایەنی (مدة الحضانة):

پێوەری دیاریکردنی ئەو ماوەیە جیاوازە بەپێی جیاوازی بەرژەوەندی ئەوەی دایەنی دەکرێت نێر بێت یان مێ.

بەبۆچوونی خاکەڕای ئێمە پێویستە ئەم ماوەیە بەکات دیاری نەکرێتو جیاوازی نەکرێت لەنێوان نێرو مێدا، هەرکاتێ نێرینە گەیشتە رادەیەك دەستبەرداری بەردەوامی دایەنی ببێتو بتوانێت داواکاریەکانی ژیانی خۆی دابین بکات، ئەو کاتە بەرژەوەندی ئەو لەدایەنی کردنی کۆتای دێتو بۆی هەیە واز بهێنێت لەو دایەنییە.

ئەگەر ئەو کچەی دایەنی کراوە شووی کرد ئەوا بەشووکردنەکەی دایەنێتیەکەی کۆتایی دێتو سەربەخۆ دەبێت بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ژیانی لەلایەن خۆیەوە.

ئەگەر باڵغ بوو شووی نەکرد ئەوا سەرپشك دەکرێت لەنێوان ژیان لەگەڵ دایکی یاخود باوکی ئەگەر بەجۆرێك پێگەیشتوو بوو دەیتوانی ئەوەی بۆی هەیەو ئەوەی لەسەریەتی جیابکاتەوە.

وایدەبینم هیچ پاساوێك نیە بۆ چوونە ناو درێژەی حوکمەکانی دایەنێتیو ئەوەی بۆ سەردەمەکانی رابوردوو شیاو بووە، ئەوا لەوانەیە لەگەڵ ئێستاو ئایندەدا گونجاو نەبێت پاش ئەو گۆڕانانەی ژیانو گۆڕانی پێویستیەکانی.

## هەڵوێستی یاسا لەدایەنی (موقف القانون من الحضانة):-

یاساکانیش وەك مەزهەبەکان وەهایە حوکمەکانیان نەمر نیە، بەگۆڕانی کاتو شوێنەکانو پێویستیەکانی ژیانو گەشەسەندنی شارستانی مرۆڤ دەگۆڕێت، چونکە حوکمەکانی ئیجتیهادیە پێویستە رەچاوی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ تێیاندا بکرێت کەیاسا ئاسمانیەکان -لەپێش هەموویانەوە شەریعەتی ئیسلام- لەپێناوی دابینکردنیدا هاتووە، ئەگەر ئەو بەرژەوەندیانە گۆڕانی بەسەردا هات ئەوا ئەو حوکمانەشی لەسەر ئەوان بنیات نرابوو دەگۆڕێت.

یاسای باری کەسی عێراقی بەرکار لەماددەکانی (٥٥-٥٧)دا چارەسەری پێکهێنەر (عناصر)و حوکمەکانی دایەنی کردووە، وەك ئەوەی لەم پوختەیەدایە:

١- دایك لەپێشترە بەدایەنەتی ئەگەر رێگریەك لەئارادا نەبوو، بەشووکردنەوەشی ئەو مافە نافەوتێت.

٢- مەرجە ئەو کەسەی دەبێتە دایەن باڵغو عاقڵو سپاردەپارێزو توانای هەبێت.

٣- لەحاڵەتی راجیایی لەدیاریکردنی کرێی دایەنی ئەوا دادگا دیاری دەکات.

٤- باوك یان ئەو کەسەی لەبری ئەوە بەرپرسە لەکاروباری لەدایەنگیراو پەروەردەو فێرکردنی.

٥- ئەوەی دایەن دەگرێت مافی هەڵبژاردنی شوێنی مانەوەی هەیە لەگەڵ هەر کەسدا کەبیەوێت ئەگەر تەمەنی پازدە ساڵی تەواو کردبوو.

٦- ئەوەی دایەنی دەکاتو ماوەی دایەنیەکەی کۆتایی هات بۆی هەیە ئەگەر زانی بەدایەن گیراوەکە زیانی پێدەگات بەبڕیاری دادگا ئەو مافە بەدەست بێنێتەوە.

٧- ئەگەر دایك مەرجێك لەمەرجەکانی شیاوێتی دایەنێتی لەدەستدا یاخود مرد، ئەوا دایەنێتی دەگوازرێتەوە بۆ باوك ئەگەر بەرژەوەندی مناڵەکە جیاواز لەوەی نەویست، ئەگەرنا ئەوا دەگوازرێتەوە بۆ ئەوەی دادگا هەڵیدەبژێرێت.

٨- لەحاڵەتێکدا باوكو دایك شیاوێتی دایەنی لەدەست بدەن ئەوا دادگا بۆ دایەنبووەکە دایەنێکی ژن یان پیاو هەڵدەبژێرێت، هەروەها بۆی هەیە بیخاتە خانەکانی دایەنگە کەلەلایەن دەوڵەتەوە ئامادەکرابوو لەحاڵەتی بوونیدا.

شایانی باسە کەئەم بڕگانەی یاسای عێراقی چارەسەری کردوون جیاوازی نیە لەگەڵ رۆحی شەریعەتی ئیسلامیو بۆچوونی پەسەند لەفیقهی ئیسلامیدا.

رَبِّ زِدْنِي عِلْماً وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِين